



فرۆشتن و دابینکردنی هەموو جۆرە کتێبێک

Koshki_sara  koshki sara

سلێمانی - بەردەرکی سەرا - لەنیشت ئوتێل مەولەوی





خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا

سلێمانی سەرەتای شەقامی مەولەوی
فەرعی سەعید نەها کۆیی

٠٧٥٠١١٢٨٢٨٨ - ٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧

Ktebxanal chwarchra


پرۆژەی هاوبەشی

خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا

کتێبخانەی کۆشکی سەرا


ناوی کتێب: عاشقترین

بابەت: رۆمان

نووسینی: مریەم یافتیان

وەرگێڕ: سامان کەریم

پێداچوونەوە: سەلام کەریم

دیزاین: هەرێم عوسمان

چاپ: چاپخانەی چوارچرا - سلێمانی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نۆرەی چاپ: چاپی دووەم

ساڵی چاپ: ٢٠٢٣ ز

نرخ: ٦٠٠٠ دینار

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی سپاردنی (      )ی ساڵی ٢٠٢٣ی پێدراوە.

## پێشەکی

ئێستاش هەر کاتێک باس لەخانوی کۆنو حەوزی بچوکی ناو ئەو خانوانە دەکرێت، بەبێ ئەوەی بمەوێت دەکەومەوە یادی کوچە کۆنەکانی ئێرانو یادی گەڕەکە تەنگو پێچاوپێچەکانی.. یادی خانوە بچوکو گەورەکانی کە زۆربەیان لەخشت دروستکرابون، چ جیاوازییەک هەبوو ئەگەر خانوەکە بچوک یان گەورە بوایە، یادی بەختەوەری مرۆڤەکانی بەخێر، دەنگە دەنگی منالان کە بەتۆپێکی لاستیک یارییان دەکردو بەنارەزایی گەورەکان یەکسەر کۆمەڵەکەیان تێکدەچوو، چەند ساتێک بێدەنگی بڕیاردەر دەبوو، کە خۆرئاوا دەبوو ژنان زۆربەیان لەبەر دەرگای یەکێک لەماڵەکان کۆدەبونەوەو بیروڕای خۆیان دەربارەی مەسەلەگەلێکی جیاواز دەردەبڕی.

نزیکەی سی ساڵێک پێش ئێستا لەیەکێک لەم کۆڵانە تەنگانەداو لەیەکێک لەخانوەکانیدا کە بە ئەندازەیەکیش خانویەکی گەورە بوو، خانەوادەیەکی گەورە ژیانیان دەگوزەراند.

خاوەنی خانوەکە بەناوی خەلیل دەمێک بوو لێرە دەژیا، یەکەمین خانوی کۆڵانەکە ئەو دروستی کردبو، هەر لەبەر ئەمەش بوو کەوا ناوی کۆڵانەکەیان بەناوی ئەو "خەلیل"ەوە ناونابوو.

لەدەرگای خانوەکە ئەڕۆیشتیتە ژوورەوە دارەبەنێک لەبەردەم باخچەکەدا بوو کە گەڵاکانی دارمێوەکەی لەسەر پەرش‌و بڵاوبوو.

بەتول خان ژنی خەلیل لەژێر سێبەری دارەبەنەکەدا کورسییەکی لەدار دروستکراوی دادەناو دەوروبەری هەمووی گوڵە وەنەوشە بوو، بەتول خان کە پێشیان ئەوت حاجی ژن لەناوەڕاستی باخچەکەدا سەوزەی دەچاندو گشت ڕۆژێک دەمەو عەسر لەئاوی حەوزەکە ئاوی ئەدان، حاجی ژن ئەگەر حەزی لێبوایە لەباخچەکەدا گوڵی پونگیشی دەچاند.

بەوتەی ڕەجەبی شاعیری دراوسێیان کە دەیوت:

- خانوەکەی خەلیل مرۆڤ دەباتە جیهانی مەستی‌و عیشق، دواتریش هەر بەپێشنیازی ئەم "ڕەجەب"ە خاوەنی خانوەکە لەناوەڕاستی حەوزەکەدا پەیکەرێکی دانا کە لەدەمییەوە ئاو دەردەچوو ئەمەش فوارەیەک بوو بۆ خۆی.

خەلیل لەژیانیدا زۆری حەز لەکوڕ بوو، لەمەدا خودا بەدڵی کردو چوار کوڕی پێبەخشی، کەچی حاجی ژن وەک زۆربەی ژنانی تر حەزی لەکچ بوو، کچێک کە هاودەم‌و هاوڕێی بێت.

حاجی ژن کاتێک دڵی تەنگ دەبو دەیوت:

- خەلیل ئەترسم بمرم‌و لەپرسەکەمدا یەک دڵۆپ فرمێسک نەڕێژرێت، ئەگەر کچێکم هەبوایە ئەو بۆم دەگریا.

خەلیل پێئەکەنی‌و دەیوت:

- لەجیاتی ئەو کچەدا چوار بوکت هەیە، خەلیل یەکەمین کوڕی ناونا "سالح" ئەیویست یەکەمین منداڵی کەسێکی ئیماندار بێت، کوڕی دوەمی خەلیل بەناوی "ئیسماعیل" لەخۆشی

ئیسماعیل کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم ناونرا، سێیەم کوڕ زۆر بەئەستەم هاتەژیانەوە.. خەلیل حاجی ژنی گەیاندە نەخۆشخانە، ئەو دکتۆرەی کە منداڵەکەی هێنایە دنیاوە کوڕێکی گەنج بوو بەناوی پەروێز، بەبۆنەی ئەو پزیشکە گەنجەوە ناویان نا "پەروێز"و ناوی منداڵی چوارەم خەلیل لەبەر دڵی حاجی ژن کە برایەکی لەشاری"مەشهەد" بەناوی ئیرەج هەبوو، بەڵام نەیدەبینی بۆیە ناویان نا "ئیرەج".

هەر چوار کوڕەکە لەهەمان ئەو خانودا پێیان گرتو تا هەریەکەیان بووە خاوەنی ژنو منداڵی خۆی.

خەلیل کە بۆ منداڵەکانی "باوکەگیان" بوو، زۆر شانازی پێوە دەکردن لەهەرکوێیەک کە دادەنیشت باسی ئەدەبو چاکەی کوڕەکانی دەکرد، کاتێک کە ئەیبیست کوڕی کەسێک ئیشی خراپ دەکات پێدەکەنیو دەیوت:

- پێویستە پیاو بەباشی منداڵەکانی پـەروەردە بکات، خراپی منداڵیش لەکەمتەرخەمی باوکەوەیە.. خەلیل پیاوی پەروەردەکردنی منداڵ نەبوو، چونکە منداڵەکان ئەگەر کارێکی خراپیان بکردایە دەخرایە ئەستۆی حاجی ژن، بەڵام ئەگەر کوڕەکە باش بوایەو پێبکەنیبا، خەلیل دەیوت:

- کوڕی منە.

بەرە بەرە کوڕەکانی خەلیل گەورە بونو کاتی ژنهێنانیان هـات، یەکەمجار ساڵح ئامۆزاکەی خـۆی پـەروین-ی هێناو منداڵێکیان بوو بەناوی وەحید کە لەکاتی ئاهەنگی ژنخوازیی ئیسماعیل-دا هاتە دنیاوە، جگە لە"وەحید" خودا سێ کچیشی بەساڵحو پەروین بەخشی (سەمانە، موحەدیسە، ئاسیە).

ئیسماعیلو ئەعزەم بونە خاوەنی سێ کوڕ (فەلامەرز نۆبەرەکەیان و، فەرهادو کیومەرس دوانە بون) دە ساڵ کەوتە نێوان ژنهێنانی ئیسماعیلو پەروێزی برای، پەروێز درەنگتر لەهەموویان ژنی هێنا.

پەروێزو نێرگس بەزویی بونە باوکو دایک "مەنوچەر" لەگەڵ دوانەکەی ئیسماعیل هاوتەمەن بوو.

## بەشی یەکەم

ئیرەج گـەورە بوو، کورێکی وشیار بوو، لەبازاڕدا ئیشی ئـازادی دەکـردو شتومەکی دەفرۆشـتو دەرامەتێکی باشی هەبوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بەباشی ئیشەکانی بکات.

بەرزەفڕییەکەی ئیرەج گەشتبووە گوێی باوکی، کارێکی خراپیش نەبوو، کوڕەکانی تری خەلیل؛ ساڵحو ئیسماعیلو پـەروێـز، هەموویان کارمەندی دەوڵـەت بـون، کەچی ئیرەج دەرامەتو ئایندەی لەکاسبی ئازاددا دەبینی، ڕاستیشی دەکردو ئەو کاسبییە پارەیەکی باشی هەبوو.

ئەو پیاوەی ئیرەج کاری لەلا دەکرد ناوی ئەمیرخان بوو، ئەم ئەمیرخانە سەرەتا دوکانی پێڵاو دورینەوەی هەبوو، وردە وردە بەئەستەمو هەوڵدانی بێوچان توانی چەند دوکانێک بکڕێت، پاشان بووە خاوەنی ئیشو کارگەی دانا، بەکورتییەکی گوزەرانی باش بوو.

هەمیشە ئیرەج باوەڕی وابو کە دەیوت:

- هەموو کارێک سـەرەتاکەی سـەختی تێدایە، برسێتی تێدایە، هێواش هێواش ئیش شێوەیەکی تایبەتی دەگرێتو سـەرکەوتن لـەرێوە دەگـات، دوایـیش مـرۆڤ دەبێتە یەکێکی وەک ئەم ئەمیرخانە.

ئیرەج لەبراکانی جیاواز بوو، تەنانەت حاجی ژن بەو هەموو پلانو سیاسەتەوە نەیتوانی بوو دەماری خەوتنی بدۆزێتەوە، ئیرەج لەکۆمەڵدا کەسێکی بێدەنگ بوو، هەوڵێئەدا بیری کەسانی

تر بخوێنێتەو پێشینان وتەنی بەزمانی خۆیان وەڵامیان بداتەوە، ئەمەش ڕەفتارێکی باش بوو.

خەلیل حەزی لەم ڕەفتارەی کوڕەکەی بوو، ئەو ئیرەجی لەهەمووو کوڕەکانی زیاتر خۆشدەویست، ئەگەرچی لەدەموچاویدا وادەردەکەوت دژی شێوازی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتی ئیرەجی کوڕیەتی، کەچی لەناخەوە بەبیرکردنەوە نوێو پوختەکانی خۆشحاڵبوو، تەنانەت هەندێ کات لەمینگەمینگی سێ کوڕەکەی تری توڕەدەبوو، بەڵام بۆ ئیرەج بەوشێوەیە نەبوو کاتێک دژایەتی شتێکی بکردایە بەکورتیو پوختی دژایەتییەکەی ڕادەگەیاند، هەر بۆ نموونە لەبارەی کارکردنی لەبازاڕ زۆر بەئاسانی توانی خەلیل ڕازی بکات، ئەمە لەکاتێکدا کەوا براکانی لێی توڕەبون، لەبەرئەوەی هەریەک لەوانە ڕۆژێک بیرێکی لەسەردا بووە، کەچی بەهۆی ترسی پەیوەندییەکانییەوە چاوپۆشی لێکردوە، ئیرەج زۆر بەئاسانی قسەکانی کرد.

خەلیل وابیری دەکردەوە کە ئەم ژیرییەی کوڕەکەی لەم جێیەدا کۆتایی دێت، بۆیە هیچ کاتێک بیری نەدەکردەوە کە ڕۆژێک ئیرەج دژایەتی هەموو بەرنامەکانی بکات، خەمخواردنی سێ براکە بەبۆنەی ئەمەوە بوو، چونکە دەیانزانی ئیرەج دەربارەی هەموو شتێک هەنگاوی نەگۆڕیی هەیە، خەلیل چەندین بەرنامەی چاکی لەمێشکدا بوو، ئیرەج دوایەمین منداڵی بوو دەیویست لەرێگەیەوە گشت ئارەزوەکانی ڕەنگی ڕاستی بگرن، بەوتەی پێشینان هەرگیز چوار پەنجە یەک شێوە ناگرن.

ورده ورده چپەکردن بۆ ژنهێنانی ئیرەج لەلایەن حاجی ژنو

خەلیلەوە دەستی پێکرد، ئیرەج وەک براکانی نەبوو، کەسێکی سەقامگیر، قسەیەکی هەبوایە هەرگیز نەیدەگۆڕی، ئیرەج لەمەشدا ڕاستی دەکرد، چونکە قسەکردن لەسەر ژنهێنان قسەکردن بوو لەسەر تەمەنێکی دوورو درێژ ،، باوکیان هەمیشە لەجیاتی هەموویان بڕیاریئەداو، بڕیاری ئەنجامدانی کارێکی بدایە سەرو ژووری نەبوو، ئەبوایە هەر ئەو بڕیارە بوایە، ئەمجارەش کچێکی بۆ ئیرەج دیاری کردبو، بەڵام ئیرەج نەیدەویست گوێ لەقسەکانی باوکی بگرێت، لەگەڵ خۆیدا دەیوت:

– خۆ خۆم چاوم هەیەو کوێر نیم، ئەم ورتە ورتە ئیرەجی خستە خەیاڵەوە، عەسر بوو ئیرەج هیلاکو کفت لەسەر کار دەگـەڕایـەوە، ئەو ڕۆژە شەڕێکی دەمەقاڵەی لەگەڵ یەکێک لەکڕیارەکاندا کردبو، بۆیە کاتەکانی زۆر تەماویی بـوون، لەخاڵی خۆیدا بوو، کاتێک ئافرەتێک بەگریانو شێواوییەوە بەرەو ڕوی هاتو وتی:

– کاکە، بۆ خوا یارمەتیم بدە مێردەکەم خەریکە دەمرێت.

ئیرەج بەبینینی ڕوخساری پڕ پاڕانەوەو نیگەرانی ژنەکە دڵی سوتاو لەگەڵیدا ڕۆیشت، پاش ماوەیەک ڕۆیشتن، ژنەکە دەستی بۆ کۆڵانێک ڕاکێشاو وتی:

– لەوێیەماڵەکەم لەوێیە.

ڕۆیشتە یەکێک لەخانوەکان، بێچارە مێردەکەی پیرەمێردێک بوو، ڕەنگو ڕوی پێوە نەمابوو، بەئەستەم هەناسەی بۆ ئەدرا، ئیرەج بەخۆی وت:

– واتـە ئـەم پیرەمێردە مێردی ئـەم ژنەیە، دەنگی ژنەکە بەرزبوەو بەدەنگێکی بزێو وتی:

- کاکە توخوا خێراکە.

ئیرەج کاتێک پیرەمێردەکەی خستە سەرپشت نیگای لەگەڵ دوو چاوی پڕگریانیدا گرێدا، کچێک لەپشتی پەنجەرەکەوە وەستابوو دەگریا، ئیرەج نەوەستا، پیرەمێردەکەی بەپەلە لەماڵ بردە دەرەوە، ژنەکەش بەگریانەوە دوای کەوت.

بەکورتی ئیرەج پیرەمێردەکەی گەیاندە نەخۆشخانە، بەڵام دڵی نەدەهات بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، ژنەکە ژمارەیەکی تەلەفۆنی بەئیرەج دا، ئیرەج بەبێ دواخستن بەرەو لای تەلەفۆنەکە ڕۆیشتو هەواڵی نەخۆشکەوتنی پیرەمێردەکەی بەکچو زاوای ژنەکە ڕاگەیاند، بەهاتنی کچو زاوای ژنەکە ئیرەج مانەوەی بەباش نەزانیو لەنەخۆشخانە هاتەدەرێ.

لەڕێی گەڕانەوەیدا بیری لەئەو دوو چاوە گریاناوییە هەر لەمێشکیدا بوو، بەبێ ویستی خۆیو بێ ئەوەی نیازی پێشوی هەبێت خۆی لەبەردەم ماڵی پیرەمێردەکەدا بینییەوە، نەیدەزانی بۆچی لەوێیە، دەستی لەزرزۆکینی لەسەر زەنگەکە داناو بەئارامی پەنجەی لەسەر دانا، دەنگی ئەو کە بەخێرایی باخچەکەی تێدەپەڕاند دەبیسترا، دەرگاکە کرایەوە، هەمان نیگابوو کە لەپشت پەنجەرەکەوە فرمێسکی دەڕشت، دوبارە گریانبوو، ئیرەج بەدەنگێکی لاواز وتی:

- سڵاو، کچەکە بەگرنگی پێدانێکەوە وتی:

- باوکم!.. چی بوو؟.. ئێستا لەکوێیە؟

ئیرەج زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- گەیاندمانە نەخۆشخانەو ئێستا لەژووری بووژانەوەیە، بەباشم زانی کەبێمو بەتۆ بڵێم تا نیگەران نەبی.

دنیا تاریک بوو ئیرەج بۆ تەنیا ساتێکیش لەبیری پیرەمێردەکەو کچەکەی دەرنەدەچوو، باخچەکە وەک هەموو ڕۆژێک قەرەباڵغ بوو، هەمیشە هاوینان وابوو وەحیدو فەلامەرزو کیومەرس‌و فەرهاد خاوەکەیان دەخستە سەرشانیان، هەندێ کات تورەبونی خەلیل زیاد دەبوو، کەچی سودی نەبوو، ئەو ڕۆژە ئیسماعیل لەهەیوان ڕۆژنامەی دەخوێندەوە, ئیرەج سڵاوی کردو بەخێرایی باخچەکەی تێپەڕاند ئەیویست بۆچەند خولەکێکیش بێت ماڵەکە بێدەنگ بێت بێ خواستی خۆی پەنجەرەکەی کردەوەو هاواری کرد:

– بەسە، ئیتر بڕۆنە بۆ ماڵی خۆتان، ئیسماعیل سەری بەرزکردەوەو وتی:

– فەلامەرز منداڵەکان ببەرەوە ماڵ، وەحید تۆش بڕۆرەوە بۆماڵەوە.

حاجی ژن کە لەچێشتخانە لەگەڵ بوکەکانیدا دانیشتبوو هاتە ژوورە، ئیرەج بەتورەییەوە وتی:

– ئاه، دایە هەواڵ چییە؟ هەرگیز نەبووە کە جارێک پێ بخەینە ئەم ماڵەو ئێرە چۆڵ بێت، هەموو جارێ ئەبێ دەنگە دەنگی منداڵان ببیستین.

حاجی ژن وتی:

– ئەزانم، بەلام باشە من چیبکەم، باوکتە هەر لوتفی بەمەوەیەو، دەڵێ: ماڵ ئەبێ پڕ بێت لەدەنگە دەنگی منداڵ.

پاشان بەهێواشی وتی:

– دوو ڕۆژی تر کە لەدەستی منداڵەکان وەڕەس ئەبێت، ئینجا هاواری دەگاتە ئاسمان کە ئەم منداڵانە چەند قسە ئەکەن.

دوایی بەئاوازێکی دڵسۆزانە وتی:

- دایە برسیتە؟.

ئیرەج بەرەو جێگەی نوێنەکان ڕۆیشتو پشتییەکی هێناو پاڵکەوت، پاشان وتی:

- چێشتی چیت هەیە دایە؟.. بەڵێ، برسیمە؟.

حاجی ژن ویستی لەژوورەکە بڕواتە دەرەوە وتی:

- ئەمڕۆ بۆ مەنوچەر دانولەمان دروستکردوەو دەورییەکم بۆ تۆ داناوە، ئێستا ئەڕۆم ئەیهێنم بۆت.. پاشان لەکاتی ڕۆیشتنە دەرەوەدا وتی:

- یاخوا ڕۆژێکیش نۆبەی منداڵی تۆبێت.

ئیرەج دوبارە کەوتەوە بیری کچەکە، قسەکەی دایکی ژنو ژیانی خستە یادی.

"٣"

ئاهـ کە دنیا چەند بێوەفایە، ئەڵێی دوێنێ بوو، لەروخساری ڕەنگ پەڕیویدا دیاربوو کە حاڵی زۆر باش نییە، لەسەر دیوارەکە لافیتەی مردنی هەمان پیرەمێرد هەڵواسرابوو "مەشهەدی یەزدان فەراهانی" کەواتە ئەم ماڵە "ئەراک"ین، ئیرەج سورەتێکی فاتیحەی خوێندو کەوتەوەڕێ، دەمێک بوو ئیرەج زۆر بیری دەکردەوە، لەبیری هەمان دوو چاوی گریاناوییدا بوو، لەبیری ژنهێنان، ژیانو دەنگە دەنگی منداڵدا بوو، لەبیری زۆر شتدا بوو، ئاهەنگی ژنهێنان.. هەلهەلەی شادی.. ئینجا لەبەری خۆیەوە:

نەخێر، لەم کاتەدا کە ئەوان پرسەیان هەیە نابێت بڕۆیتە

داوای ژن بۆ ماڵیان، پێویستە ئارام بگریو پێ بەجەرگی خۆتدا بنێی، من ئەزانم باوکم چ نەخشەیەکی بۆ داناوم، ئەو کچی شێخ جەوادی بۆ هەڵبژاردوم، من نامەوێت، ڕقم لەو شێخە زمان لوسەیە، چجا بەکچەکەی بگات، پیرەمێردێکە سێ ژنی هەیە، ئەم کچەی دیارنییە لەم کام ژنەیەتی؟

خۆرئاوا بوو، ئەو ڕۆژە ئیرەج دڵی خۆشبوو، چونکە پارچە ڕەشەکانی سەر دەرگای ماڵی ئەو کچەیان لابردبوو، ئیرەج ڕۆیشتە ناو باخچەکەوە.. دەستبەجێ چاوی بەمەنوچەر کەوتو بێ خواستی خۆی بەئاوازێکی پرسیارئامێز وتی:

- ها، براژن، مەنوچەر ڕێدەکات؟

- نێرگس بەپێکەنینەوە وتی:

- ئۆو، هەر پێی نایە ناو نۆ مانگییەوە ڕێی کرد، ئێستا دوو مانگە ڕێدەکات.

ئیرەج دەستی کرد بەگیرفانیداو پارەیەکی پێنج تومەنی دەرهێناو بەدەوری سەری مەنوچەردا هێناوبردیو خستییە گیرفانی مەنوچەر.. نێرگس وتی:

- وای خوا مەرگم بدات، ئەم کارانە چییە؟.

ئیرەج مەنوچەری خستە باوەشیو وتی:

-شایەنی نییە، مەنوچەر خۆشەویستی منە.

پاشان بەئارامییەکەوە وتی:

- ئینشا ئەڵلا، ئەبێتە زاوام.

نێرگس پێکەنیو وتی:

- جارێ تابیست ساڵی تر ژنهێنانی خۆت نابینین، ئینجا بەژنهێنانی کچەکەت.

ئیرەج وتی:

- ماوەیەکی تر هەواڵێک دەبیستی.

*******

باوکە مەگەر تۆ ئەتەوێت لەگەڵ ئەو کچەکە بژیت، مەگەر تۆ ئەتەوێت کچەکە پەسەند بکەیت، من بینیمو پەسەندم کرد.

ئەمەوێت هەر ئەو کچەم ئەوێت، خەلیل بەتوڕەیەوە سەیری ئیرەجی دەکرد وتی:

- ئەمە مانای چی؟.. تۆ کاتێک ئەو کچە ئەهێنیت ئەبێتە ئەندامی ئەم خێزانە، دەبێت ئەو کچە عەشیرەتی بەناوبانگی هەبێت، خانەوادەی هەبێت، ئێمە ئەمانە ناناسین.

ئیرەج لەبەردەم باوکیدا هەڵساو بەتوڕەییەوە وتی:

- کەواتە ناتانەوێت بچنە خوازبینی ژن بۆ من؟.. خەلیل وتی:

- کێ وتویێتی ئێمە ناچینە خوازبینی، بەڵام ئەم کچە نا، ئەم کچە باری دارایی لەگەڵ ئێمە ناگونجێت، ئێمەش ئاشنایەتییەکمان لەگەڵ خێزانەکەیاندا نییە.. ئیرەج وتی:

- ئێستا کە ئێوە ناچنە خوازبینی ئەو کچەی من دەمەوێت، من خۆم ئەرۆم.

ئیرەج ئەوەندە بەشێوەیەکی بڕاو قسەکەی کرد توڕەییەکەی باوکی زیاتر بوو، هاواریکرد وتی:

- کوڕە گێلەکە سەرکێشی بۆ من دەکەی، برۆ بزانم چ هەڵەیەک دەتەوێت بیکەی، بیکە.

بەکورتی بابەتەکە بەخۆتێهەڵقورتاندنی ساڵحو ئیسماعیل بڕایەوە، بەڵام دوای دوو ڕۆژ دوبارە دەستی پێکردەوە، خەلیل

زۆر بەخۆیدا دەینازی، دەیوت:

ئەبێت ئێمە لەگەڵ هاوئاستی خۆماندا ژنو ژنخوازی بکەین، هەموو کچێک توانای ئەوەی نییە ببێتە بوکی خانەوادەکەمان،، لەم نێوانەدا کەسێک نەبوو پێی بڵێت مەگەر خۆت کێی؟.. چ کارەی؟.. بازرگانی؟.. زۆر دەوڵەمەندی؟..

تۆیەک کە جگە لەخانویەکو موچەیەکی کارمەندی بژیو مەمرە چی ترت هەیە؟.. ئەم هەموو لەخۆبای بونەت لەچیە؟.. ئەڵبەت بوکەکانی خەلیل لەدڵەوە ئەم قسانەیان دەکرد، کەچی کەسیان نەیاندەوێرا ئەم قسانە لەبەردەمی خەلیل یان تەنانەت لەپێش مێردەکانیاندا بکەن.

بەکورتی وردە وردە دەنگەدەنگی هەموو شەوانەو بێنەو بەردەی کاتو بێکاتی خەلیلو ئیرەج بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی گەڕەک هەست بەشتێک بکەن، یەکسەر وتی وتی لەکولاندا دەستی پێکردو پروپاگەندە ئەوە بڵابووە کە گوایە خەلیل دەیەوێت کوڕەکانی لەخانوەکە دەربکاتو، کاتێکیش ئەم قسانە دەگەیشتە گوێی خەلیل وەک ئەوەی تیرێک لەدڵی دابێت تورە دەبوو، بەڵام ئایا چی دەتوانی بڵێت؟.. ئایا دەیتوانی لەکۆڵان جاڕبدات کە مەسەلەی هەموو شەوان لەبەر بابە تێکی تر بووە.

بەڵێ، بەمجۆرە بوو کە خەلیل بەم ژنهێنانە ڕازیبوو، خوازبینی هەمان ئەو کچەی ئیرەج دەستنیشانی کردبوو، بەڵام لەپێشدا حاجی ژن لەکۆڵاندا دەستی بەلێکۆڵینەوە کرد.. ئەوان دایکو کچێک بوونو بەتەنیا دەژیان، کچەکە ناوی "مونیرە" بوو، ژنهێنانەکە زوو سەری گرتو لەئاکامدا ئیرەج بەخواستی خۆی

گەیشت،، بەڵام دوبارە شەڕو مقۆمقۆ جارێکیتر لەسەرەتاوە دەستی پێکردەوە، ئیرەج ئەیویست سەربەخۆبێو، لەخانویەکی جیادا بژی، خەلیل بەمە ڕازی نەدەبوو.

تەماشاکە خەڵک چییان دەوت کە لەشەڕیکی بچوکەوە پڕوپاگەندەی وایـان دروسـتـدەکـرد، کاتێک ئیرج لەباوکی جیادەبێتەوە، دەڵێن بێگومان خەلیل کوڕەکەی لەماڵ دەرکردوە، ئەی مەگەر خەلیل هەمیشە نەیدەوت:

- کوڕەکانم پیاوچاکو قسە لەگوێ گـرن!.. یـان مەگەر نەیدەوت:

- باوک دەبێت توانای ئەوەی هەبێ کوڕەکانی بخاتە ژێر دەستی خۆی، مەگەر نەیدەوت:

- باوک ئەگەر نەتوانێت منداڵەکانی لـەدەوروبـەری خۆی کۆبکاتەوە ئـەوە بـاوک نییە، ئـەی ئێستا چـی؟.. لـەبـەردەم دراوسـێو کەسوکارەکەیدا ئابڕوی دەچێت!.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئیرەج سوربوو لەسەر بڕیارەکەیو، تا لەکۆتایدا برینی زمان بۆ بوکی تازە هاتوو دەستی پێکرد، حاجی ژن دەیوت:

- تۆ بوی کە یەکەمجار بڕیارو پەیمانتداو کوڕەکەی منت خستە دوای خـۆت، ئێستاش بێگومان خانوی سەربەخۆت دەوێ؟.. ئاخر دایکی مونیرە لەخانوی کرێدا دەژیـا،، ئیرەج کاتێک زانی دایکو باوکی چییان بەمونیرەی هاوسـەری کردوە، تاقەتی نەماو شەو کەلوپەلی ناوماڵی کۆکردەوەو بەیانی ڕۆژی دوایی لەماڵی باوکی ڕۆیشت.

سـەرەتا بۆ خەلیل ڕازیبون بەم مەسەلەیە زۆر ئەستەم بوو، بەڵام وردە وردە پێی ڕاهات، ژوورەکەی ئیرەج درا بەپەروێزو ژیان جارێکیتر گەڕانەوە سەر ڕەوتی ئاسایی خۆی.. ئیرەج شتو مەکەکانی چەند ڕۆژێک بردەماڵی خەسوی، بەڵام دوایی ژوورێکی لەو نزیکانە بەکرێگرتو کەلوپەلی ناوماڵی بۆئەوێ گواستەوە.

تەنیا دوو مانگ بەسەر شوکردنی مونیرە بەئیرەج تێپەڕی کاتێک مەنیجەی خوشکی مونیرە لەمێردەکەی جیابوەوە، مـێـردەکـەی مەنیجە، کـە نـاوی زەیـبـا بـوو کەسێکی زۆر بەدڕەوشت بوو، کەچی زۆر زوو دوای جیابونەوەی لەمەنیجە ژنی هێنایەوە، تەنیا باشەیەک کە زەبیا دەرهـەق بەمەنیجە کردبوی ئەوەبوو کە سادق-ی کوڕیانی بەمەنیجە دا، بەقسەی ئیرەج:

- ئەو باشییەشی تەنیا لەبەر خۆش ڕابواردنی خۆی کردوە، بەکورتی مەنیجە لەماڵی دایکی دەژیاو بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانیان لەکارگەیەکدا ئیشی دەکرد.

مـاوەیـەک ڕابـورد، مونیرە سکی پڕبوو، خەلیل لەگەڵ زویربونی لەئیرەج، وردە وردە ڕقو کینەکانی لەبیرکردو چاوەڕێی لەدایکبونی دوایەمین نەوەی خۆی دەکرد، لەم نێوانەدا تەنیا حاجی ژنو نێرگس "ژنی پەروێز" سەریان لەمونیرە دەدا.

منداڵەکە لەدایکبوو، ئیرەج زۆر خۆشحاڵبوو، شیرینی دا بەهەموو کارمەندانی نەخۆشخانەکە، نێرگس لەلای مونیرە بوو، حاجی ژن زۆر ڕازی نەبوو، منداڵێکی تابلێی جوان بوو، سپیو خرپنو موەکانی ئەستوورو ڕەش،، خەلیل بێدەنگ

بووبوو هەر تانەو توانجی دەدان لەژێر لێوەوە پێدەکەنی کە بۆچی منداڵەکە کچە؟.. بۆچی مونیرە وەک پەروینو ئەعزەمو نێرگس کوڕی نەبووە، خەلیل وایدەزانی بەهێنانە دنیای کچێک ئیرەج واز لەمونیرە دێنێت.

لەراستیدا خەیاڵەکانی خەلیل ڕاست دەرنەچون، بەبۆنەی ئەوەی کەمنداڵەکە ساغو سەلامەتە سوپاسگوزارو خۆشحاڵ نەبوو، بەڵام باشە مادام ئیرەج ڕازیبوو ئیتر تەواو، چونکە بەپێچەوانەوە، ئیرەج کچی خۆشتر دەویست بەبەردەوامی دەستە بچوکەکانی کچەکەی ماچ دەکردو دەیوت:

- بۆ ئەم دەستانە دە دانە بازنەی ئاڵتون دەکرم.

تەمەنی شەقایق بووە دوو مانگ، تائەو کاتە خەلیل بۆ بینینی نەرۆیشتبوو، بەهەر شێوەیەک بێت جیاوازی نییە، چونکە کاتێکیش کە ڕۆیشت ئەوەندە تورەبوو کە زیاتر بووە هۆی دڵشکان، خەلیل لەشادی ئیرەج مات بوبو، بەخۆی دەوت:

- ئەم کوڕە چەند بێدەسڵاتە، منداڵەکەی کچ دەرچوو، کەچی هەر بەخەیاڵیشیدا نایەت!.

بەکورتی، ڕۆژگار تێدەپەڕیو، ئیرەج بەسەختی ئیشی دەکرد، بەهۆی بەشداربونی لەکڕینی دوکانێکدا زۆر قەرزار بوبو، سەرباری ئەمانەش بەبونی شەقایقو ئارامی مونیرە دڵی خۆش بوو، هیچ خەمێکی نەبوو، شەقایق ددانی دەرکردو، کەوتە سەرپێ، قسەی کرد، وتی بابە، دایە، بەڵام زیاتر دەیوت سادق، لەگەڵ سادقدا زۆر هاوڕێ بوو، سادق چوار ساڵ تەمەنی بوو، سادقیش هیچ هاوڕێیەکی نەبوو، بەتایبەت کاتێک مەنیجە شویکرد بەیەکێک لەهاوکارەکانی خۆیو لەوە بەدواوە

کەمتر بەسادق دەگەیشت، ئەحمەدی مێردی مەنیجە پیاوێکی زۆر چاکبوو بەبۆنەی دوو کچەکە بچوکەکەیەوە ژنی هێنابوو.

"٣"

هەموو شتێک لەو ڕۆژە گەرمەی هاوینەوە دەستی پێکرد، ئێستا شەقایق تەمەنی یازدە ساڵەو زیاتر شێوەی لەدایکی دەچێت، خانووە بچوکەکەیان بەسادەیی‌و چاکەو خۆشی کەسەکانی ناویەوە گەرموگوڕ بوو.

ئیرەج هەرچەندە لەماڵی دونیا شتێکی زۆری نەبوو لەبەر مونیرەش پەیوەندی لەگەڵ ماڵی باوکیدا بڕیبوو، کەچی بەمشێوەش هێشتا هەر خۆی بەبەختەوەر دەزانی، ژیانێکی بچوکی دروستکردبو کە ئەنجامی پشتگیرییە نەبڕاوەکانی هاوسەرەکەی بوو، هەرگیز نائومێد نەدەبوو، بونی شەقایقی کچی‌و هاوسەرەکەی بەهۆکاری سەرکەوتنەکانی دەزانی.

چارەنوس ڕێگەیەکی تازەی دەخستە پێشیان‌و بەرەبەرە شیرازەی خێزانەکەیانی تێکدەدا، لەسوڕانەوەی گەردوندا فڕین‌و نیشتنەوەو تاڵی‌و شیرینی بنەمایەکن بۆ تاقیکردنەوە: بۆ جیاکردنەوەی باشەکان لەخراپەکان، ئارامگر لەبێئارام.

نیوەڕۆ بوو، وەک ڕۆژانی تر مونیرەو شەقایق لەدەوری سفرە دوو کەسییەکەیان دانیشتبوون، "جگە لەدوو مانگی سەرەتای شوکردن، ڕۆژانی تر مونیرە بەتەنیایی نانی نیوەڕۆی دەخوارد".. درا لەدەرگا، مونیرە هەستاو بەسەرسوڕمانەوە وتی:

کێیە بەم نیوەڕۆیە؟!.

ئەویش وەکو دایکی هەمیشە نیگەران بوو، ئەڵێی هەمیشە چاوەڕوانی هەواڵی ناخۆشە، بەڵام ئەمجارە دڵە خورتێکەی بێجێ نەبوو، ڕاستە دەڵێن ئەگەر ڕووداوێکی ناخۆش بەڕێوەبێ ئیلهام دەدەن بەمرۆڤ.

ئیرەج لەگەڵ پیاوێکی تر کە چوبووە ژێر باڵی هاتنە ماڵەوە، بەرەنگپەڕیوی دەهاتە پێشچاو، مونیرە بەترسەوە وتی:

- چی ڕوویداوە ئیرەج؟.. ئەو پیاوەی لەگەڵ ئیرەج هاتبوو بەهێواشی وتی:

- شتێک ڕوینەداوە، وادیارە زۆری خواردوە.

مونیرە ڕوی کردە پیاوەکەو بەترسەوە پرسی:

- چی بووە کاکە ڕوداوی ئۆتۆمبیل بووە؟.

پیاوەکە پێکەنیو وتی:

- هیچ ڕوینەداوە، هاوشیر، نیگەران مەبە تەنیا زۆری خواردوەو دڵی ئازاری گرتوە، منیش وتم بابڕۆین بۆ لای دکتۆر، کەچی ئەو ڕازی نەبوو.

مونیرە سوپاسی پیاوەکەی کردو ئەو ڕۆشت، ئیرەج خەوتبوو، ڕوخساری هیلاک بوو، ڕۆژی دوایی‌و ڕۆژانی دواتر دڵئێشە دوبارە بوەوەو ئەوەندە ئارامی لەئیرەج بڕی کە لەتاوی ئێشدا ئەوەندەی نەمابوو قەپ بکات بەزەویەکەدا.

دکتۆرەکان سەریان لەنەخۆشییەکەی دەرنەئەهێناو حاڵی ئەو ڕۆژ بەرۆژ خراپتر دەبوو، حاجی ژن لەگەڵ خەلیلدا چەندینجار سەردانیان کردو بەرای ئەوانیش ئیرەج زۆر لاوازو ڕەنجەڕۆ بووبوو، جگەرو شیرو داودەرمان هیچ کاریگەرییەکی نەبوو، نەخۆشییەکەی ئیرەج ڕۆژ بەرۆژ قورستر دەبوو، ئەڵێی

دوای ئەو ڕۆژە خۆش‌و باشانە نۆبەی غەم‌و تاڵی گەشتووە، نەخۆشییەکەی ئیرەج هەموو شتێکی خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە، وردە وردە دەنگە دەنگی خاوەن خانوەکە دەستی پێکرد، ئەمە سەرەتای هەموو سەختییەکان بوو.

*******

- من چیم لێهاتوە مونیرە؟.

مونیرەش نەیدەزانی ژیانی چی لێهاتووەو چی لێدێت، بەڵام تێگەشتبوو کە کونەپەپوی شومی ڕۆژگار شوێنی قەلەپاچکەی خۆشبەختی گرتوە.

- هیچ نییە ئیرەج، تا کۆتایی بەمجۆرە نابێت، حاڵت باش دەبێت‌و ئەڕۆیتەوە سەر ئیشەکەت.

ئیرەج نیگای سەنگینی بەچاوانی مونیرەوە گرێداو بەهێواشی وتی:

- ملوانکەکەت فرۆشت؟.

مونیرە بەپێکەنینێکی ساختەوە وتی:

- زێڕو زیو بۆ ئەم ڕۆژانەیە ئیتر، کە چاک بویتەوە دەبێت بۆمی بکڕیتەوە!.

ئیرەج پێکەنی‌و وتی:

- ئەها، کەواتە دوایی ئەتەوێ زیان بدەی، بەڵێ؟.

پاشان لەدڵی خۆیدا وتی:

- سوێند بەخوا ئەگەر چاک ببمەوە لەبری ئەو ملوانکە سەر تاپات پڕ دەکەم لەئاڵتون!.

ئازار ئەمانی نەبوو، ڕۆژ بەرۆژ زیاتر دەبوو، ئەمرۆ سەختتر لەدوێنێ ئیرەجی ئازار ئەدا، ئاکام ئیرەج کەوتە نەخۆشخانە.

خەلیل هەموو ڕقو کینەیەکی دڵی وەلاوەنـاو هاتە ژوور سـەری ئیرەج، ئەو ئیرەجە بەهێزەی کە نازناوی پاڵەوانی لەماڵدا هەبوو، ئێستا بووەتە پیاوێکی ڕەنجەڕۆیە وەک مۆم لەبەردەم هەمووواندا دەتوێتەوە تادەبێتە ئاو..

*******

"٤"

دکتۆرەکان وتیان:

- تـازە ئیـرەج چـاکنـابێتـەوە.. بـەمـشـێوەیـە ئیـرەجیـان لەنەخۆشخانە دەرکردو تەنیا خەلیل دەیزانی کوڕەکەی تەنیا چەند ڕۆژێکی زیندوە، کوڕە گەنجەکەی بچوکترین منداڵی باوکی.. بێ ئەوەی کارێکی لەدەست بێت، خەلیل ئیرەجی بردە ماڵی خۆی، بردییە هەمان ئەو ژوورەی کە بڕیاربوو بدرێتە ئەوو مونیرەو ئێستا دراوە بەمەنوچەر.

حاجی ژنی بێچارە چێشتی خەیری دروستکردبو، مونیرە هەمیشە ئەڕۆیشت بۆ ئیمامزادەی یەحیاو زیارەتی عاشورای دەخوێند، مردنیش لەگەڵ چرکەکاندا هەنگاو بەهەنگاو لەئیرەج نزیک دەبووەوە.

شەو بوو، کاتێک حاجی ژن لەسەر بەرماڵەکە دانیشتبوو، دەپاڕایەوەو داوای چاکبونەوەی بۆ کوڕەکەی دەکرد، خەلیل لەپشت پەنجەرەکەوە چیچکەی کردبو، دەستی لەسەر سەری دانابوو، تەماشای ژوورەکـەی ئیرەجی دەکـرد.. بەبێویستی خۆی وتی:

- حاجی ژن، دەڵێم ببمە قوربانی حیکمەتی کارەکانی خودا،

ببمه قوربانی گەورەییەکەی. یەکێکی وەک ئەم ´بی بی˚ە کە توانای نان خواردنیشی نییە، ئەوکات بەوجۆرە خەریکە گیان دەسێنێ، یەکێکی وەک ئەم کوڕەی ئێمەش گەنجو زیرەک خەریکە دەمرێت، دەمەوێت هاوار بکەم خودایە گیان بەگەورەیی خۆت مردنی من بخەرە پێش مردنی ئەو گەنجەوە، مەگەر چەند ساڵە، ئێستا بیستو نۆساڵە!.. خودایە ئەمە ستەمە، ئەمە نادادپەروەرییە.

حاجی ژن هەستاو بەخێرایی وتی:

- ئاهـ ئاهـ پیاوەکە خەریکە کوفر دەکەیت ها!.. تۆ لەکوێ دەزانی حیکمەتی ئەم کارە چییە. لەوانەیە ئەمە بەشی خۆی بوبێو کەوا وائازار بچێژێت.

خەلیل پێکەنینێکی کردو وتی:

- ئافرەت، تۆ چەندە بەئارامی؟ من خەریکە دەمرم، خەریکە دیق دەکەم.

حاجی ژن بێدەنگ بوو، لەنیگایدا غەمێک هەبوو ئەوەندە دەریایەک گەورە بوو، بەهێواشی وتی:

- بۆچی دەتـەوێ ئەم ڕاستییە تاڵە لەهەمووان، تەنانەت لەمنیش بشاریتەوە، هەرگیز وابیرمەکەرەوە من نازانم، ئاگام لێیە کوڕەکەم نامێنێت، باش ئاگام لێیە دکتۆرەکان چییان ووت، دەزانم وتیان بیبەنەوەو لەگەڵیدا بسوڕێنەوە خەلیل من ئەمە دەزانم.

ئەگەر ئەمەشم لەدکتۆرەکان نەبیستایە خۆم لەحاڵی کوڕەکەم تێدەگەشتم، بەڵام خودا تاقەتێکی پێداوم کەخۆشمی سەرسامکردوە!.

خەلیل لەبەردەم حاجی ژندا نکوڵی نەکردو بەدەنگێکی لەرزۆک وتی:

- بەخودا ڕاستدەکەی، هەر کاتێک ئەم ئازارە نەفرەتییە دەست پێدەکات، هەر کاتێک لەبەر سەختی ئازارەکەی بانگدەکات: باوکەگیان، خەریکە پەتی دڵم دەبڕێتو دەمەوێت سەرم بدەم بەدیوارێکدا، حاجی ژن چی بکەم، ناتوانم ببینم کوڕە گەنجەکەم بەخۆڕایی لەدەست دەچێت.

حاجی ژن کەمێک وەستاو ئینجا بەچەند وشەیەکی پچڕ پچڕ وتی:

- حاجی.. ئەمڕۆ خەدیجەخان شتێک.. شتێکی پێوتم کە ئەوەندەش بێ پەیوەندی نەبوو!.

خەلیل لەشێوازی دەربڕینەکەی حاجی ژن توڕەبوو، بەپەلە وتی:

- چی وت؟!

حاجی ژن بەمنگە منگ وتی:

- خەدیجەخان وتی مەهێڵن ئیرەج ئەوەندە ئێشو ئازار بکێشێ.. منیش پرسیم دەی باشە چی بکەین؟.. وتی: لەکاک نەباتی کەمێک تلیاک وەربگرن بیدەنێ بابیخوات، ئاخر کاک نەباتی لای دەوڵەت بەشدارە، ئەو هەموو مانگێک پاکەتێک تلیاک وەردەگرێت.

کاک خەلیل لەتوڕەییدا هاربوو، وتی:

- ئافرەت، ئەزانی بەراستی ئافرەتێکی نەفامی.. "حاجی ژن دەستی بەنیشانەی بێدەنگی خستە سەر دەمی، بەڵام خەلیل بەدەنگێکی بەرز بەردەوام بوو".. ئاخر ئافرەت ئەگەر کوڕەکە

چاكبێتەوە چی؟.. دەتەوێت بەدبەخت بێت.. كە هەموو ڕۆژێك بەزۆر لەلای كورەو تلیاك هەڵی بسێنم، ئەستەغفیروڵلا لەم ژنە فیتنەیە لەم..

حاجی ژن هەستاو بەتوڕەییەوە وتی:

- باشە، ئێستا من قسەیەكم كردو هێشتا تلیاكم نەهێناوە بەزۆر بیكەمە دەمی-یەوە.

كاك خەلیل بەحەسرەتێكەوە:

- لێت نایەت. ئەگینا ئەوەشت دەكرد!

ئیرەج لەناكاو لەخەو هەستا، بینی كەسێك لەدەوروبەری نییە، بەڵام لەو خەوەی كە دیبوی تەواو ترسابوو، لەخەویدا شەقایق توشی نەخۆشییەكەی ئەو بووە، لەژێر لێوەوە ورتە ورتی دەكرد:

- ئەستەغفیروڵلا، ئەمە چی خەوێك بوو بینیم.

مونیرە لەحەوشەكە دانیشتبوو، ئاگای لەئیرەج بوو كە بەروخسارێكی شپرزەوەو ترساوەوە ئەبڵەقی پێشەوەی خۆی بووبوو، دەستبەجێ ڕایكرد بەرەو ژوورەوەو خێرا پەرداخێك ئاوی دایەدەستی.

- چی بووە ئیرەج؟!*

ئیرەج لەسەر جێگەی نوستنەكەی جێگۆڕكێیەكی كردو بەدەنگێكی لاواز وتی:

- سەرەتا دەرگاكە پێوە بدە، كارم پێتە.

مونیرە هەستاو دەرگای ژوورەكەی داخست.

- باشە دەی بڵێ.

ئیرەج ئەبڵەقی پێشی خۆی بوبو. دەترسا سەیری دەموچاوی مونیرە بکات، نەیدەویست کاریگەری قسەکانی لەسەر دەموچاوی مونیرە ببینێت. بەهەمان دەنگی پێشوو وتی:

- من.. من چەند مانگێک پێش ئێستا زۆر ئومێدەوار بووم..

مونیرە قسەکانی بڕیو وتی:

- مەگەر ئێستا ئومێدەوار نیت؟

ئیرەج بەتوڕەییەوە وتی:

- بهێڵە قسەکانم تەواو بکەم.. پاشان ئارامتر وتی:

- من ئومێدەوار بوم بەڵام.. ئێستا ئیتر ئەزانم کە نامێنم.

مونیرە ویستی قسەیەک بکات بەڵام ئیرەج بەدەنگێکی بەرز وتی:

- مونیرە باش گوێ بگرە!.. دەزانم کە ئەگەر ئەمڕۆ نا، ئەوا سبەینێ بێگومان دەمرم، لەم نێوانەدا تۆ دەمێنیتەوەو شەقایق، من چاوەڕێ نیم لەبەر خاتری من بەئەمەکداریی بمێنیتەوە:

بڕۆ شوبکە.. بژی، بەڵام وەک مەنیجەی خوشکت نەبیت کە سادقی لەبیرکردوە، من شەقایقم زۆر خۆشدەوێت، گوناهباری ئەگەر لەیادی بکەیت.

مونیرە بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە ئەبڵەقی ئیرەج بوو، چاوەڕێی بیستنی قسەی تری دەکرد.. چاوەڕێ بوو تا ئیرەج قسەی هیوابەخش بکات بەوەی کە باش دەبێتەوەو دوبارە وەک جاران لەسەر ژیانی سادە، بەڵام بەختەوەریان کۆببنەوە.

ئاوازەکەی ئیرەج ڕەنگێکی گونجاوتری لەخۆگرت، ڕاستەوخۆ سەیری ناوچاوانی مونیرەی دەکردو بەهێواشی وتی:

- ئەو ڕۆژەی کە بینیتم چویتە دڵمەوە.. بەخۆمم وت: لەگەڵی

دەمێنمەوەو ئەبمە مێردیو تاكۆتایی ڕێگەی ژیان لەگەڵیدا دەمـرم، دەبمە هاوڕێی.. بەڵام وەک ئـەوەی بومەتە هاوڕێی نیوەی ڕێگە، وەک ئەوەی..

مونیرە هەستاو هاواری كرد:

- بێ دەنگ بە.. شێت!

"٥"

مونیرە بـەچـاوی فرمێسكاوییەوە لـەژوورەكـە ڕۆیشتە دەرەوە، ئەگەرچی لەقسەكانی ئیرەج زۆر تـوڕەبوو، بەڵام لەدڵدا نەیدەتوانی نكۆڵی لەئەم ڕاستییە تاڵە بكاتو نەیدەتوانی خۆی بەم قسانە كە ئیرەج چاكدەبێتەوەو، دوبارە دەكەوێتەوە سـەرپێ، دەكەوێتەوە ڕێو هەموو شتێک وەک جارانی لێدێتەوە. هەڵبخەڵەتێنێت.

چەند ساتێک لەگەڵ خۆیدا بیریكردەوە، چی ڕۆژگارێكە چارەنوس‌و قەدەر ئەوەندە مرۆڤ توشدەكات كە ناتوانێت كاتی سەرسوڕمانیش بەدەست بێنێت. ئەوو ئیرەج زۆر بەسادەیی یەكتریانناسی، مردنی باوكی بووە هۆی نزیكبونەوەیان، ژیانی هاوسەرییان لەدەستپێكردنییەوە ڕێگەی سەختو پێچاوپێچی غـەمـبـاری دەسـتـی پـێكردبو، لـەگـەڵ ئـەمـانـەشـدا شتەكان بەئەندازەیەكی گەورە بەگوێرەی ئارەزوو بوو.

ئیرەج كارێكی باشی هەبوو، میهرەبان‌و ڕەفتاریشی چاكبوو، پـاروە نانێكی بـەدەسـت دەهێنا بـەوتـەی پێشینان لەئاستی بژیو مەمرەدا بوو، هێشتا دڵیان شادبوو.. شەقایق بەرهەمی عەشقەكەیان بوو كە ئێستا تەمەنی یانزە ساڵە..

مونیرە ئەوکاتە هەرگیز بەمجۆرە سەیری ژیانی ڕابردوی خۆی نەکردبو، ئەو هەموو شتێکی لەبیرکردبو:

- نازانم لەوانەیە خودا منی تەمبێ کردبێت لەبەرئەوەی سوپاسگوزاری نەبوو، بەڵام بۆچی ئیرەج، بۆچی ئەو...

دوبارە ئێش‌و ئازارە دڵ تەزێنەکانی ئیرەج دەستی پێکردەوە، مونیرە توانای بینینی ئیرەجی لەم بارودۆخەدا نەبوو، حاجی ژنی بێچارە دەگریاو لەدەوروبەری ئیرەج دەسوڕایەوەو باوکەگیانیش لەلای حەوزەکەدا تەماشای گوڵدانە مۆمدانییەکانی دەکرد.

لەم ماوەدا ژیانی هەمووان شپرزەو شێواو بوو، چیتر هەواڵێک نەبوو دەربارەی چەتونی منداڵان‌و کاروباری ڕۆژانە، کەس ویستی کارکردنی نەمابوو، هەموو بەخۆیاندا ڕۆچوبونە خوارەوە.. دەست‌و دڵی کەس بۆ هیچ کارێک نەدەرۆیشت. کاتێک شەو دادەهات بۆشایی ماڵەکە جوان دەبوو، هەر کەسێک پەنای دەبردە بەر چۆڵاییەکو بۆ چاکبونەوەی ئیرەج دەپاڕایەوە، کەچی کەس ئاگای لەشەقایق نەبوو، کە چۆن زیاتر لەهەمووان ئازاری دەچێژاو ئەیویست کاتێک باوکی ئازار دەکێشێ‌و یارمەتی دەوێت لەژوورسەری بێت‌و هەرچی لەتوانایدا هەیە بیکات، بەڵام هەمووان ئەویان لەبیرکردبو.

******

حاجی ژن لەلای دەرگاکەوە وەستاو هاواری کرد:

- خەلیل، توخوا وەرە بیبە بۆ لای دکتۆر.. منداڵەکەم خەریکە لەدەست دەچێت.

خەلیل لەسەر بەرماڵەکە هەستاو بەپەلە ڕۆیشت بۆ

ژوورەکەی ئیرەج، بەزەحمەت ئەویان لەماڵ بردە دەرەوەو، لەسەر جادەکە بەبێ دواکەوتن ئۆتۆمبیلێکیان گرتو ئەویان برد بۆ نەخۆشخانە.

مونیرە تازە لەدەرمانخانە دەگەڕایەوە، پەروینو ئەعزەمو نێرگس هەوڵیاندا ئارامی بکەنەوە، مونیرە نەیدەتوانی ئارامبگرێت، ڕێی دەکرد، دەیقیژاند.. خەریک بوو شێت دەبوو.. بەڵام بەپێچەوانەی چاوەڕوانییەوە، باوکەگیانو ئیرەجو حاجی ژن زۆر زوو گەڕانەوە، وادیاربوو ئیرەج حاڵی باشتر بوو.. مونیرە یارمەتیدا تا ئەویان بردە ژوورەکەوە، هەرچەندە تەنانەت شەقایقی تەمەن پانزە ساڵ دەیتوانی بەتەنیا ئەم کارە بکات، چونکە بەدرێژایی ئەم ماوە ئیرەج ئەوەندە لاوازو ڕەنجەڕۆبوو کە شەقایق لەو بەهێزتر دەردەکەوت.

- باوکەگیان زوتر لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە وەک مرۆڤە گێژو ورەکان ڕۆیشتو لەلای حەوزەکە دانیشت، ئەعزەم هەنگاوێکی بەرەو پێشەوەناو بەدەنگێکی هێواش وتی:

- باوکەگیان دکتۆر وتی چی؟

باوکەگیان سەری بەرزکردەوە. واقوڕماو چەند چرکەیەک سەیری دەموچاوی ئەعزەمی کردو، پاشان وتی:

- دکتۆر وتی.. هەر ئەمڕۆو سبەینێ..

پەروین دەستی بەتوندی دا بەدەمی-داو ئاهێکی درێژی هەڵکێشا، باوکەگیان تەواوی دوا نیوەڕۆکەی لەلای ئیرەج بەسەربرد، ئیرەج ئارام ئارام قسەی دەکرد، هەندێ جاریش گاڵتەی دەکرد، ئەڵێی باوکەگیان پێویستی بەدڵدانەوەو هاندان بوو.

- ئاخ..

ناڵەیەک لەدڵی ئیرەجەوە هەستا، باوکەگیان بەپەلە لەشوێنەکەی هەستاو لەبەردەمی ئیرەجدا لەسەر ئەژنۆ دانیشت.

- چییە ئازارەکەت دەستی پێکردەوە؟

ئیرەج سەیرکردنە بێ کۆتاییەکەی ڕوکردە دەموچاوی باوکەگیانو بەتوڕەییەوە وتی:

- باوکەگیان دەمەوێت تەواو بم.. هیلاکبوم چیتر تاقەتم نییە.

باوکەگیان پێکەنینێکی دروستکراوی خستە سەر لێویو وتی:

- چاک دەبیتەوە کوڕم.. چاک دەبیتەوە، بەئومێد بەپشت بەخوا بەستە.

ئیرەج بەهێواشی پاڵی دایە دیوارەکەوەو بەدەنگێکی لاواز وتی:

- ئەمانە هەمووی دڵ گەرمییە.. دوو مانگ پێش ئێستا کاتێک هێشتا نەخۆشینەکەم نەبووبووە ڕاستی بەخۆمم دەوت هەڵدەستمو.. دەکەومەڕێ، دوبارە کارم دەکەم، گیان دەگرمەوە بەرخۆم، بەڵام ئێستا دەزانم کە هەر ئەمڕۆ یاخود سبەینێ.. جیاوازییەکی نییە، لەئاکامدا لەیەکێک لەم ڕۆژانەدا جێگەم ژێر گڵە..

باوکەگیان نەیتوانی پێشی خۆی بگرێت لەکاتێکدا فرمێسکی دەرِشت، وتی:

- ئەمە ڕەوا نییە کە من زیندوبمو منداڵەکەم.. لەبەرچاومدا پەرپەر بێتەوە!.

ئیرەج زەردەخەنەیەکی تاڵی خستە سەر لێویو وتی:

- باوکەگیان مەگەر خۆت نەتدەوت خوا هەموو کارەکانی

لەسەر حیکمەتو بەرژەوەندییە، دەی هەر ئەمە بوو کە من برۆمو تۆ بمێنیتەوە، بەلام.. دڵنیگەرانی من بۆ مونیرەو شەقایقە..

*******

"٦"

باوکەگیان سەری بەرزکردەوەو وتی:

ئێستا کە قسەکە گەیشتە ئێرە دەمـەوێت چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە، نازانم حەزرەتی موسا بووە یاخود پێغەمبەرێکی تر، باش لەبیرم نییە، ئەم چیرۆکە کاتێک منداڵ بوم لەباوکی خوالێ خۆشبوم بیستوومە، دەڵێن:

کاتێک ساتی مردنی حەزرەتی موسا نزیک دەبێتەوە خودا پێی ڕادەگەیەنێت کە کاتی مردنت نزیک بووەتەوە، حەزرەتی موسا دەستبەجێ نارەحەت دەبێت.. خوداوەند دەڵێت:

– چییە؟!.. لەمردن دەترسی. حەزرەتی موسا دەڵێت:

ئەی خودا ترسی من لەبەر مردن نییە، ترسی من لەبەر منداڵەکانمە، دوای من چیان بەسەر دێت، نیگەرانی من بۆ ئەوانە.. خودا حەزرەتی موسا دەباتە کەناری دەریـاو لەوێ کرمێکی پیشان دەدات، کرمێکی بچوک لەژێر بەردێکدا بوە، پاشان بەحەزرەتی موسا دەڵێت:

– موسا من کە ئـەم کرمە بچوکەم لەبیرنەکردوەو ڕۆزییەکەی لەبیرناکەم، چۆن دەبێت بەندەکانم لەبیر بکەم..

بەکورتی ئیرەج پێویستە پشت بەخوا ببەستی، هەمیشە وتویانە "ئەجەلی گەڕاوە دەمرێت" خوات چۆن بینیوە لەوانەیە باش ببیتەوەو ئێمە بمرین.

ئیرەج ئەبلەقی خاڵێک بوو، بەشێوەی چپە وت:

- بەڵام من دەنگی پێی مردن دەبیستم.

شەو بوو، بێدەنگی شەو بەدەنگی گریانو پاڕانەوەی دانیشتوانی ماڵەکە دەشکا، کتوپڕ چرای ژوورەکەی ئیرەج داگیرسا، ئیرەج لەژێر کاریگەری ئازاردا لێفەکەی بەددان گرتبو، بەدەوری خۆیدا دەسوڕایەوە، مونیرە تەنیا دەگریا.. بەکورتی هەمووان لەخەو هەستابوون، تەنانەت فەرهادو کیومەرسیش.

- بیبەین بۆلای دکتۆر!!

ئەمە مونیرە وتی، حاجی ژن دەگریاو بەهێواشی وتی:

دکتۆر وتویەتی هیچ شتێک لەدەستی ئێمە نایەت..

ئیرەج تابەیانی ناڵاندیو ئازاری هەبوو، فرمێسکی ڕشتو هەمووان لەگەڵ ئەودا دەستیان بەگریان کردو شیوەن، چاوەکان دەگریانو دڵەکان دەپاڕانەوە، بەڵام لەدەمەو بەیانی ڕۆژێکی مانگی شەهریوەر، ئیرەج لەکاتێکدا دەستی لەناو دەستی باوکەگیاندا بوو لەکۆتاییدا ئارام بووە.

ئەو ڕۆشتو هەمووان بەڕۆشتنی خەفەتبار بون، بەبڕیاری باوکەگیان هەمووان بەسەر کۆستی کۆچی دوایی ئیرەجدا ئارامیان گرتو بێدەنگ بون تا ڕۆژ بووە، دراوسێکانی خەلیل چەند نەخۆشێکو ژمارەیەک پیرەژنو ژمارەیەک پیاوی پیر بوون.. باوکەگیان وتی:

- جوان نییە کە خەڵک لەخەو هەستێنین.

هەمووان لەبێدەنگییەکی تاڵو ئازاربەخشو گریانو شیوەن بۆ لەدەستدانی ئیرەج لەدڵەوە ناڵاندیان، ئەو پارچە قوماشە سپی-یەی کە دابویان بەسەر دەموچاوی ئیرەجدا

لەفرمێسکەکانی شەقایقدا تەڕبوو، سودی نەبوو، هیچ شتێک سودی نەبوو، ئیرەج هەرگیز نەدەگەڕایەوە..

ڕۆژ بویەوە، ئەمە تاریکترین بەیانی بوو کە لەئاسمانی ژیانی مونیرەو شەقایقدا هەڵدەهات، ئەمە خراپترین ڕۆژ بوو کە لەیادگاری ئەو دوانەدا تۆمار دەبوو.

هاوارەکان، ناڵەکانو قیژەکان گەیشتە ئاسمان، ماڵ قەرەباڵغ بوو، پارچەی ڕەشیان هەڵواسیو دەنگی قورئان بەرزبووە، خورما بەشکرایەوە، هاتنو، چون سەرە خۆشییان کرد.. ئیرەجیان بەخاک سپارد..

حەوت ڕۆژ ڕابورد.. هەموو شتێک تەواوبوو. هەر کەسێک بەرەو ژیانی خۆی ڕۆیشتو خەمی ئیرەج لەبیرکرا، تەنیا مونیرەو شەقایق بون کە هەستیان بەچۆڵی شوێنەکەی ئیرەج دەکرد.

ئێستا کە هەموو شتێک تەواوبووە، پارچە ڕەشەکان لابراونو ئارامی گەڕاوەتەوە بۆ ناو ماڵەکە، تازە نیگەرانی مونیرە دەستی پێدەکرد، خاوەن خانوەکە کە چەند جارێک بۆ سەرەخۆشی هاتبوو لەگەڵ کاک خەلیلدا بەسەرهاتی کرێ دواکەوتوەکانیان باس کردبو، تازە برینو گرێکانی کۆنی خۆیان پیشاندا، ڕقو کینەکانو دوژمنایەتییەکان دەستی پێکرد.

دوبارە برینی زمانەکان دەستی پێکرد، بەڵام باشە مونیرە چارەیەکی نەبوو جگە لەخۆڕاگریی، دایکی مونیرە کرێچی بوو، بەموچەیەکی کەمی مێردەکەی ژیانی دەگوزەراند، مونیرە هەرگیز نەیدەتوانی پەنابەرێتە بەر دایکی، خەلیل بەباشی لەم مەسەلە گەیشتبوو.. چارەیەکی نەبوو بێجگە لەوەی کە جێگەی

بکاتەوە، ئەویش تەنیا لەبەر کوڕەکەی.

هەمان ئەو ژوورەی کەوا ئیرەج دوایین ڕۆژەکانی ژیانی تێدا گوزەراند بوو، درا بەمونیرەو شەقایق، وەرزێکیتر لەژیانی شەقایق دەستی پێکرد، وەرزێـک کە لەگەڵ بـەرزیو نزمی زۆردا هاوڕێ بوو.

"۷"

مێژوو خۆی دوبارەکردەوە، هەمان ئەو قسە تاڵو دڕکاوییانە دەوترانەوەو دڵی مونیرە لەپێشتر زیاتر ئازاری دەچەشت، نەک تەنیا لەبەر بیستنی تانەوتەشەر، بەڵکو لەبەرئەوەی لەهەموو کاتێک زیاتر هەستی بەتەنیایی دەکرد، ئەو ڕۆژگارەی وەبیری خۆی دەهێنایە کە تێیدا هەمان قسەو تانەو تەشەری تێدەگیراو دواتر چۆن ئیرەج بەمیهرەبانییەکەوە دڵی دەدایەوەو، دەیوت:

- دەزانـــم نـاخـۆشـە، بـەڵام ڕۆژە بـاشو شیرینەکانیش چاوەڕوانی ئێمەن، ڕۆژێک شانازیمان پێوە دەکەنو من دڵنیام ڕۆژێک لەبەر تەواوی ئەو قسانەی کە بەتۆیان وتبوو پەشیمان دەبنەوە..

کەچی ئێستا نەهامەتییەکان زیـادیـکـردوەو هاتنی ڕۆژە شیرینەکان مەحاڵ دیارە.

وردە وردە ژیان ڕەوتـی ئاسایی وەردەگـرتو، هەمووان خەمی لەدەستدانی ئیرەجیان لەبیرکردبو، هەر وەک ڕۆژێکی تـەواو خـاڵی لـەخـەمو پـەژارە بـەردەوامـیـان بـەژیـان دەدا، پایز دەستی پێکردبو، لەسەر داوای حاجی ژن کوڕەکان کەرەستەکانی تـرشـیـات-یـان کـڕیـبـوو.. بـوکـەکـان خـەریکی

ئامادەکردن و دروستکردنی ترشیات بوون.

مونیرە لەگەڵ خۆیدا بیریدەکردەوە ئەگەر هەر لەرۆژی یەکەمەوە ژیانیان لەم خانوەدا قبوڵبکردایە لەوانەیە ئێستا ئەوەندە بەدابونەریتی ئەم ماڵە نامۆ نەدەبۆم.

بوکەکانی حاجی ژن ئەگەرچی سەربەخۆ بوون، لەهەندێک لەکاری وەک ترشیات دروستکردن هەمووان بەبێجیاوازی هاوکاریان دەکردو مونیرەش وەک ئەوانیتر لەکاری ماڵدا بەشداری دەکرد، تەنانەت زیاتر لەوانیتر کاری دەکرد،، باوکەگیان زیاتر لەوانیتر ڕقی لێی دەبویەوە، چونکە لەتەواوی ئەم ساڵانەدا مونیرەی بەهۆی جیابونەوەی ئیرەج لەوان دەزانی.

شەقایق وتی:

- دایکە ڕێزمانم پێ دەڵێیت؟

مونیرە دەستی لەئیشەکە هەڵگرت و بەبێزارییەکەوە وتی:

- نابینی دەستم گیراوە، بڕۆ بەمەنوچەر بڵێ.

شەقایق ڕۆیشت بۆ لای مەنوچەر، بەڵام ئەو بەدڵگرانییەوە وتی:

- ئەوێ ژووری من بوو.. تۆو دایکت هاتن ژوورەکەمتان گرت.

ئەم قسەیە کاریگەری گەورەی لەسەر شەقایق دانا، لەمبارەوە شتێکی بەدایکی نەوت، بەڵام تازە تێگەیشت کەوا کەس لەم ماڵەدا لەبونی ئەوان خۆشحاڵ نییە، کینە قوڕگی گرتبوو، بەڵام نەیدەتوانی بۆ کەسی بدرکێنێت، دایکی لەمنداڵییەوە پێی وتبوو کە گلەیی هیچ کەسێک لەلای ئەویتر نەکات و هەواڵ کۆکردنەوە نەکات.

بەتێپەڕبونی کات هەموو شتێکی گۆڕی‌و پەیثاپەیتا مەنوچەر لەگەڵ هەموو شتێکدا ڕاهات کینە لەدڵ نەبوو، هەرگیز نەیدەزانی قسەکانی ئەو ڕۆژەی تاچ ئەندازەیەک کاریگەری لەسەر شەقایق بەجێهێشتووە.

هەینی بوو، هیچ کەس لەماڵ نەبوو، مونیرەو شەقایق تەنیا بوون، مونیرە نەیدەزانی بۆ نیوەڕۆ چی خواردنێک بۆ شەقایق دروست بکات، ماوەیەک بوو کە چێشتی باش‌و خۆشیان نەخواردبوو، بێجگە لەوان هەمووان لەماڵدا چێشتی باش‌و جۆراو جۆریان دەخوارد، لەگەڵ ئەوەشدا مونیرە بەمجۆرە ژیانە ڕازیدەبوو.

شەقایق خەوتبوو، مونیرە لەماڵ ڕۆیشتە دەرەوە بۆ شتکڕین، تاکاتی گەڕانەوەی لەبازاڕ شەقایق نانی خواردبوو، لەحەوشەکەدا سەرقاڵی یاریکردن بوو، چونکە ئەوی بێچارە تا کاتێک کیومەرس‌و فەرهاد لەماڵ بوونایە، نەیدەتوانی جوڵە بکات،، ئای چەند چەتون بوون. باشییەکە لەوەدابوو کە شەقایق نەدەبووە هاوڕێی ئەم دووانە.

مونیرە برنجی شۆردەوە، سەوزەکەی وردکرد، کەمێک کەوەرو کەرەوزو چەند گەڵایەکی تازەی مێوی لەرۆندا سورکردەوە، چەند ئەڵقەی تەماتەشی تێکرد، خوێ‌و زەردەچۆو دوایش برنجی بۆ زیادکرد، کەمێک نیسک-یشی تێکرد، بەکورتی شتێکی تێکەڵاوی دروستکرد، چ شتێکی لێدەرچوو، لەخوا بەزیادبێ شەقایق بەتەواوی حەزی لەچێشتەکە بوو، هیچ بیانویەکی نەگرت.

مونیره تازه قاپەکانی شوشتبوو کە لەدەرگا درا، شەقایق دەستی لەیارییەکە هەڵگرت، بۆ کردنەوەی دەرگاکەو زۆری پێنەچوو کە هـاواری خۆشی شەقایق ماڵەکەی پڕکرد، پورە مەنیجە لەگەڵ کچەکانی فەریباو فاتمەدا هاتبوو، ئەگەرچی فەریباو فاتمە منداڵی مەنیجە نەبوون بەڵام مەنیجە ئەو دوانەی لەسادقی کوڕی خۆشتر دەویست، چونکە مێردەکەی "ئەحمەد" دەرهەق بەخۆیو سادق زۆر میهرەبان بوو.

- چەند سەیرە خۆر لەکام لاوە دەرچوە کە تۆ بیرێکت لەئێمە کردوەتەوە!

مونیرە بەمەنیجەی خوشکی وت.

مەنیجە وەک هەمیشە دەم بەپێکەنینو زۆر قسە بوو. منداڵەکانیش لەسوچی حەوشەکەدا لەژێر کەپرەکەدا سەرقاڵی یاری بوون.

- باشە چی دەکەیت مەنیجە، هەواڵت نییە. بەڕاست! سادق لەکوێیە؟

هەر ئێستا لەماڵی دایکمەوە دێم، سادقیش باش بوو.

مونیرە هەستاو لەکاتێکدا بـەرەو لای مێزەکە دەڕۆیشت، وتی:

- مێردەکەت حاڵی باشە؟.. مەنیجە بەو شێوەیە سەیری دەوروبەری دەکرد وتی:

- ئەویش باشە، سڵاوی هەبوو بۆتان.

پاشان پرسی:

مونیرە دراوسێکانت دەنگیان نییە، بۆ شوێنێک ڕۆیشتون؟

مونیرە سینی-یە چاکەی خستە بەردەمیو وتی:

- بەڵێ، ڕۆیشتون بۆ میوانی، منداڵەکان بانگ بکەم بێن چابخۆن؟.. لەحەوشەکەدا هەوا ساردە!.

مەنیجە وتی:

- وازیان لێبێنە، ئەوانە چاخۆر نین»، باشە، تۆ بۆچی نەڕۆیشتیت؟

مونیرە پێکەنینێکی تاڵی کردو وتی:

- ئای خوشکە! هەر ئەوەندەی لەمماڵەدا خەریکم دەژیم ئازارە، میوانیم ناوێت.

ڕقو کینەیەکی گەورە لەکاتی وتنی ئەم ڕستەدا قورگی گرتبوو، مەنیجە ئاگاداری زنجیرەی فرمێسکی چاوانی خوشکەکەی بوو، بەئارامی وتی:

- چی بووە مونیرە؟

ئەم ڕستەیە بەس بوو بۆ ئەوەی ئاگرپرژێنی ڕقو کینەکەی بتەقێتەوە.

- چی بڵێم، خوشکە لێرە خەریکە دەمرم لەدەستی برینی زمانی خەزورو خەسوو، بێجگە لەدراوسێ بچوکەکە ئەو دوانەکەی تر پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵم نییە، خۆزگە دەمتوانی لێرە ڕابکەم، بەڵام چی بڵێم کە دەستم بەجێگەیەکەوە بەندنییە، مێردەکەم کە لەزەوی‌و ئاسماندا دیارنەماو، لەئاکامدا نەمزانی چ نەخۆشییەک چووە گیانی‌و کوشتی، خودا نەیکاتە بەشی هیچ کەسێک. ئەمەش حاڵی خۆمو شەقایق!.

مەنیجە وتی:

- بۆچی دوبارە شو ناکەیتەوە؟!.. لەدایکم بیست داخوازیکەرت ڕەتکردوەتەوە!.

مونیره وتی:

- نەخێر، چیتر توانای مێردداریم نییە، دادە گیان برام.

مونیرەو مەنیجە تا عەسرێک بەتەنیشت یەکەوە دانیشتن‌و هەریەکەیان باسی گرفتاری خۆی بۆ ئەویتریان دەکرد،، مونیرە بەتەواوی دڵی کرایەوەو، بارەکەی سووک بووبوو. کەچی مەنیجە زۆر دڵنیگەران بوو، دڵی بۆ حاڵی خوشکەکەی دەسوتا.

تەنیا بیست‌و حەوت ساڵ تەمەنی بوو، کەچی بەدەموچاوی لەژنێکی پەنجا ساڵە دەچوو.

*******

شەو کاتێک ئەحمەد هاتەوە بۆ ماڵ بەهەڵسوکەوتی مەنیجەدا زانی کەوا شتێک ڕویداوە، مەنیجەی باش دەناسی لەناخۆشترین کاتدا پێکەنین لەلێوەکانی وننەدەبو. لەوانەیە هەر لەبەرئەوەش بێت کە ئەو هەمیشە بەئومێدەوە دەگەڕایەوە ماڵەوە.. مەنیجە هەموو شتێکی بۆ ئەحمەد ڕونکردەوەو ئەحمەدی هێنایەوە بیری ئەوەی کە ئیرەج بەچ شێوەیەک یارمەتی داوە تاوەکو کارێکی دەستگیربێت، ئەوەی بەخەیاڵدا هات کەوا ئێستا کاتی دانەوەی قەرزی خۆشەویستییەکانی ئیرەجە.

عەسر بوو، باوکەگیان لەو هەوا ساردەدا لەهەیوانەکە دانیشتبوو قلیانی دەکێشا، حاجی ژن هەر چەند خولەکێک چایەکی بۆ دەبرد، کیومەرس‌و فەرهادیش وەک هەمیشە سەرقاڵی چەتونی خۆیان بوون، لەدەرگا درا، ئەعزەم بەمەبەستی کردنەوەی دەرگاکە هەستا، چەند چرکەیەکی پێنەچوو کاتێک گەڕایەوە ناو حەوشەکە، مونیرە پاڵ حەوزەکەی گسک دەدا..

باوکەگیان وتی:

- کێ بوو ئەعزەم؟.. خوشکەکەی مونیرەیە هەرچی پێی دەڵێم نایەتە ژوورەوە، دەڵێت ئیشێکی بەپەلەی بەمونیرە هەیە.

مونیرە گسکەکەی فڕێداو بەشپرزەییەوە بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت، دوای مردنی ئیرەج بەو شێوەیە بوو.. تا دەیانوت کەسێک ئیشی پێیەتی دڵی دەکەوتە خـوارەوەو دەکەوتە دڵە خورپێوە، مەنیجە وەک هەمیشە پێکەنین لەسەر لێوی بوو.

- چی بووە دادە؟.. مەنیجە پێکەنی‌و وتی:

- هەواڵی خۆشم پێیە خوشکە!

- خێر بێت؟!.. باشە وەرە ژوورەوە.

مەنیجە بەهێورییەکەوە وتی:

- نەخێر، نایەمە ژوورەوە، ڕاستییەکەی ئەحمەد دوێنێ شەو لەگەڵ کاک حەیدەری-دا لەبارەی تۆوە قسەی کرد.

مونیرە بەسەرسامییەوە وتی:

- کاک حەیدەری؟.. کێیە؟..

مەنیجە وتی:

- بەڕێوەبەری کارگەکە، ڕازیبووە ئیشی بۆ بکەیت، موچەکەی خراپ نییە، هەڵبەت تەنیا بۆ دەستپێکردن مانگی هەفتا تومەنەو، وتویەتی ئەگەر لەئیشەکەتدا ڕازی بێت دە تومەنی بۆ زیاد دەکات، دەزانم لەوانەیە کەم بێت، بەڵام خۆ لەهیچ باشترە.. مونیرە لەکاتێکدا فرمێسکی خۆشی بەچاویدا دەهاتەخوارەوە، وتی:

- خوشکە، چۆن چۆنی چاکەی تۆو کاک ئەحمەد بدەمەوە.

مەنیجە زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- لەبیرتە کاتێک لەزەبیا جیابومەوە، ئیرەج چۆن گەیشتە فریامو برایەتی لەگەڵ کردم، ئێستا کاتی قەرزدانەوە بوو.. بەڵام خەزورەکەت چی، ئایا ئەوان ڕازین؟

مونیرە هێواش وتی:

- ئەوان لەخوایان دەوێت بڕۆم بۆ کاکردن.

بەمشێوەیە مونیرە سەرقاڵی کارەکەی بوو، بەڵام دڵگرانیی بۆ شەقایق بوو کە نێرگس خەیاڵی لەو بارەوە ئاسودەکرد.

*******

"٨"

کوڕەزاکەی مامە ساڵح "حەبیبە" لەگەڵ ئەوەی کە تەمەنی تەنیا نۆ مانگ بوو، بەڵام دیاربوو کە بەتەواوی چەتونە، شەقایق زۆر بەدەوریدا دەسوڕایەوە، وەک بڵێی منداڵەکەش ئەوی ناسیبوو، دوای چەند ساتێک نامۆیی دەبووە هاوڕێی.

کیومەرسو فەرهادیش وەکو هەمیشە لەکۆڵان سەرقاڵی یاری بون، مەنوچەر سێوی دەخواردو کتێبی دەخوێندەوە.

لەهەر سوچێکی ماڵەکە دەنگە دەنگێک دەهات، لەناکاو دەنگی دراوسێکەیان "خەدیجەخان" بەرزبووە کە لەگەڵ کیومەرسو فەرهاد بوو.

- چی بووە، هەردوکتان ئەم کۆڵانەتان خستوەتە سەر سەرتان!.. بەسی کەن بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆتان، بەدەستی ئەم دوو منداڵەوە هەراسان بوین.

باوکەگیان کە خۆڕاگری بیستنی ئەم قسانەی نەبوو لەبارەی کوڕەزاکانییەوە هاواریکرد:

- چی بووە، مەگەر چی بووە، باشە کوڕ منداڵی شەیتانە، ئیترا
لەم نێوەندەدا حاجی ژن لێوی خۆی کرنجاو، وتی:
- پیاوەکە، ناشرینە بۆچی دەمە دەم لەگەڵ ژنی خەڵکی دەکەیت؟!

بەهەرحاڵ منداڵەکان هاتنەوە بۆ ماڵو باوکەگیان بۆ ئەوەی تورەیی خەدیجە خانم برەوێنێتەوە، بواریدا منداڵەکان لەحەوشەکەدا یاری بکەن، مەنوچەر تورەبوو، دەستی لەدەرس خوێندن هەڵگرتو چووە لای شەقایقو حەبیبە.

- سێو دەخۆی شەقایق؟
شەقایق کەمێک مۆنەی کردو وتی:
- ئا، بۆچی ئەوکاتە پێت نەدام، ئێستا نامەوێت.

تۆپەکە کەوتەبەر پێی شەقایق، کیومەرس زیرەکی نواندو پێش فەرهاد تۆپەکەی گرت، بەلام تۆپەکە بەتوندی بەر شوشەکە کەوتو شکاندی.. مەنوچەر بەرونی بینی کیومەرس تاوانبارەو دەستەکانی لەترسدا دەلەرزین.

ساتێک بێدەنگی باڵی بەسەر هەمووواندا کێشا، هەمووان ئەبڵەقی منداڵەکان بون.. حەبیبە بەچاوە وردبینەکانی بەئەبڵەقی سەیری هەموانی دەکرد، باوکە گەورە بەپەلە لەژوورەکەی هاتە دەرەوەو هاواریکرد:

- کێ شوشەکەی شکاند؟
تاوەکو کیومەرس ویستی دەم بەداوای لێبوردن بکاتەوە،، فەرهاد دەستبەجێ چووە پێشەوەو بەرامبەر شەقایق وتی:
- هێی شەقایق مەگەر کوێری؟.. بۆچی تۆپەکەت دا لەپەنجەرەکە.

شەقایق بەسەرسوڕمانەوە چاوی بڕییە کیومەرس‌و فەرهادو بزێوانە وتی:

- من کەی لێمدا، درۆزن!

کیومەرس هاتە پێشەوەو بەهێواشی وتی:

- توخوا ئەگەر بڵێی تۆ لێتداوە هیچت پێ ناڵێن، بەڵام من دەکوژن.

پاشان بەدەنگێکی بەرز وتی:

- من بینیم. بۆچی شوشەکەت شکاند؟

باوکەگیان بەچاوێکی تووڕەوە تەماشی ڕومەتی شەقایقی کردو بەتووڕەییەوە هاواریکرد:

- تۆ شکاندت؟!....

شەقایق سەیرێکی کیومەرس‌و فەرهادی کردو پاشان هێواش وتی:

- بمبەخشن.

باوکەگیان پێکەنینێکی تووڕەو بەرزی کردو وتی:

- زۆر ڕوداریی، کەواتە بۆچی بەکیومەرس‌و فەرهاد دەڵێی درۆزن،، ها؟.. بڕۆ ونبە.. لەبەرچاوم ونبە.

شەقایق لەمنداڵییەوە بەمشێوەیە بوو، زوو تووڕە دەبوو، کاتێک ئەم قسانەی باوکەگیانی بیست کانی ڕقوکینەکەی تەقی‌و بەرەو ژوورەکەیان ڕایکرد.

مەنوچەر سەرسام بوو کە بۆچی شەقایق ڕاستییەکەی نەوت، بەکورتی حاجی ژن شوشەکانی کۆکردەوەو

منداڵەکان ئارامبونەوە، ئەمجارە بەڕاستی بێدەنگی بووە بڕیاردەر.

ئێستا دەنگی ژنەکان بەرونتر دەبیستra، وەک ئەوەی موحەدیسە قوماشی کڕیبوو، نێرگس‌و ئەعزەم خەریکبون ڕێنماییان دەکرد کە جلوبەرگەکەی چۆن بدورێت.. فەرهادو کیومەرس بەبێدەنگی گوێیان لەقسەکانی ئەوان دەگرت، فەرهاد وتی:

- کوڕە تۆ چەند گێلی، نزیکبو لێدانێکی باش بخۆیت!.

مەنوچەر بەئارامی لەپاڵیاندا دانیشت‌و وتی:

- من خۆ بینیم کیومەرس شوشەکەی شکاند.

فەرهاد سەیرێکی مۆنی ئەوی کرد:

- پەیوەندی بەتۆوە چییە ئەی فیتنە، ئینجا شەقایق خۆی وتی کەوا شوشەکەی شکاندوە!.

مەنوچەر لەکاتێکدا هەڵدەستا وتی:

- ئەگەر کیومەرس نەدەپاڕایەوە خۆی دەبوایە لێدانەکەی بخواردایە.

کیومەرس وتی:

- ئێستا مەگەر شەقایق لێی دراوە؟

دەرگاکە کرایەوەو مونیرە هاتەژوورەوە، وەک هەموو ڕۆژێک دوای سلاوو هەواڵپرسین بەرەو ژوورەکەی خۆیان ڕۆیشت، بەلام دەنگی باوکەگیان ئەوی لەسەر پلیکانەکە وەستاند، مونیرە لەژێر لێوەوە وتی:

- قەمەری کوڕی هاشم هاوار، ئەمڕۆ چ شەڕێکە دەیەوێت هەڵی بگیرسێنێت!.

- بەڵێ باوکەگیان.

.. خەلیل بەدەموچاوێکی سورەوە بوو، بەئاوازێکی توڕەوە:

- بەم کچە خۆتێهەڵقورتێنەت بڵی بەئەدەب بێت، ڕویشتوەتە ناو یارییەکەی کیومەرس‌و فەرهادو شوشەکەی شکاندوە، تازە بەتازە بەمنداڵەکانیش دەڵێت درۆزن، مەگەر من لەسەر گەنجینەی قارون دانیشتوم کە هەر پارەی شوشە بدەم!.

مونیرە خۆی بەتەواوی هیلاکبو، بەبیستنی ئەم قسانەش توڕە بوو،لەگەڵ ئەوەشدا خۆی گرت‌و وتی:

- شەقایق شوشەکەی شکاندوە؟

- بەڵێ، ئەو کچە گرینۆکە کە پێی دەڵێی سەرو چاوت برۆیە دەست بەگریان دەکات، ئەگەر من لەجێی تۆ بومایە پەروەردەم دەکرد کە ببێتە مرۆڤێکی کامڵ.

ئاکام بۆڵەبۆڵی باوکەگیان کاری خۆی کردو مونیرە بەتورەییەوە چووە ژوورەکەوە، عەباکەی خستە لایەکەوەو قۆڵەکانی هەڵکردو بەدەنگێک کەتوڕەیی تێیدا شەپۆلی دەدا، وتی:

- تۆ شوشەکەت شکاند؟

شەقایق ئارام ئارام لەسوچی ژوورەکەوە هەستاو وتی:

بەڵێ، بەڵام خۆ بەئەنقەست لێم نەدا!.

مونیرە هاواری کرد:

- تۆ هەڵەت کرد، تۆ بێجێت کردو پاشان تاوەکو توانی دایە بەر مست‌و پێ لەقە.

دەنگی هاوارو قیژەی شەقایق هەمووانی لەشوێنی خۆیاندا وەستاندبوو، باوکەگیان نەبێت کە پێدەکەنی، هەموو وەڕەس بـون، کەس نەیدەتوانی خۆی لەمەسەلەکە هەڵقورتێنی.. بەهاتنەدەرەوەی مونیرە لەژوورەکەی شەقایق بێدەنگبوو،

مونیرە بەدەنگێکی لەرزۆک هاواریکرد:

- لێمدا، باوکەگیان دڵت فێنک بووە؟

باوکەگیان لەنێو باوەڕنەکردنی ئەوانیتردا پێکەنیو وتی:

- ئەها.. کەواتە لەبەر دڵی من لێتدا، نەک بۆ پەروەردەکردنی، ئەم لێدانە سودی نییە.

مونیرە کە لەبەردەم باوکەگیاندا وەستابوو، بەدەنگێکی بەرز شەقایقی بانگکرد، پاش ماوەیەک شەقایق بەدەموچاوێکی خوێناوی‌و قژێکی تێکهەڵسکاوە لەدەرگاکەوە دەرکەوت.. مونیرە هاواریکرد:

- وەرە بۆ ئێرە بزانم.

شەقایق بەگریانەوە وتی:

- دا.. دایکە بمبەخشە، ئیتر ..

جارێکیتر هاواریکرد:

- وتم وەرە بۆ ئێرە..

شەقایق بەچەند هەنگاوێکی لەرزۆک لەقادرمەکە هاتەخوارەوەو خۆی لەپشت نێرگس-ەوە شاردەوە..

مونیرە تورەبوو، بەرەو ڕوی هێرشی بردو بەدەست قژی گرت‌و شەقایق لەکاتێکدا دەیقیژاندو داوای لێبوردنی دەکرد بردەیە بەردەم باوکەگیان.

مونیرە بەهێواشی وتی:

- باشە، کەواتە خۆت لێی بدە.

پاشان بەرەو ژوورەکەی خۆیان ڕۆیشت‌و بەتوندی دەرگاکەی پێوەدا، بەرۆیشتنی باوکەگیان هەمووان بڵاوبونەوەو بەبێ بایەخدان بەشەقایق ڕۆیشتنەوە بۆ ژوورەکانی خۆیان،

تەنیا مەنوچەر نەبێت کە لەلایەوە وەستابوو، کاتێک هەمووان ڕۆیشتن، دەستی گرتو وتی:

- هەستە بڕۆین بۆ ژوورەکەی ئێمە!

شەقایق بەئاوازێکی منالانەوە وتی:

- نایەم.. دایکم لێم دەدات.

بەکورتی، قسەکانی مەنوچەر سودی نەبوو، شەقایق بەتەنیا لەپشت دەرگاکەوە دانیشت.. شەو داهات.. دونیا وردە وردە ساردی کرد.. ڕوناکی گڵۆپەکان تاکە ڕوناکییەک بوو کە لەحەوشەکەی دەدا.. لەناو ژوورەکەی ئیسماعیلو ساڵح دەنگی پێکەنین دەهات.. ژوورەکەی پەروێز وەک ژوورەکەی مونیرە بێدەنگبوو.. دەرگا کرایەوەو پەروێز هاتە حەوشەکەوە.. سەرەتا لەبینینی شەقایق سەری سوڕما، هاتو لەبەردەمیدا دانیشت.

- ئا.. شەقایق.. مامە گیان.

شەقایق سەری بەرزکردەوە، پەروێز بەهەمان سەرسامی وتی:

- شەقایق.. مامە بۆچی لێرە دانیشتویی؟.. دایکت لەماڵ نییە؟!

مونیرە لەژوورەکە هاتە دەرەوە شەقایق وەک تاوانبارێک کە دەیویست لەزیندان ڕزگاری بێت لەجێگەی خۆی بەرزبووە، مونیرە پێکەنینێکی ساردی خستە سەر لێویو وتی:

- سلاو کاک پەروێز.

پەروێز پرسیارەکەی لەمونیرەش دوبارەکردەوە، مونیرە لەکاتێکدا بەمۆنییەکەوە تەماشای شەقایقی دەکردو وتی:

- بێ ئەدەبی کردوە. لەبەرئەوە پشت دەرگاکە جێگەیەتی!

قسەکانی پەروێز کاریگەری نەبوو، شەقایق هەر بەو شێوەیە

لەپشت دەرگاکەوە دانیشتبوو.. وردە وردە لەگەڵ کوژانەوەی گڵۆپەکان ترس ڕویکردە شەقایق، تەنیا گڵۆپی ژوورەکەی خۆیان داگیرسابوو.. مونیرە دەیزانی کە شەقایق بەچ ئەندازەیەک لەتاریکی دەترسێت.. ئەویش تورە بوو. دەرگاکەی کردەوەو بەتانییەکی پیاداو زۆر زوو دەرگاکەی داخست..

دەنگی کزی گریانی شەقایق دڵی مونیرەی هێنایە ئێش، نەیدەزانی کە ئایا شەقایق بەراستی تاوانباربوو، یاخود نە؟.. بەڵام دڵی بەحاڵی ئەو دەسوتا.. یەکەمجاربوو کە دەستی بەرەو ڕوی بەرزکردبوەوە، بەڵام ئەوەندەی باشبوو شەقایق کچێکی بێئەدەب نەبوو.. بەوتەی پێشینان:

شەقایق دەمی بەخواردنێک سووتابوو کە ئەو نەیخواردبوو.. لەو بابەتەوە لێدانێکی باشی خواردبو، دڵی بەتەواوی دەسوتا.. تاچەند ڕۆژێک مونیرە لەگەڵ شەقایقدا دڵڕەق بوو، ئەم مەسەلەیە ئازاری دەدا.

"٩"

بارینی بەفر لەلای شەقایق مانای دەستپێکردنی زستان بوو، بەڵام هێشتا سێ هەفتە لەپایز نەرۆیشتبوو کە بەفرێکی زۆر باری.. بەیانی کاتێک مونیرە دەرگای ژوورەکەی کردەوە تا بڕواتە سەر کارەکەی، چاوە خەواڵوەکانی شەقایق حەوشەکەی بینی،، دەوروبەری حەوزەکە سپی سپی بوو وەک ئەوەی لەدەوروبەری حەوزەکە پەمویان ڕشتبێت، شیرینی خەوی بەرەبەیان شەقایقی بەجێگەکەیەوە بەستەوەو، بڕیاریدا لەژێر بەتانییەکەی نەیەتەدەرەوە.

ئـەو نـەيـدەزانـی چـەنـد خـەوتـوە، كـە بـەدەنـگـی پێكەنینی كيومەرسو فەرهاد لەخەو هەستا، باش نەيدەبيست كەچی دەڵێن، لەوانەیە دەنگی كيومەرس بوو، دەيوت:

- ئـاخ گـيـانـەكـەم مـن خـۆ يـەک وشــەم لـەوانـەی مێژوو نەخوێندوە.

پاشان دەنگی فەرهاد هات:

- من بۆ ناڵێی دارشتنەكەمم نەنوسییوە.

شەقايق لەژێر بەتانییەكەی هاتەدەرەوە، لەپشت شوشەكەوە دەیڕوانییە دەرەوەو بەپشت دەستی هەڵمی شوشەكەی دەسڕیو، لەبەر خۆشحاڵی زۆری خێرا پاڵتۆكەی لەبەركردو لەژوورەكە ڕۆیشتەدەرەوە.

- دێیت بۆ یاری..!.

دوای بەسەرهاتی شكانی شوشەكە، شەقايق پەيوەندی لەگەڵ كيومەرسو فەرهاد باشنەبوو، بەمبۆنەوە بەبێ گرنگی پێدان بەكيومەرسو فەرهاد بەرەو لای دەستشۆرەكە ڕۆیشت، كاتێک بۆری ئاوە گەرمەكەی كردەوەو گەرمی لەئاوەكە بەرزبووە.. تەواوی گيانی لەزۆری سەرمادا دەلەرزی، بەڵام دەستەكانی لەژێر بـۆری ئـاوەكـەدا گـەرم بـوو، كاتێک لەدەستشۆرەكە هاتەدەرەوە مەنوچەری بینیو ئەویش تازە لەخەو هەستابوو.. شەقايق دەستی خستە ژێر سكیو بەسەرسامی وتی:

- بۆچی نەرۆیشتویت بۆ خوێندنگا؟!

مونيرە لەكاتێكدا چاوەكانی دەسڕی، وتی:

- ئەمڕۆ قوتابخانەكان پشويانە!

پاشان بەرەو دەستشۆرەکە ڕۆیشت، تۆپەڵێک بەفر لەسەر کەپرەکە کەوتەخوارەوە، شەقایق خێرا چووە ژوورەوە.. ژوورەکە گەرمبوو.. دەستی لەسەر گەرمی زۆپاکە دانا.. چای تێکردو نانی بەیانی خوارد.. دەنگی ڕادیۆ دەهات لەژوورەکەی باوکەگیانەوە،، دەنگی بێژەرەکە کە بەتێروتەسەلی باسی لەسەرماکە دەکرد..

دەرگاکە کرایەوە، مەنوچەر بوو.

- دێی شێرە بەفرینە دروستبکەین.

شەقایق پیاڵە چاکەی تا کۆتایی نۆشیو وتی:

- بواربدە جێگەکان کۆبکەمەوە ئینجا دێم!

شێرەبەفرینەیەکی جوان دەرچوبوو، لەبەرئەوەی کە گێزەریان نەبوو، پەتاتەیان لەجێگەی لوتی شێرەبەفرینەکە دانا.

دوای تەواوبونی یارییەکەیان، مەنوچەر وتی:

- من سەرمامە بابڕۆین بۆلای دایکم.

لەو کاتەوەی دونیا ساردی کردبو حاجی ژنو ئامۆژنەکان لەژێر زەمینەکەدا کە لەراستیدا چێشتخانە بوو کۆدەبونەوە.. زۆپایەکی عەلائەدین لەناوەڕاستدا بوو کە لەدەوری دادەنیشتنو دەمەتەقێیان دەکرد، حاجی ژن دەیوت:

- هەینی ئەم مانگە دەمەوێت شۆربا دروست بکەم.

ئینجا بەپەروینی وت:

- بەسەمانەو موحەدیسە بڵێ بێن لەدەوری یەکبین.

پاشان ڕویکردە ئەعزەمو وتی:

تۆش بەفەلامەرزو ژنەکەی بڵێ بێن.

نێرگس پرسی:

- دایکە! پێداویستی شۆرباکە ئامادەیە؟

حاجی ژن:

- بەڵێ دایە گیان! جگە لەسەوزە کە ڕۆژی پێنج شەمە کوڕەکان دەیهێنن، هەموو شتێکم ئامادەیە.

نیوەڕۆی هەینی بەیارمەتی بوکەکانو کوڕەزاکان، حاجی ژن شۆرباکەی دروستکرد، چ بۆنێک بەرزبووە.. بۆنی سیری کولاو.. بۆنی ئەو دارەی کە لەژێر مەنجەڵەکەدا دەسوتاو، کاتێک ماڵەکە قەرەباڵغ دەبوو ئاهەنگی کیومەرسو فەرهاد بوو. بەئارەزوی خۆیان ئاگریان دەکردەوە.

بۆنی خۆشی شۆربا هەموو ماڵەکەی گرتبوەوە.. شەقایق دڵی دەچووە سەری، بەلام بەیانی مونیرە پێش لەماڵ دەرچونی ئاگاداریی کردبوەوە کە مافی چونە دەرەوەی نییە لەژوورەکە.. مونیرە باش دەیزانی کەس چاوی بینینی ئەو دوانەی نییە. بەمبۆنەوە بڕیاریدا کەمتر بکەوێتە بەرچاو.

خۆی لەسەر کاربوو.. بەدبەختە شەقایق لەبەیانییەوە بەتەنیا لەژوورەکەدا دادەنیشت تا ئەو کاتەی ئێوارە مونیرە لەسەرکار دەهاتەوە، هەندێکجار لەدەنگەدەنگو پێکەنینی منداڵەکان لەپشتی پەنجەرەی ژوورەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد.. ئەویش ئارەزوی دەکرد وەک مەنوچەرو کیومەرسو فەرهاد لەدەوری ئاگرەکە بسوڕێتەوەو یاریبکات.

خوان داخرا، ژنەکەی مامە ساڵح سینی سینی چێشتی بۆ سەر خوانەکە دەبردو هەمووان لەدەوری سفرەکە کۆبونەوە، پەرویز وتی:

- ئا، ئەوە براژنو شەقایق لەکوێن؟

حاجی ژن بەلادەمێکەوە:

مونیرە لەسەرکارە.

پەروێز:

- خۆ شەقایق لەماڵە.

.. پاشان بەمەنوچەری وت:

- برۆ بانگی بکە، پێی بڵێ بێت.

پێش ئەوەی مەنوچەر لەشوێنەکەی هەستێت، کیومەرس وتی:

- مامە ئێمە بانگمانکرد، نەهات.

پەروێز وتی:

لەوانەیە شەرمی کردبێت.. خانم هەستە خۆت بانگی بکە.

نێرگس دوو دڵبوو کەچی بکات. لەئاکامدا ڕۆیشتو بەزۆر شەقایقی هێنا.

شەقایق سەیرێکی دەموچاوی حاجی ژنو باوکەگیانی کرد.. کەسیان حەزیان بەهاتنی ئەو نەدەکرد، تورەیی دەخواردەوەو، بەهێواشی وتی:

- من چێشتم خواردوە،، مامە پەروێز!

پەروێز وتی:

- چیت خواردوە؟

- شفتەم خواردوە.

پەروێز بەپێکەنینەوە وتی:

- شفتەت خواردوە، خۆ شۆربات نەخواردوە؟!

- سڵاو..

هەمووان ڕویان لەشوێنی هاتنی دەنگەکە کرد.. دەنگی

مونيره بوو.. بزەيەكى كردو دواى هەواڵپرسين بەشەقايقى وت:

- هەستە بڕۆين بۆ ژوورەكەى خۆمان.

پەروێز وتى:

- نەخێر، براژن.. دانيشتوە لەپاڵ منداو دەيەوێت شۆربا بخوات.. تۆ بۆچى دانانيشيت.

مونيرە وتى.

- نەخێر! نانى نيوەڕۆم خواردوە، تۆ فەرموو.. شەقايق هەستە.

پەروێز وتى:

- شەرم مەكە براژن، دانيشە لەدەورى يەكتر شۆربا بخۆين.

مونيرە جارێكيتر نارەزايى دەربڕيى، هاوكات باوكەگيان وتى:

- پەروێز، بهێڵە مونيرە ئاسودە بێت،، خۆتان سەرقاڵبن.

مونيرە دەستى شەقايقى گرتو لەژوورەكە ڕۆيشتنە دەرەوە.. پەروێز بەتوڕەيى تەماشاى باوكى كرد، بەڵام هيچ قسەى نەكرد.. لەكاتى تێپەڕبون لەحەوشەكە، مونيرە بەهێواشى وتى:

- مەگەر نەموت لەژوورەكە مەڕۆرە دەرەوە؟

شەقايق وتى:

- من نەدەهاتم، ئامۆژن بەزۆر بردمى.

مونيرە زەردەخەنەيەكى بەروى بێتاوانى كچەكەيدا كردو وتى:

- هەر ئێستا دەڕۆين بۆ ماڵ نەنەگيان، لەوێ شۆربا دەخۆين.

نەنەگيان تەنيا نەبوو، مەنيجەو كچەكانى لەگەڵ سادق

لەوێ بون.. منداڵەکان سەرقاڵی یاری بون.. ئەوان پێداویستی شۆربایان ئامادەکردو لەدەوری یەکتر شۆربایان خوارد.. شۆرباکە خۆشبوو، کەچی شەقایق دڵی هەر لەلای شۆرباکەی ماڵی خۆیان بوو.

- نێرگس، دەزانی بەخۆم دەوت کە تاوانی مونیرەیە کە هەر قسەی سەرکوتکەری پێدەڵێن،، ئەو بەدبەختە تاوانی نییە، هەرچی هەیە، دوکەڵ لەباوکەگیانەوە بەرزدەبێتەوە..

نێرگس دەستی لەدوورینی جلەکە هەڵگرتو وتی:

- بەڵێ، بەڕاستی ئەم باوکەگیانە دڵبەردە!.. ئێستا دەڵێی مونیرە واو وایە: ئەی شەقایق چی؟!.. خۆ ئەو منداڵە، باشە دەیەوێت وەک کیومەرس و فەرهادو مەنوچەر یارییکات. چەتونی بکات، لەترسی باوکتدا ناوێرێت بجوڵێتەوە.. مەنوچەر ئەو جارە دەیوت، بینیویەتی کیومەرس شوشەکەی شکاندوە، کەچی شەقایقی بێچارە لێدانەکەی خوارد، پەروێز وتی:

- ئێستا ئەوە ڕاببورد.. شەقایق منداڵە، دەبوایە لەو شۆربای بخواردایە، دیاربوو لەوانەیە حەزی لەو شۆربا بوبێت!

"١٠"

نزیکی جەژن بوو، هێشتا بەفر هەر دەباری، لەبەر سەرما هەر کەس زۆری پێ نەهاتایە تەنانەت بۆ دەستشۆریش لەژوور دەرنەدەچو. بەوتەی نەنەگیان:

لەم سەرمادا ئێسکی مرۆڤ دەپترووکێت.

کەچی بەم بارەشەوە مونیرە پێچەوانەی دراوسێکانی کە بیانویەکی باشیان دروستکردبو سەرقاڵی ماڵپاککردنەوە بوو..

مونیره ئەوەندە بەو ژووره بچوکەدا دەگەیشت کە هەمیشە ڕێکو پێک بوو.. نێرگس کەمو زۆر پاکوپوختە بوو.. بەڵام پەروینو ئەعزەم بەتەواوی تەمەڵاو شپرزە بوون.

هێشتا پەروین ڕوخسارێکی باشتری هەبوو، کەچی ئەعزەم هەر کەڵکی ماڵداری نەبوو، کوڕەکانیشی خراپتر، هەمیشە پیسو ناڕێک بون.. مەگەر ساڵ، یان مانگێک جارێک بوکەکەی "ئازەر" بهاتبایە بۆماڵیان ئەوکات ماڵەکەی ڕەنگێکی پاکتری دەگرتە خۆی، بەدبەختی لەوەدایە ئەمساڵ ئازەر بەهۆی منداڵەوە بواری نەبوو بێتە یارمەتی ئەعزەم.

لەکۆتاییدا مونیرە یارمەتیدا تا ئەویش ماڵەکەی پاکبکاتەوە، تەنیا خودا دەزانێت کەچەند خۆڵاو خاشاک لەژوورەکانی ئەعزەم هاتنەدەرەوە، کاتێک مونیرە دەستپێشخەری کرد، نێرگس چوو بۆ یارمەتیو بەمشێوەیە ئەعزەم خەیاڵی ئاسوودەبوو.

مونیرە بەو موچە کەمەی کە هەیبوو، نەیدەتوانی وەک ئەوانیتر جلی تازە لەبەربکاتو خواردنی باش بخوات، بەڵام توانی هەندێک شەوچەرەو میوەو شیرینی بکڕێتو بۆدی- یەکی بۆ شەقایق کڕی. ئەو کە پارەیەکی بەدەستەوە نەمابوو تازە بەتازە دەیویست جەژنانە بۆ دایکی بکڕێت، بەڵام بەڕاستی چیتر پارەیەک نەمابوو. دایکی ڕاستی دەکرد:

- یەکێک سەرەتای کردنەوەی دەرگای مەکتەب، یەکێکیتر هاتنی جەژن پارەی دەغیلە هیچ بەیەکەوە ناخوێنێتەوە.

تەنیا چەند خولەکێکی مابوو بۆ گۆڕانی ساڵ کاتێک دەنگی دەرگاکە بەرزبووە. مەنوچەر دەرگاکەی کردەوە،، مونیرە باوەڕی نەدەکرد.. ئەوە مەنیجەیە هاتووە لەگەڵ سادقو کاک

ئەحمەد، بەپوختی دوای سلاوو هەواڵپرسین شەقایق پرسی:

- پورێ، ئەرێ فەریباو فاتمەت بۆچی نەهێناوە؟

مەنیجە لەوەدابوو ڕونیبکاتەوە کەوا فەریبا سەرمای بوەو فاتمە چاودێری دەکات، کاتێک کتوپڕ بێژەری ئێزگەکە گۆڕرانی ساڵی ڕاگەیاند، مەنیجە بەقاقای پێکەنینەوە وتی:

- لەبڕیارەکەوە دیارە، ئەمساڵ من تا کۆتایی ساڵ دەبێت وەڵام بدەمەوە.

دوا بەدوای گۆڕانی ساڵ کاک ئەحمەد جەژنانەی بەسادقو شەقایق داو خۆی لەبەرئەوەی کاری هەبوو زوتر ڕۆیشت..

سادقو شەقایق چوونە ناو حەوشەکەو سەرقاڵی یاریبوون.

مەنوچەر هات، سادق زوتر لەشەقایق ئاگاداری ئەوەبوو کە مەنوچەر بەماتی سەیری یارییەکەی ئەوانی دەکرد، بەپێکەنینەوە:

- دێیت بۆ یاری؟

مەنوچەر قسەیەکی نەکرد، بەڵام لەپلەکانەکان هاتەخوارەوە.

- ناوم سادقە، ئەی تۆ چی؟

- مەنوچەر

سادق پێکەنینێکی چەتونانەی کردو وتی:

- ناوەکەشت وەک خۆت تازەیە!

پاشان پێکەنی. کیومەرسو فەرهاد لەکاتێکدا سێویان دەخوارد هاتنە حەوشەکەوە بەجلە تازەکانەوە کە لەبەریانکردبو بەتەواوی گۆڕابون، شەقایق بەمۆنییەکەوە تەماشایکردنو وتی:

- سادق ئیشت بەمانەوە نەبێت، ئەمانە زۆر خراپن!.

کیومەرسو فەرهاد کەمێک بەدەوروبەریاندا سوڕانەوەو

لەبەرئەوەی تێگەشتن کە کەس بایەخیان بۆ دانانێت، چونەوە بۆ ژوورەکەی خۆیان.. زۆری نەبرد سادقو مەنوچەر لەیاری گوڵ یاخود فت هیلاک بون. سادق دەستی بەگیرفانیدا کردو دە - بیست هەڵماتی دەرهێنا.

- بڕۆین هەڵماتێن بکەین؟

مەنوچەر وتی:

- من نازانم.

سادق وتی: باشە بابڕۆین تۆپتۆپێن بکەین!.

مەنوچەر تۆپتۆپێنیشی نەدەزانی، سادق بەسەرسوڕمانەوە:

- پێم ناڵێی چ یارییەک دەزانی؟.

شەقایق بەپێکەنینەوە وتی:

- تەنیا کتێب دەخوێنێتەوە.

مەنوچەر بەتوڕەییەوە:

- ئەی خۆت چی.. تەنیا دەزانیت بگریت !

سادق وتی:

- هێی مەنوچەر ڕودار مەبە، ها..!

مەنوچەر کە کوڕێکی بێڕەنگو ئارام بوو. کاتێک تێگەیشت کەوا سادقو شەقایق لەدژی ئەون، هەستاو چوو

بۆ ژوورەکەی خۆیان.

بەکورتی ئەو ڕۆژە خۆشەش تەواوبو.. پورە مەنیجەش ڕۆیشتەوە.

ڕۆژەکانی جەژن بەبینینو سەردان ڕادەبوردنو زیاتر شەوان دانیشتوانی ماڵەکە دەرۆشتن بۆمیوانی، بڕیاربوو مونیرەو شەقایق ڕۆژی سیانزدەی بەدەر لەگەڵ نەنەگیانو

پورە مەنیجە بەسەربەرن.

شەقایق بۆ هاتنی ئەو ڕۆژە چرکەژمێری دەکرد،، ئەوانیتریش بۆ ڕۆژی سیانزەیەمی جەژن زۆر بەرنامەیان هەبوو، ئەوانیش بڕیاربوو بڕۆن بۆ شوێنێک.. لەئاکامدا شەوی سیانزدەیەم هات، شەو مونیرە پلاوی سەوزەو کوکوی دروستکرد بەو ئومێدەی کە سبەینێ ڕۆژێکی خۆش ڕابوێرێت، چوەناو جێگەوە.. دونیا زۆر سارد بوو.. سەرما وەک سۆزی زستان بوو.. شەقایق تا بەیان چاوی لەسەرچاو نەنا.

ڕۆژ بووە، مونیرەو شەقایق بەبینینی حەوشەکە وشکبون.. بەفرێکی زۆر بارییبوو، وەک ئەوەی چلەی زستان بێت. شەقایق بەسەرسامییەوە:

- دایکە مەگەر لەبەهاریشدا بەفر دەبارێت؟

بەڕاستی شتێکی وەک ئەمە هەرگیز لەوەو پێش ڕوینەدابوو، هەمووان بەتەواوی غەمباربون، هیچ کەس بەبینینی ئەو بەفرە ناوەختە دڵخۆش نەبوو،، هەمووان غەمبارو بێزار سەریان بردەوە ژێر لێفەکانیان، مونیرە نەبێت ئەو بەڵێنەی بەشەقایقی دابوو بردییەسەر.. بەناو ئەو هەموو بەفرەدا بەمەنجەڵی دەستیانەوە ڕویانکردە ماڵی نەنەگیان، مەگەر تەنیا خوا بزانێت لەو سەرمادا چ کۆبونەوەیەکی گەرم-یان بۆ دروستبوو، مەنیجەش هاتبوو بەهەر شێوەیەک بوو ڕۆژەکەیان بەخۆشی ڕۆشتەسەر.

## بەشی دووەم
## "II"

چوار ساڵ ڕابورد..

مـاوەیـەک پێش ئێستا بـاوکـەگـیـان وتـی کـە دەیـەوێـت لەدەوروبەری ناوچەی گەرمەسێر زەوییەک بۆ خۆی بکڕێتو خانویەک دروستبکات، کوڕەکان بەتایبەت ساڵحو ئیسماعیل بەتەواوی پێشوازییان لەپێشنیارەکەی باوکەگیان کرد، بەڵام پەروێز ئەوەندە حەزی لێی نەبوو. پەروێز دەیوت:

- بڕۆین بۆ کەرەج، دەماوەندو لەوێ بەدوای زەویدا بگەڕێین.

باوکەگیان سوربوو لەسەر پێشنیازەکەی پێداگریی کرد:

- گەرمەسێر زایەنگامەو تەواوی بنەماڵەکەم لەوێن..

بەکورتی.. ڕۆژی هەینی، بەیانییەکەی هـەمـووان بـەرەو گەرمەسێر کەوتنەڕێ، هەمووان بێجگە لەفەرهادو کیومەرسو مەنوچەر، هەرچەندە مەنوچەر حەزیدەکرد کە بڕوات بەڵام مانگی خورداد، وەرزی تاقیکردنەوەکان بوو.. مەنوچەر تەمەنی هـەژدە ساڵ بوو ئەمساڵ بڕوانامەی دیبلۆمی وەردەگـرت، شەقایقو مونیرە وەک هەمیشە کە ماڵەکەیان بەچۆڵی دەبینی، دەستیانکرد بەرێکوپێککردنو پاککردنەوەی ژوورەکـەیـان، چونکە ئەو کاتەی حاجی ژن لەماڵ بوایە، مونیرە نەیدەوێرا تەنانەت جلیش بشوات، چی بەپەردەو لێفەکان بکات!

فەرهادو کیومەرس وەک هەمیشە لەدەرەوە سەرقاڵبون، مەنوچەر لەژوورەکەی خۆیان بوو، دیارنەبوو کە چی دەکات؟!

نزیک نیوەڕۆ دەرگاکە کرایەوە، مونیرە لەلێواری حەوزەکە دانیشتبوو، خەریکبوو دەستنوێژی دەگرت، لەو کاتەدا بەبینینی فەرهادو کیومەرس هاواری گەیشتە ئاسمان.. کیومەرس بەدەموچاوێکی بریندارو خوێناوییەوە خۆیکرد بەحەوشەدا، ئینجا فەرهاد بەدەم هەناسەبڕکێوە هاتەوە وەک ئەوەی خێو دەستی لێوەشاندبن.

جلەکانی دڕابوو.. بەقۆپچە کراوەکانی قەمیسەکەیەوە دیاربوو کە لەگەڵ یەکێک شەڕیکردوە.. شەقایقو مەنوچەر هاتنە حەوشەکەوە، مەنوچەر کیومەرسی بەرزکردەوەو لەسەر پلەکانەکان داینا، شەقایق پەرداخێک ئاوی دایەدەست فەرهاد.

مونیرە بەترسەوە پرسی:

– چی بووە؟.. بۆچی دەموچاوتان بریندار بووە، شەڕتان کردووە؟

فەرهاد بەنیوە تەماشایەکی ڕقاوی دەموچاوی کیومەرسی کردو بەتوڕەییەوە:

– هەمووی تاوانی ئەوەیە!.

کیومەرس خۆی لەنێوان دەستەکانی مەنوچەر دەربازکردو بەهاوارەوە:

– سەد جار پێموتی تاوانی من نەبوو!.. ئەو پیاوەی شەڕەکەی دەستپێکرد، تاوانی ئەو بوو.

فەرهاد هاواریکرد:

– ئەو هەڵەی کرد لەگەڵ تۆدا..

خەریکبوو دوبارە شەڕ دەست پێبکاتەوە، مونیرە تاکۆتایی نەیزانی شەڕەکە لەسەر چی بووە.

مەنوچەر کیومەرسی کێشایە لاوەو مونیرەش فەرهاد..

شەقایق لەچێشتخانەکە دەستەسڕێکی پاکو کەمێک ئاوی هێناو مونیرەش دەموچاوی کیومەرس کە بریندار بوو سڕیو، بەدەستەسڕ بەستی،، هەمووان بێدەنگ بـون.. پاش کەمێک مونیرە بێدەنگییەکەی شکاندو وتی:

– باشە من هەر نەمزانی شەڕەکەتان لەسەر چی بوو؟

فەرهاد زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

– لەسەر فیتنەیی کیومـەرس!.. ئێستا ئامـۆژن شـەڕەکە لەبیربکە، بۆ نیوەڕۆ چیت هەیە؟

مونیرە لەکاتی هەستاندا بەشەقایقی وت:

– تا نوێژ دەکەم، خواردنەکە بهێنە.

پاشان ڕویکردە مەنوچەرو وتی:

– مەنوچەر گیان تۆش وەرە لەگەڵ ئێمە چێشت بخۆ.

هـەوای گەرمی مانگی خـورداد هەواڵی هاوینێکی گەرمی دەهێنا.. شەقایق ڕۆیشت بۆ چێشتخانەکە، مونیرە پڵاوی لۆبیای دروستکردبو، شەقایق سەوزەی هێناو تا مونیرە نوێژەکەی کرد زەڵاتەشی دروستکردو مەنوچەر چوو لەماڵی خۆیان قاپێکی گەورە ماستی هێنا..

مەنوچەر دوور لەقسەو چەتونییەکانی کیومەرسو فەرهاد سەرقاڵی چێشت خـواردن بوو،، مونیرەو شەقایق بەتەواوی بەئیشی ئەو دوانـە پێدەکەنین.. کاتێک چێشتەکە تەواوبوو، مەنوچەر یارمەتی شەقایقی دا تاوەکو خوانەکەی کۆکردەوەو،

مونیره ڕۆیشت بۆ چێشتخانەکە بۆ هێنانی میوەو چا..

کیومەرس لەژێر لێوە:

– ئەم مەنوچەرە هەڵسوکەوتەکانی هەر وەک هەڵسوکەوتی کچ وایە.

فەرهاد بەپێکەنینەوە:

– باشتروایە لەجیاتی مەنوچەر بەلەیلا بانگی بکەین!

کیومەرس پێکەنینێکی ماناداری کردو بەهێواشی وتی:

– واباشترە بانگی بکەین لەیلی نەک لەیلا.

فەرهاد لەمەبەستەکەی کیومەرس تێنەگەیشت، بەڵام کاتێک کە شەقایقی لەلای مەنوچەر بینی لەمەبەستەکەی گەیشت.

"١٣"

ئەو ڕۆژگارە وەک ئێستا کچ بۆی نەبوو بەئازادی بخوێنێت، لەو ڕۆژگارەدا کەمتر ڕویدەدا کچ مۆڵەتی پلاندانانی هەبێت.

شەقایق یەکێک بوو لەو کچانەی لەدوای پۆلی پێنجەمەوە ناچارکرابوو دەست لەخوێندن‌و قوتابخانە هەڵگرێت، شەقایق وەک کچە مامەکانی موحەدیسەو ئاسیەو سەمانە حەزی دوبارەکانی ماڵ نەبوو، ئەمانە ئەوی لەژیان ڕازینەدەکرد، هەر لەبەر ئەمە بوو مەنوچەر ڕازیبوو لەماڵ وانەی پێبڵێتەوە.

ئەم بابەتە بووە هۆی خۆشحاڵی شەقایق‌و بەمشێوەیە بڕیاریدا گشت ڕۆژێک کاتژمێر پێنجی عەسر بڕوات بۆ ژوورەکەی مەنوچەر تاوەکو لەگەڵ یەکدا بخوێنن، مەنوچەر کوڕێکی ڕێکوپێک بوو.. هێشتا کتێبەکانی ساڵی شەشەمی مابوو، یەکەم ڕۆژ مەنوچەر نەیدەزانی کە شەقایق دوای چوار ساڵ

دوری لەوانەو کتێب شتێکی لەبیرمابێت، شەقایق گەیشتوەتە تەمەنی پانزدە ساڵی، مەنوچەر پێچەوانەی بیرکردنەوەی لەشەقایقی بیست کە ئەو لەماوەی ئەم چوار ساڵەدا بێکار نەبووەو بەڕۆشتنەوە بەسەر کتێبەکانیدا، زانیارییەکی گشتی باشی پەیداکردوە، زانیاریگەلێک کە یارمەتی پێشکەوتنی بەدات.

عەسر وەک هەموو ڕۆژانی ڕابردوو شەقایق ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی مەنوچەر، مەنوچەر هەمیشە پێش هاتنی شەقایق تەماشای ئەو وانەی دەکرد کە بڕیاربوو ئەو ڕۆژە بیخوێنن.. ئەو ڕۆژە بڕیاربوو بابەتی جوگرافیا لەشەقایق بپرسێتەوە،، شەقایق پێچەوانەی ڕۆژانـی پێشوو لەئامادەبونی پۆلەکەی مەنوچەر دواکەوت.. بەجۆرێک مەنوچەر دوچاری سەرسوڕمان هات.. بەهەرحاڵ هات، مەنوچەر وتی:

- بۆچی لەوێ وەستاویت، باشە وەرە ژوورەوە ئیتر؟!

شەقایق بەمینگەمینگ:

- دەزانی.. مەنوچەر.. چیتر نامەوێت بێم، هەرچی تا ئێستا هاتوم بەسە، ئیتر.

مەنوچەر بەچاوێکی پڕ لەپرسیارەوە تەماشای شەقایقی کرد.. شەقایق تەماشاکردنەکەی لەچاوانی دزی.. مەنوچەر بەرامبەری وەستاو پرسی:

- بۆچی؟.. مەگەر ئامۆژن شتێکی وتووە؟

شەقایق لەپەنجەرەکەوە چاوبڕییە دەرەوەو بەهێواشی:

- نەخێر، دایکم قسەیەکی نییە، بەڵام.. ئاسیە پێم دەڵێت وانە خوێندن سوودی نییە.

مەنوچەر ڕومەتی لەتوڕەییدا سورهەڵگەڕاو، بەئاوازێکی کیناوییەوە:

- زۆر مندالّیت، وامدەزانی لەوانیتر تێگەشتوتری.. هەر وامدەزانی کەسێکی وریا لەم مالّەدا پەیدا بووە!

شەقایق هەر لەمندالّییەوە زۆر دلّناسک بوو، بەبچوکترین وشە دلّگراندەبوو، دەستبەجێ دەگریا.. ئەمجارە تاوەکو ویستی بگریێت، مەنوچەر ڕێگەی پێنەداو بەهەمان ئاواز وتی:

- توانای تۆ زیاترە، نابێت گوێ لەقسەی هەموو کەسێک بگریتو تۆ جیاوازیی.. لەگەلّ ئەوەشدا با بەو شێوەیە بێت کە ئارەزویی دەکەیت؟

ئینجا دەرگای ژوورەکەی کردەوە بۆ ڕۆیشتنی ئەو.

*******

چەند کاتژمێریکە کارەبا بڕاوەو. پەروێز لەژوورەکەی خۆیەوە تەماشای ژوورە تاریکەکەی مونیرەی کرد، بەشێوازی دەربڕینی پرسیار بەنێرگسی وت:

- براژن لەمالّ نییە؟.

نێرگس لەناو ژوورەکەوە سەیری ژوورەکەی مونیرەی کردو وتی:

- نازانم، نەمبینی لەسەرکار بگەڕێتەوە، بەلاّم شەقایق لەمالّە.

پەروێز ڕویکردە مەنوچەر:

- بڕۆ بزانە کەس لەوێیە یان نە؟

مەنوچەر بڕیارەکەی باوکی جێبەجێکرد، چوو لەدەرگای دا، شەقایق وەک کارەبا لەشوێنەکەی خۆی بەرزبووەو، بەدەنگێکی نزم:

- کێیە؟

مەنوچەر بەبێ وەڵامدانەوەی پرسیارەکە دەرگای ژوورەکەی کردەوە، شەقایق هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی:

- ترساندمت!

مەنوچەر سەرسامانە وتی:

- بۆچی لەتاریکیدا دانیشتویی؟.. ئامۆژن لەکوێیە؟

شەقایق چەند هەنگاوێکی بەرەو دەرگاکە هەڵگرتو وتی:

- چراکە لەچێشتخانەکە بوو، ترسام بڕۆم بۆ چێشتخانەکە.

مەنوچەر بەهێواشی:

- تەنیایت؟

- بەڵێ.

باشە وەرە بۆ ژوورەکەی ئێمە.

شەقایق چاویبڕییە ناو حەوشەکە:

- نەخێر، ئێستا دایکم دێتەوە!.

مەنوچەر پێداگریی نەکرد:

- کەواتە، چاوەڕێبە باچراکەت بۆ بێنم.

شەقایق ڕاستی دەکرد، چێشتخانەکە لەتاریکییەکی بێکۆتادا نغرۆبوو،، مەنوچەر بەتەواویی ترسابوو، کەچی بەهەر گیانسەندنێک بوو چراکەی دۆزییەوەو وەک زانستی زەید لەسەر یەخچاڵەکە بوو.

شەقایق شقارتەی هێناو خێرا چراکەی داگیرساند.. مەنوچەر چراکەی خستە سەر پەنجەرەکە.. مەنوچەر دودڵ بوو لەڕۆشتن، جارێکیتر وتی:

- دڵنیایت کە ناتەوێت بێیت بۆ لای ئێمە.

شەقایق لەجیاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکەی مەنوچەر چەند

هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە هەڵگرتو بەرامبەری وەستا.. سەری کردبوە خوارەوەو یاری بەچمکی جلەکانی دەکرد..

مەنوچەر بەئاوازێکی فەرماندەرانەوە:

- دەتەوێت شتێک بڵێیت؟

شەقایق لەئاوازەکەی ئەو دڵی ساردبوەوەو ئاهێکی هەڵکێشا:

- نەخێر..،

مەنوچەر بەئاوازێکی گونجاوتر وتی:

- نەوەک لەتەنیایی بترسیت؟

شەقایق سەری بەرزکردەوەو بەپەلە وتی:

- نەخێر، من دەمەویست..

مەنوچەر لەنێو تاریکی ژوورەکەشدا دەیتوانی درەوشانەوەی چاوی شەقایق ببینێ.. هات بەبیریدا کە ڕووناکییەک لەچاوەکانیدا دەدرەوشێتەوە، ڕوناکییەک هەزارجار لەروناکی چراکە زیاتر، بێ خواستی خۆی وتی:

- ئەی کچ، باشە بیڵێ خۆ تۆ منت کوشت.

شەقایق جارێکیتر سەری کردە خوارەوە:

- هێشتا ئامادەی.. بەمن..

مەنوچەر زەردەخەنەیەکی کردو بەمیهرەبانییەوە:

تاهەر کاتێک تۆ بتەوێت ئامادەم، بەڵام ئێستا وەرە بڕۆین بۆ ژوورەکەی ئێمە.. هەر کاتێک ئامۆژن هاتەوە، ئەوکات بگەڕێوە بۆ ژوورەکەی خۆتان.

شەقایق ڕازیبوو، بەڵام هەر کە پێی لەژوورەکە بردە دەرەوە مونیرە گەیشت.. مەنوچەر لەژێر لێوەوە وتی:

- ئەی بەختی ڕەش.

هەستێکی شیرین بـەتـەواوی بونی مـەنـوچـەردا چوبوە خوارەوە، شەوی تاریکی بەو بیرگەلە ڕەنگاوڕەنگە کە هەیبوو جوانتر بوو.. کاتەکە شەو بوو.. مانگ بازنەیی تەواو نەبوو، بەڵام کەوانەییە ڕوناکییەکەشی جوان بوو.

ئەستێرەکان نەخەوتبون، بـەڵام تەماشاکردنی شەقایق هەبوو، خەیاڵی ئەویش هەبوو، بەڵام لەخەیاڵیدا، لەتەنیشتی.. لەباوەشی.. تەنانەت هەست بەبۆنی جەستەی دەکرا، گەرمی گۆناکانی هەست پێکرد.. شـەرمـی تـەمـاشـاکـردنو نەرمی دەستەکانی بەتەواوی بونییەوە هەست پێکرد.

ئـەم هەستە شیرینو چێژبەخشانە شـەوی مەنوچەری لەشەوانیتر جـیـاکـردەوە، ئێستا دەیـتـوانـی بـەرونـی دەنگی لێدانەکانی دڵی گوێ لێبێت، دڵێک کە بۆ شەقایق لێیدەدا دەیتوانی سوڕانی خوێن لەدەمارەکانیدا ببینێت کە پڕ بون لەگەرمی..

لەئەمشەوەوە دەیتوانی عاشق بێتو ئەو بەشەی سەربان خەڵوەتگەی بـوو، تەنانەت دەیتوانی لەسەربانەکەوە سەیری ژووری مەعشوقەکەی بکات، بـەڵام بۆچی ئەمشەو؟.. بۆچی ئەمشەو تەماشاکردنی سەرنجراکێش بوو.. مەنوچەر دانیشت.. سەرەتا وەڵامی پرسیارەکەی نەدۆزییەوە، تا لەناکاو بەخۆی وت:

- هێی.. کوڕ خەریکە دەبیتە پیاو!

پاشان دوبارە لەجێگەکەیدا خەوت، بەڵام بەخەیاڵی ئەوەوە.

******

ماوەیەک بوو کە شەقایق زمانی ئینگلیزی هەبوو لەلای مەنوچەر، زمانی لەوانەکانیتر بـەلاوە باشتر بـوو، چونکە شیرینو چێژبەخش بـوو، بێجگە لـەوەش تـازە بـوو بۆی،

وانـەی خۆشەویستی مەنوچەریش بـوو، بێگومان مەنوچەر کاتێکی زیاتری بۆ ئەم وانەیە تەرخاندەکرد، کاتێک شەقایق بۆ یەکەمجار توانی ڕاستو بەبێ هەڵە ناوی خۆی بەئینگلیزی بنوسێت، چونکە ناوی لەسەر هەموو کتێبەکانی خۆی بینی.

*******

"١٣"

کاتی بەربانگ زۆری نەمابوو، مەنوچەر پێچەوانەی ڕۆژانیتر کزو لاواز لەسوچی ژوورەکە دانیشتبوو.. نێرگس سەوزەی هێنابوو، سەرقاڵی پاککردنی سەوزەکە بوو.. مەنوچەر سەیری دایکی دەکرد، کەچی خەیاڵی لەجێگەیەکیتر تێردەکردو بەخۆی دەوت:

نازانم ئەو ڕۆژوانەی دەیگرم قبوڵە یان نە؟.. هەر لەبیری شەقایقدام؟.. نە لەسەر مەبەست.. نە!..

لەو شەوە تاریکەوە ڕۆژ بەڕۆژ عاشقتر دەبوم. نەک تەنیا عاشقی ڕوخساری.. هەموو شتێکی شەقایق باشە، لەهەمووی زیاتر خانەدانییەکەی، قورسی سەیرکردنی.. ئەگەر گەورەتر بومایە .هـەر ئەمشەو دەچومە خوازبینی، وانـازانـم ئامۆژن حەزنەکات؟!.. هەرچۆنێک بێت لەکیومەرسو فەرهاد باشترم، خۆزگە فەرهادو کیومەرس کچ بوایەن.

چی بکەم، لەئاکامدا ئەوانیش وەک من کـوڕنو، کوڕیش داواکـــاری توندوتۆڵی جوانـی کچێکە، کێ لەکچە مامێکی میهرەبان باشترە، نازانم.. لەوانەیە بیرکردنەوە لەشەقایقو لەم کاتو ساتەدا تاوان بێت.. من بەڕاستی شەقایقم خۆش دەوێت.

سەرەتاو کۆتایی هەر ئەیهێنم. یانی دەبێت؟.. ئەی خودایە ڕۆژێک منو شەقایق..

دەنگی نێرگس ڕشتەی خەیاڵەکانی مەنوچەری لەیەککردەوە.

- بیر لەچی دەکەیتەوە؟

مەنوچەر ئەوەندە لەخۆیدا بوو، بەبێ خواست:

- بیر لەشەقایق.

چاوەکانی نێرگس لەسەرسامیدا خڕبوو.. مەنوچەر تازە ئاگاداری قسەکەی خۆی بوو، بەخوێنساردییەکەوە:

- لەئەوەی شەقایق بۆچی دێت لەلای من وانە دەخوێنێت؟!

نێرگس ئاهێکی هەڵکێشاو وتی:

- ئەم شەقایقە بێچارە بێجگە لەم وانەخوێندنە کە تۆ ئەم هەموو منەتەی بەسەردا دەکەیت، کارێکیتری نییە بیکات!.

- مەنوچەر لەژێر لێوەوە:

- چاکە.. کەمێکیش قەرزار بوین!.. کام منەت، من لەخوام دەوێت.

دەنگی دەرگاکە بەرزبووە، نێرگس بەهێواشی:

- بێگومان مونیرەیە..

نێرگس لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە بۆ کردنەوەی دەرگاکە.. کاتێک دەنگی هەنگاونانی شەقایق هات مەنوچەر لەجێگەکەی هەستاو بەهەر ڕێگەیەک بوو خۆی گەیاندە پشت پەنجەرەکە.. بەڵام هاتنەژوورەکەی ماوەیەک درێـژەی کێشا.. مەنوچەر لەبەرخۆیەوە:

- دەی بۆچی ئەوەندە لەبەردەم دەرگاکە دەوەستێ؟!.. ناسەلامەتی سێ دانە کوڕ لەمماڵەدا هەیە، چی مانایەکی هەیە کە شەقایق..

بەبینینی مەنیجەو سادق مەنوچەر وەک واقوڕماوێک ئەبڵەقی بەردەمی خۆیبوو بەسەختی لەسەر لێواری پەنجەرەکە هەستا.. شەقایق هاتە پێشەوەو بەپێکەنینێکی دڵگیر ئەو دوانەی ڕەوانەیماڵەکە کرد.. دەنگی نێرگس وەک شوشە گیانی مەنوچەر لەتکرد.. بەئاوازێکی ڕقاوییەوە:

چیت دەوێت لەبەردەم پەنجەرەکە؟!.. وەرە یارمەتیم بدە.. زۆری نەماوە بۆ بەربانگ.

مەنوچەر بەبێ خواست بەتوڕەییەوە:

- وێڵم، کە بزانم ئەمانە کێن.

نێرگس دەستی لەئیشەکەی هەڵگرتو بەئارامی بەرەو لای پەنجەرەکە هاتو بەبینینی مەنیجە وتی:

- ئا, خۆ مەنیجەیە، چۆن لەم ناوە دەرکەوتوە؟!

مەنوچەر بەبێ گرنگیدان بەقسەکەی نێرگس:

- دە، تەماشاکە.. توخودا تەماشاکە وەک بەرەڵای کوڵانو بازاڕەکان خۆی گۆڕییوە، حەیف ئێرە ماڵی من نییە، ئەگینا نەمدەهێشت هەموو کەسێک پێ بنێتە ئەم ماڵە.

نێرگس بەسەرسامییەوە:

- مەبەستت کێیە؟

مەنوچەر بەگۆڕانەوە:

- یانی تۆ ئەم کوڕە نابینی؟

نێرگس بەبێ هەستکردن بەگۆڕانی شێوازەکەی مەنوچەر بەگاڵتەجاڕییەوە:

- وازبێنە کوڕەکە.. ئیرەیی باش نییە، ئێستا کە خۆت ناتوانیت وابکەیت بۆچی چاوت نییە ئەو ببینێت؟

مەنوچەر پێکەنینێکی کردو وتی:

- لەڕواڵەتیدا دیارە لەم وێڵگەڕە خۆڕایی خۆرانەیە.

نێرگس ئەمجارە بەزمانێکی ڕاستەقینە:

بەتۆ چی؟.. ئیشت چییە؟.. ها، خەریکی خراپ دەڵێیت.

مەنوچەر لەپشت پەنجەرەکە لاچوو، ئەو خوێنە گەرمەی لەگەڵ تورەییەکەیدا تێکەڵبوو، تەواوی لەشی کردبوە ئاگر.. چیتر نەیدەتوانی ئارامبگرێت.. بەبێ هۆ چویە دەرەوەو بێئامانج لەماڵ دەرچوو، تەنانەت ساردی کەشوهەوا نەیتوانی تورەییەکەی کۆنترۆڵبکات.

لەناکاو مونیرەی بینی، بەرامبەر نانەواخانە وەستابوو.

- سلاو ئامۆژن!.

مونیرە زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- مەنوچەر گیان، هاتوی نان ببەیت؟

مەنوچەر دودڵ بو لەوەلامدانەوە، خەیاڵێک هات بەمێشکیداو بەپەلە وتی:

- بەڵێ، دەڵێم ئامۆژن تۆ بڕۆرەوە بۆ ماڵ، من نانەکە دەهێنم.

مونیرە بەبێ ڕەتکردنەوە ڕازیبو بەرەو ماڵ کەوتەرێ.. مەنوچەر دوای وەرگرتنی نانەکە بەبێ دواکەوتن بەرەو ماڵ ڕایکردو لەپشت دەرگای ژوورەکەی مونیرەوە وەستا، دەنگی قسەو پێکەنینی شەقایقو مەنیجەی دەبیست.. مێشک تێکی خواردبوو، نەیدەزانی چۆن تورەییەکەی خەفەبکات، بەجۆرێک دەنگی ئەو قورئانەی لەمزگەوتەوە بەرزبووە ئارامی نەکردەوە.

لەپڕ دەرگاکە کرایەوە، شەقایق بوو، بەبینینی مەنوچەر ڕاچەڵەکی.. مەنوچەر بەتورەییەکەوە تەماشای دەکردو

بەدەنگێکی هێواش کە تورەی تێیدا شەپۆلی دەدا:

- لەبەردەمی ئێمەدا واعەباکە دەدەی بەسەرتا وەک ئەوەی بمانەوێت قوتت بدەین، کەچی لەبەردەم بێگانەدا کە ساڵ بەساڵ لەمناوە دەرناکەون باش دەڕۆیت بەڕێوە.

شەقایق بەسەرسامییەوە چاوی تێبڕی، هێواشتر لەمەنوچەر:

- مەنوچەر، تۆ خەریکی چی دەڵێیت؟!.. پورم خۆ بێگانە نییە.

مەنوچەر بەگاڵتەجاڕییەوە:

- بەڵێ، بەڵێ، مەگەر سادق براتە، بەوشێوەیە لەبەردەمیدا ڕێدەکەیت؟!

زنجیرەی فرمێسک لەچاوانی شەقایقەوە دەدرەوشایەوە، بەتورەییەوە:

- ڕقم لەکەسی وەک تۆیە کە گومانی لەچاوی خۆیەتی.. برۆ لاوە بزانم.

شەقایق بەخێرایی لەقادرمەکانی ژێرخانەکە چووە خوارەوە، مەنوچەر خێرا بەدوایدا ڕۆیشتو بەتورەییەوە هاواریکرد:

- چیت دەوێت وا کەوتویتەتە دوام؟!.. ئەگەر خەیاڵت هێشتا ئاسوودە نەبوە کوڕەکەی پورم دوو سەعاتە ڕۆیشتوە، هەردوو چرکەش نەمایەوە.

مەنوچەر وەک پەیکەر لەدەرگاکەدا وەستابوو، نەیدەتوانی هیچ بڵێتو، کاتێک بەهۆشی خۆی هاتەوە، شەقایق لەچێشتخانەکە ڕۆیشتبوە دەرەوەو ئەو لەتەنیاییدا بیری دەکردەوە.

******

"١٤"

- ئێستا نابێت، من نایەم؟

نێرگس سەیرێکی کیناوی مەنوچەری کردو وتی:

- چەندجار پرسیت، منیش وتم نەخێر!

مەنوچەر بەبێزارییەکەوە بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشتو، بەهێواشی:

رقم لەهاوینە. ئارەزوی هیچ شوێنێکم نییە.

نێرگس بەتانەلێدانەوە:

- وەک ئەو پیرەژنانەی لێهاتوە کە بۆڵەبۆڵ دەکەن.. ئەوەم ناوێ، خۆ تۆ هەمیشە چرکەچرکە ژمێریت دەکرد بۆ گەیشتنی هاوین، خۆ تۆ بەردەوام بۆڵە دەهات بەسەر باوکتدا، بۆچی نارۆین بۆگەشتوگوزار، کەواتە ئێستا چیت لێهاتوە؟.. باشە واخەریکە دەچین بۆ سەفەر، ئیتر..!.

دەرگاکە کرایەوە، پەروێز هاتە ژوورەوەو بەخۆشحاڵییەوە:

- پێداویستی سەفەرەکە ئامادەیە یان نە؟.

نێرگس چاوی لەسەر مەنوچەر هەڵگرتو ئەبڵەقی پەروێز بوو.. پەروێز بەسەرسامییەوە:

- چی بووە؟.. بۆچی مۆنەت کردووە؟!.

نێرگس بەتوڕەییەوە:

- بەخودا نازانم: لەم کوڕە گوڵەت بپرسە؟!.

پەروێز بەئاوازێکی پرسیارکردنەوە لەمەنوچەر:

- چی بووە؟.

نێرگس بێدەنگییەکەی شکاندو بەردەوام بوو:

- لەبەیانییەوە تاوەکو ئێستا بۆڵەی دێت،، دەڵێت من نایەم!

پەرویز لەبەردەم مەنوچەر وەستاو وتی:

- مەنوچەر، دایکت ڕاست دەکات ؟

مەنوچەر بەدەستەپاچەیی:

- نەخێر، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە حەز لەشیراز ناکەم، دەڵێم بابڕۆین بۆ باکور.

پەرویز پێکەنینێکی کردو وتی:

- خۆ ئێمە هەموو ساڵێک ڕۆیشتوین بۆ باکور.. باشە، گۆڕانکاریش پێویستە، هەمووی نابێت هەر دارستانو سەوزایی بێت، جارێکیش دڵبخەرە سەر دەشتو بیابان.

نێرگس زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- زۆر باشە، ئێستا ئەگەر ڕازیبویت، هەستە شتەکانت کۆبکەرەوە..

شەوی ساماڵی مەنوچەر بەرەو تاڵی دەڕۆیشت.. ئەو حەزیدەکرد لەتاران بمێنێتەوە، ئەگەرچی ساڵانی پێشتر ئەم ئارەزوەی پێچەوانەبو، هەمیشە لەگەڵ هاتنی وەرزی هاوین ئارەزویدەکرد لەتاران دوربکەوێتەوە، کەچی ئێستا حەزی لەڕۆیشتن نییەو، دەیەوێت لەتاران بمێنێتەوە، لەلای شەقایق!

بەیانی زوو بەپێچەوانەی ئارەزوی دڵییەوە لەگەڵ دایکو باوکی بەرەو جێگەی گەشتەکە کەوتنەڕێ.. مونیرەو شەقایق وەک ساڵانی پێشوو دوای چۆڵبونی ماڵ دەستیان بەئەنجامدانی ئیشە ماوەکانی ناو ماڵ کرد، بەیانی ڕۆژی پێنج شەممە هەردوکیان ڕۆیشتن بۆ ماڵی نەنەگیان، بەرێکەوت مەنیجەو کچەکان لەوێبون.

کچەکان وەک هەمیشە لەحەوشە دەمەتەقێیان دەکرد، مەنیجە بەگاڵتەو پێکەنین خانوەکەی خستبووە سەرسەری.. سادقیش لەدەرەوەی خانوەکەبوو. هەڵبەت لەبەر کچەکان بوو، سادق کوڕێکی کەمدوو بوو، کاتێک دەنگی کچەکانی دەبیست تورەدەبوو.. لەوە دەترسا کە ببێتە بابەتی پێکەنینی ئەوانە.

نەنەگیان دەیوت:

- بەمزوانە دەچێت بۆ خزمەتی سەربازیی، دەزانم دەڵێت لەگەڵ هاوڕێکانمدا دەڕۆم بۆ خزمەتی سەربازیی.

مەنیجە وتی:

- ئۆو ئێستا دەڵێیت لەوێ شیرین دەکەن بەخێر.

مونیرە وتی:

- نەخێر، مەنیجە گیان دەبێت سوپاسی خوابکەیت، منداڵەکانی ئیسماعیل ئەوەندە گێژو خۆڕایی خۆرن، بێچارە کاک ئیسماعیل لەبەیانییەوە تاوەکو ئێوارە لەسەر ئەم ڕۆیشتن بۆسەربازییە کێشەو باسی هەیە لەگەڵ کوڕەکانییدا، بەڵام کێ گوێی لێدەگرێت؟.. دوو کەس جووت دەبن لەگەڕەکو کۆڵان.

ئێستا کوڕەکەی پەروێز سەر بەڕێو باشە، بەڵام ئامان لەدەست فەرهادو کیومەرس!

نیوەڕۆ بوو کە سادق هاتەوە، ماتو مۆن، تەنانەت وەڵامی سڵاوەکەی مونیرەی بەزۆر دایەوە، مەنیجە سەیرێکی نەنەگیانی کردو بەگاڵتەجاڕییەوە بەسادقی وت:

- سادق، لەکوێ بوی؟

- ڕۆیشتبوم دەفتەری خزمەتی سەربازییەکەم وەربگرم.

نەنەگیان پرسی:

- باشە وەرتگرت؟
- نەخێر، وەرم نەگرد.
ئەمجارە مونیرە پرسی:
- باشە بۆ؟
سادق بەتوڕەییەوە:
دەڵێن بەخشراویی، دەڵێم بۆ؟.. پێم دەڵێن کارت بەسەر بۆ؟..کەیەوە نەبێت، بڕۆ سوپاسی خوا بکە.
مونیرە وتی:
- بەهەموو شێوەیەک سوپاسی خودا بکە، نیگەران مەبە، بڕۆ لەبری ئەم دوو ساڵی خزمەتە، بیر لەژیانت بکەرەوە.
سادق بێگرنگیدان بەقسەکانی مونیرە، لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە.
تەنانەت بۆ نانی نیوەڕۆش لەژوورەکەی نەهاتەدەرەوە، عەسر کاتێک مونیرەو شەقایق دەڕۆیشتن ئەو هێشتا لەژوورەکەیدا بوو.

*******

## "15"

دوو هەفتەیەک بەسەر ڕۆیشتنی ئەندامانی خانەوادەی خەلیل سەفەر ڕادەبورد، شەقایق لەگەڵ ئەوەی هەمیشە ئارەزوی چۆڵبونیماڵەکەی هەبوو، کەچی ئەمجارە دەپاڕایەوە کە هەرچی زوترە بەدیداری هەمووان بگاتەوە، تەنانەت باوکەگیانی مۆنیش!.. بەڵام هێشتا هەفتەیەک بۆ گەڕانەوەیان مابوو،، دایکی بەیانی زوو لەماڵ دەچووە دەرەوە.. ئەو بەتەنیا

دەمایەوەو تا دوانیوەڕۆ هیچ کارێکی نەبوو کە بیکات، سەرەتا دڵی خۆی دەدایەوەو بەخۆی دەوت:

دەبێت لەم بێدەنگییە سود وەربگرم، هەفتەیەکی تر دوبارە هەموو شتێک دەستپێدەکاتەوە، وەک یەکەمجارەکەی، بەتایبەتی گاڵتەجاڕییەکانی کیومەرس‌و فەرهاد، ئینجا ئێستا لەلای خۆیەوە دەیوت:

- خراپەکارییەکانی ئەو دوانـەو بۆڵەکانی باوکەگیان ئەم بێدەنگییە قورس دێنێت!

بەیانی ڕۆژانی هەینی شـەقایق بەتامەزرۆییەکی زیاترەوە لـەخـەو هەڵدەستا، خۆشـحاڵ بـوو، چونکە دەیـتوانـی دوای هەفتەیەک کچە پورەکانی ببینێت، خۆی قسەیەکی نەبوو بۆ وتن، بەڵام فەریباو فاتمە هیچ کاتێک ئارامیان نەدەگرت.

فەریبا ساڵێک لەشـەقایق گەورەتربوو، لەدراوسێکانی ماڵی ئەوان کوڕێک هەبوو کە هەم ئەو حەزی لەفەریبا هەم فەریبا حەزی لەئەو بوو، قسەکان‌و بینینەکانی عاشقیش ئەوەندە باش گوێی لێدەگیرا، فاتمە لەگەڵ ئەوەی هەمیشە لەگەڵ فەریبادا بوو، بەڵام هیچ کاتێک لەبیستنی قسەکانی فەریبا تێر نەدەبوو، ئەو ڕۆژە کاتێک مونیرەو شەقایق گەشتنە ماڵی نەنەگیان، مەنیجە هێشتا نەهاتبوو، سادق بەپێچەوانەی نەریتی خۆیەوە لەهەیوانەکە دانیشتبوو، سڵاوێکی گەرمی لەگەڵ مونیرە داکردو لەبری سـڵاو، زەردەخەنەیەکی شـاراوەی بۆ شەقایق کردو سەری کردە خوار.

بەقسەکانی نەنەگیان دڵی شەقایق بەسەختی ئازار درا، پورە مەنیجە بەڕێکەوت پێش دوو ڕۆژ سەفەریان کردبوو، هەڵبەت

لەگەڵ کچەکانو کاک ئەحمەد، گرفتێکی نامۆ بەرۆکی بەشەقایق دەگرت، نەنەگیانو مونیرە سەرقاڵی قسەکردنی خۆیان بون، شەقایق لەژوورەکە چووە دەرەوە.

ئێستا لەهۆی زەردەخەنە هێمادارەکەی سادق تێگەیشت، کاتێک ڕۆیشتە حەوشەوە سادق سەرقاڵی لەپێکردنی پێڵاوەکانی بوو، بەرەو ڕوی شەقایق سوڕاو بەپێکەنینێکی گاڵتەوە:

- حاڵت بەتەواوی گیرا، نە؟!

شەقایق سەیرێکی سادقی کرد:

- بۆ نەهاتنیان دڵم نەگیراوە، بەڵکو بۆ ئەوەی کە بۆچی ئێمەش هیچکات وەکو ئەوانیتر سەفەر ناکەین.

سادق هەستاو بەرامبەری وەستا، زەردەخەنەیەکی بۆ کردو پێی وت:

- کچێ، وازبێنە، بیر لەچی دەکەیتەوە!

پاشان بی گرینگیدان ڕۆیشت.

شەقایق لەسەر پلەی قادرمەی هەیوانەکە دانیشت، بێخواست لەفەریباو فاتمە تورەبوو.. کەسێک نەبوو دڵی بداتەوە، تەنانەت کەسێک کە پێی بڵێت بیرکردنەوەت دەربارەی فەریباو فاتمەوە ڕەوانییە.

سادق زۆر زوو گەڕایەوە، شەقایق بەبڕیاری نەنەگیان خوانەکەی ڕێکخست، لەسەر خوان سادق پێشنیازێکی سەیری کردو هەمووان پێشوازییان لەپێشنیازەکەی کرد، بەتایبەتی شەقایق!.. لەسەر پێشنیازی سادق بڕیاردرا ڕۆژی سێ شەممە هەموویان بڕۆن بۆ ئیمامزادەی داود.

دوو شەممە عەسرەکەی گەشتیارەکانی خانەوادە گەڕانەوە، مونیرە وتی:

- دەڵێی ئەمانە زانیبویان کەوا ئێمە سبەینێ دەمانەوێت بڕۆینەدەرەوە.

شەقایق بەدڵ تەنگییەوە پرسی:

- یانی ناڕۆین؟!

مونیرە پێکەنی وتی:

- بابە، دەڕۆین.

مەنوچەر زوتر هاتەحەوشەوە، ڕوخسارێکی خوێنساردی هەبوو، بەڵام بۆ بینینی شەقایق چرکەژمێریی دەکرد، مونیرە بۆ پێشوازیکردن لەگەشتیارەکان لەژوورەکە ڕۆشتەدەرەوە.

- سڵاو ئامۆژن.

- سڵاو مەنوچەر گیان، بەخێربێیتەوە.. چەند زوو گەڕانەوە، هێشتا خۆ دوو سێ ڕۆژیتر کاتتان هەبوو؟!.

مەنوچەر بەپێکەنینەوە:

- ئێمە بۆ مانەوە قسەیەکمان نەبوو، بەڵام کەوگیرەکە دایبوو لەبنی مەنجەڵەکە.

مونیرە بەپێکەنینەوە لەحەوشە ڕۆیشتە دەرەوە.

هەرکە مەنوچەر هەنگاوی بـەرەو هەیوانەکە نـا، دەنگی مونیرە وەکو بزمار لەجێگەی خۆیدا وەستاندی:

- شتێک بووە مەنوچەر؟!.. ئەوانیتر لەکوێن؟.. دایکت، کاک پەروێز، بۆ کوێ ڕۆیشتن؟!

مەنوچەر هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی:

- چی بڵێم.. ڕاستییەکەی شەڕمان بووە.

دەنگی شەقایق قسەکەی بەمەنوچەر بڕی..

- دەموچاوت چی لێهاتوە مەنوچەر؟!

مەنوچەر سەیرێکی دەموچاوی شەقایقی کردو بەئاوازێکی تانەو توانج بازییەوە وتی!

- عەلەیکومە سەلام.

شەقایق، بەبێ هیچ گۆڕانێک:

- دەی ئەوانیتر لەکوێن؟

مونیرە لەکاتێکدا بەرەو ژوورەکەی خۆیان دەڕۆیشت وتی:

- وەرە ژوورەوە بزانم چی بووە؟

شەقایق بەبێدەنگ چای خستە سەرو لەلای مونیرەوە دانیشت تاگوێی لەقسەکانی مەنوچەر بێت.

ڕاستییەکەی ئێمە دەمانویست هەفتەی پێشوو بگەڕێینەوە، چونکە چیتر پارەیەکمان نەمابوو، بەڵام باوکەگیان نەیهێشت، وتی: لەکۆتایدا بەجۆرێک لەگەڵ یەکدا ڕێکدەکەوین، مامە ئیسماعیل بڕێک پارەی بەناوی قەرزەوە دایە باوکم بۆ ئەوەی کەموکورتیمان نەبێت، هەڵبەت باوکم لەبەر پارە نەبوو کە دەیویست بگەڕێینەوە..

ڕاستییەکەی لەدەست کیومەرس و فەرهاد بێزاربوین، یانی هەمووومان.. ئای ئەم دوانە دەردەسەرییان زۆرە.. لەدەست ئەم دوانە لەهیچ کوێیەک جێگەمان نەبوو، مامە ئیسماعیل هیچی نەدەوت، تائەوەی دوێنێ عەسر من لەگەڵ فەرهاددا بەشەڕ هاتم، تاوانی ئەو بوو، لەحەوشەی میوانخانەکە دانیشتبوو بەدار لەقەلە ڕەشی ئەمو ئەوی دەدا، منیش بێ بێزاربوم و شەڕم لەگەڵ کرد (مەنوچەر وەستانێکی کردو پاشان بەپێکەنینەوە

ئەمەشی بۆ زیادکرد):

- ئەم باینجانەش ئەو لەژێر چاوم چاندویەتی!

بەکورتی، باوکیشم چیتر ئارەزویی نەما، بەیانی شاڵو کڵاوەکەی لەبەرکردو کە بگەڕێتەوە.. مامە ئیسماعیل زۆر دڵگران بوو، بەهەرحاڵ ئێمە گەڕاینەوە، ئێستا باوکو دایکم ڕۆیشتون.. ڕۆیشتون بۆ شوێنێک، زوو دەگەڕێینەوە.

شەقایق بێمەبەست:

- مەنوچەر، ئەگەر لەشەوێنی تۆ دەبوم فەرهادم دەکوشت، کوڕی وێڵ وابزانێت کێیە؟!

مونیرە کۆکەیەکی کردو بەمەنوچەری وت:

- ئەگەر برسیتە بڕۆم چێشت بێنم؟

- نا، ئامۆژن حەزم لێی نییە، ئێستا باوکو دایکم دەردەکەون.

مونیرە هەستاو وتی:

- دەی بابڕۆم چات بۆ بێنم!

مەنوچەر بۆ ئەوەی مونیرە، شەقایق نەنێرێت بۆ ئەنجامدانی کارێک، دەستبەجێ:

- باشە، تۆ بەوانەکانتدا گەیشتویی یان نا؟.. دەمەوێت تاقیکردنەوەت بۆ بکەم!

خۆشبەختانە مونیرە لەژوورەکە چووە دەرەوە، شەقایق بێباکانە:

- نە، بابە، هەر تاقەتم نییە.

مەنوچەر بزەیەکی کردو وتی:

- سبەینێ بەیانییەکەی تاقیکردنەوەیە، ئەگەر نمرەکەت باش بێت ئەو کاتە منیش..!

شەقایق قسەکانی بڕی:

- سبەینێ خۆ من لەماڵ نیم!

مەنوچەر بەسەرسامییەوە:

- مەگەر لەکوێیت؟!

- دەمانەوێت بڕۆین بۆ ئیمامزادەی داود!

مەنوچەر بەئاوازێکی مناڵانەوە:

- منیش دێم.

شەقایق وتی:

- نەخێر، مەگەر کاتێک تۆ دەڕۆیـت بۆ سەفەر ئێمەیش لەدوات دێین؟

مەنوچەر بەگاڵتەجاڕییەوە:

- باشە دەبمە جانتاهەڵگری تایبەتی تۆ!

شەقایق:

- ئێمە دەمانەوێت ڕۆژێک لەگەڵ خێزانەکەی خۆماندا بڕۆین بۆ گەشت.

مەنوچەر بەخێرایی:

- لەگەڵ کێدا دەڕۆن؟

- لەگەڵ..

دەرگا کراوەیەو مونیرە هاتەژوورەوە، لەکاتێکدا دادەنیشت پرسی:

- بەڕاست ئەوانیتر کەی دەگەڕێنەوە؟

مەنوچەر بەئارامییەکەوە:

- دێنەوە، ئەم هەفتەیە دەگەن.

کاتێک پەروێزو نێرگس هاتنەوە لەسەر داوای مونیرە نانی

ئێوارەیان لەژوورەکەی ئەوان خواردو مەنوچەر لەخەیاڵەکانی خۆیدا نوقم بوبوو.

خەیاڵی بێهودە تـەواوی مێشکی داگیرکردبوو، دەیوست هاواربکات.. توانای ئەوەشی نەبوو، قسە گەیشتە گەشتە یەک ڕۆژییەکەی شەقایقو مونیرە، نێرگس وتی:

- ئیمامزادەی داود زۆر خۆشە، بەرێکەوت ئێمەش ساڵێک ڕۆیشتبوین.

- ئاوو هەوایەکی زۆر خۆشی هەیە.

پەروێز بەردەوام بوو:

- بەتایبەتی ئاوەکەی، براژن هەر وەک سەهۆڵە، چرکەیەکیش ناتوانێت دەست بخەیتە ناو ئاوەکە؟

مەنوچەر قسەکانی پەروێزی بڕی:

- بەڵام زۆر پیسو قەرەباڵغە، جێگەیەکی باش نییە، تەنیا بۆ پیرەژنو پیاوە پیرەکان باشە!

مونیرە وتی:

- منیش زیاتر لەبەر دایکم دەمەوێت بڕۆم بۆ ئیمامزادەی داود.

مەنوچەر پرسی:

- کەواتە تەنیا تۆو دایکت؟!

- بەڵێ، مەنیجەو مناڵەکانی ڕۆیشتون بۆ سەفەر، ڕۆیشتون بۆ سەردانی خزمەکانی مێردەکەی.

مەنوچەر هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو زەردەخـەیەکی شاراوەی خستەسەر لێویو لەدڵەوە وتی:

- دەی کەواتە ئەو کوڕە لەماڵ نییە.

مونیرە بەردەوام بوو:

- ئەگەر سادق نەیدەوت هەرگیز بیرم لەئیمامزادەی داود نەدەکردەوە، ئاخر تائێستا نەرۆیشتوم بۆ ئەویَ.

مەنوچەر زۆر بێزاربوو، بەخۆی وت:

- لەئاکامدا ئەم کوڕە سبەینێ بەدوای ئەمانەوەیە یان نا؟

دوبارە پرسی:

- باشە، دەی سادقتان لەگەڵە، خەیاڵتان ئاسودەیە؟!

شەقایق وتی:

- بەڵێ، ئەویش دێت.

مەنوچەر وەک ئەسفەنجێک کە خرابێتە سەر ئاگر، دەیویست جوێن بەزەویی‌و کات بدات، زیاتر لەهەموان لەشەقایق تورەبوو، نێرگس رویکردە مونیرە:

- چۆن سادق لەگەڵ خوشکەکەتدا نەڕۆیشتوە بۆ سەردان؟!

مونیرە وتی:

- سادق لەبەر کچەکانی کاک ئەحمەد ئەوەندە ناڕوات بۆ ماڵی مەنیجە، هێشتا دوای ئەم چەند ساڵە زۆر لەگەڵ فاتمەو فەریبادا ڕێک نییە.

مەنوچەر بەخۆی وت:

- بەڵێ ڕوی نییە لەگەڵ خوشکەکانی خۆیدا بڕوات بۆ سەفەر، بەلام ڕوی هەیە لەگەڵ کچە پورەکەیدا بڕوات بۆ گەڕان!

مونیرە بەردەوام بوو:

- بەڕاست پێم نەوتن، لەخزمەتی سەربازیش بەخشرا.

مەنوچەر بێخواستی خۆی وتی:

- ئامۆژن، ڕاست دەکەیت.

- بەڵێ، منیش بەمەنیجەم وت کە دەبێت ژنی بۆ بهێنێت، ئەویش دەڵێت خۆی ژنی ناوێت، ئەگینا کاک ئەحمەد قسەیەکی نییە.

مەنوچەر لەژێر لێوەوە:

- ها، سەرەتا دەیەوێت بەخۆشی ڕابوێرێت، ئینجا بڕوات ژن بهێنێت.

مەنوچەر بەبیانوی ئەوەی کە هیلاکە نانی نەخواردو چووە بۆ ژوورەکـەی.. بەڵام ئەوەندە تورەبوو توشی سەرئێشەی کردبوو، نەیدەتوانی پێڵوی چاوەکانی لێکبنێت، خەیاڵێک وەک چەکوش کێشیا بەمێشکیدا، لەناکاو هەستاو لەسەر جێگەکەی دانیشت.

نـەوەک پیر لەژنهێنان بکاتەوە.. نـەوەک خەیاڵی شەقایق لەمێشکیدا بێت؟!

ئـەو شــەوەی کە بۆ شەقایق لـەگـەڵ خـۆشـیو شـیرینیدا هـاوڕێـبـوو، بـۆ مـەنـوچـەر بـەدڵـتـەنـگـو کـەسـاسـی ڕابـبـورد، نەخشەگەلێکی جیاواز بۆ تێکدانی گەشتەکەی سبەینێ بەبیریدا هات، بەڵام هیچ کامیان نەدەکران.

بەیانی بەبێ ئـەوەی شەقایق پێش ڕۆیشتنەکەی ببینێت، لەخەو هەستا، هێشتا سەری ئێشی دەکرد، تورەبوو..

"١٦

- چەند ساڵ تەمەنتە؟
- یانی تۆ نازانیت؟
- نەوەڵلا!
سادق ڕاستگۆیانە وتی:
- دەی هێشتا زۆر منداڵی!
شەقایق بەتانەلێدانەوە وتی:
- بۆ نموونە باپیرە، تۆ زۆر گەورەیت؟
سادق زەردەخەنەیەکی بۆ کرد:
- ئەو زمانەت وەک چزوی دوپشکە!.

خەڵکێکی زۆر بۆ سەردانو خۆشی هاتبون بۆ ئیمامزادەی داود.. شەقایق تائێستا ئەم هەموو مرۆڤەی لەشوێنێکدا نەبینیبوو، یەکەمجار بوو کە دەرۆیشت بۆ گەڕان لەدەرەوەی شار تەنانەت کاتێک باوکیشی زیندوبوو، ئەو نەرۆیشتبوو بۆ سەفەر.. سەبارەن بەئەو هەموو شتێک تازەو سەرنجڕاکێش بوو، بەتایبەت شتومەکە ڕەنگاورەنگەکانی ناو دوکانەکانو دەنگەدەنگی کۆمەڵەکە، هەندێ کات ئەوەی ئاگاداری خەڵکەکە دەکرد، بۆنی کەبابو بۆنی خۆشی ڕەیحانە تەواوی بۆشایی ئەو شوێنەی پڕکردبوو.

سادق بێزاربوو، بێزارو توڕە بوو، ئارامی نەمابوو لەتەماشاکردنی بێشەرمانەی ڕومەتی شەقایق لەلایەن خەڵکییەوە، سادق لەمەدا شەقایقی بەتاوانبار دەزانی، بەرەبەرە ئارامی لێبڕا.. شەقایق کە بەتەواوی ئاگاداری ئەو بوو، بەبزەوە چاوی تێبڕی:

- ئیتر بۆچی مۆنەت کردوە؟
- لەخۆت بپرسە.
شەقایق بەسەرسامییەوە:
- مەگەر من؟.. مەگەر..
مونیرە بەسادقی وت:
- پورە گیان، نەنەگیان هیلاک بووە جێگەیەک بدۆزەرەوە با دابنیشین.
سادق درەنگی نەکرد، بێدواکەوتن لێیان جیابووە، دۆزینەوەی جێگەیەکی باش زۆر ئەستەم بوو.. شەقایقو مونیرەو نەنەگیان وەستابوون.
بەهاتنەوەی سادق هەمووان بەڕێنمای ئەو بەرەو میوانخانەکە ڕۆشتن.
نەنەگیانو مونیرە چەند خولەکێک بۆ پشودان دانیشتنو پاشان بەمەبەستی زیارەتکردن لەمیوانخانەکە ڕۆیشتنە دەرەوە، شەقایق سەرقاڵی ئامادەکردنی چێشت بوو بۆ نەنەگیان.. نەنەگیان چێشتی دەرەوەی نەدەخوارد، بەردەمی ژوورەکە هەیوانێکی بچووک بوو، شەقایق ڕۆیشت بۆ ئەوێ.. تا سەیری دەرەوە بکاتو چێژ لەهەوای فێنکی ئەوێ وەربگرێتو هەروەها چێشتەکەش ئامادەبکات.
سادق هێشتا توڕەبوو، بەبێ پێشەکی وتی:
- مەگەر تۆ تائێستا لەماڵ دەرنەچویت؟
شەقایق لەمەبەستەکەی تێنەگەیشت، پرسی:
- یانی چی؟

سادق لەتەنیشت شەقایق، لەلای دەرگاکەوە وەستا، شەقایق پشتیکردبووە ئەو.

- مەگەر تۆ تائێستا دوکانو خەڵکت نەبینیوە؟

شەقایق سەیرکردنی بێبایەخی پرسیارکەرانەی دەموچاوی سادقی کرد..

سادق بەردەوام بوو:

- بەجۆرێک تەماشای دەوروبەرت دەکەیت، وەک ئەوەی تائێستا لەماڵ نەهاتبیتە دەرەوە، وەک ئەم دێهاتییانە!

شەقایق سەریسوڕماو وتی:

- سادق، تۆ خەریکی چی دەڵێیت؟

سادق بەرامبەری لەسەر ئەژنۆ دانیشتو وتی:

- تۆ، بەقوربانت بم، تێناگەی کە هەموو خەڵک ئەبڵەقی چاوانت دەبن، بەڵام تۆ، لەدونیای خۆتدا خۆت تێردەکەیت، ئەگەر یەکێک بنێریت بەدوری دەزانم کە بزانێت؟!

شەقایق بەرقەوە وتی:

- زۆر ڕوداری هەرچی بتەوێت، پێم دەڵێی..!

سادق بەگاڵتەجاڕیەوە:

- مەگەر درۆدەکەم هەرچی مۆنە دەکەم، هەر ناڵێی تۆی!

شەقایق بەتووڕەییەوە وتی:

- بەتۆ چی؟

سادق پێکەنینێکی تورەی بەرزی دەست پێکردو وتی:

- ئۆو، چ ڕوداربوی.. لەئێستاوە پێت دەڵێم ئەگەر دەتەوێت لەگەڵ مندا بیت، دەبێت سەرت بکەیتە خوار، من ئاوەزی شەڕو گرفتم نییە.

شەقایق نەیتوانی خۆی لەرشتنی فرمێسکەکانی بگرێت، گریان خویەک بوو هەرگیز لەسەری دەرنەدەچوو.. سادق باش ئەوی دەناسی، بەگاڵتەوە وتی:

- ئێستا باشە کە پیاز پاکناکەیت، ئەگینا لافاو ئێرەی هەڵدەگرت.

شەقایق بەتوڕەیی چەقۆکەی دا بەزەویداو لەبەردەم سادق هەستاو بەخێرایی لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە، سادق ماتو وڕمابوو کەچی بکات، لەناکاو هاتەوە بەخۆیدا.. وای شەقایق خۆ هیچ شوێنێکی نەدەزانی، نەوەک ونبێت، بەم خەیاڵەوە لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە، بەڵام شەقایق ڕۆیشتبوو بۆ دەستشۆرو دوای شتنی دەموچاوی گەڕایەوە ژوورەوە.

چەند کاتژمێرێک لەهاتنەوەی نەنەگیانو مونیرە ڕایبورد،، سادق بەگومانی ونبونی شەقایق لەدەرەوەی ماڵ خەریکی گەڕان بوو، مونیرە بەشەقایقی وت:

- نەیوت بۆ کوێ دەچێت؟!

شەقایق بەمۆنی وتی:

- نەخێر.

نەنەگیان وتی:

- دایە گیان ئێوە چاوەڕوان مەبن، چێشتەکەتان بخۆن.

لەو کاتەدا دەرگا کرایەوەو سادق هاتە ژوورەوە، مونیرە وتی:

- پورە لەکوێ بوی؟ خۆ ئێمە لەبرسا مردین.

سادق زەردەخەنەیەکی ساختەی خستەسەر لێوی‌و وتی:

- دەی بامن بڕۆم چێشت بهێنم.

لەکاتی چونە دەرەوەدا تەماشەیەکی توڕەی شەقایقی کردو لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە.

خۆر لەپشت چیاکانەوە خەریکبوو ئاوادەبوو.. ئاسمانی ڕەنگ سور، جوانو سەرنجڕاکێشەر بوو، نەنەگیانو مونیرە لەگەشتە ڕازیو خۆشحاڵبوون، کەچی سادقو شەقایق هەریەکە لەچۆڵەوانیدا جوێنی بەویتر دەدا.

شەو نەنەگیان سوربوو لەسەر ئەوەی کە مونیرەو شەقایق بڕۆن بۆماڵەکەی، شەقایق ڕازینەبو، کاتێک کە سادق وتی:

- نەنەگیان زۆریان لێمەکە، پورم بەتەواوی هیلاک بووە.

شەقایق تورەتر بوو.

"١٧"

بەیانی ڕۆژی دواتر، بەهۆی بیرهێنانەوەی یادگارییەکانی دوێنێ بەتەواوی بێزاربوو، لەناکاو قەرەباڵغیو دەنگەدەنگی منداڵەکان کەوتەبەر گوێی، شەوی پێشوو مامەکانو باوکەگیان لەسەفەر گەڕابونەوە، ئەمڕۆ نەوشانی مامە.

مونیرەی بێچارە بەیانی زوو ڕۆیشتبووە سەرکار.. کارێک نەبوو بۆ کردن، مەنوچەر لەگەڵ منداڵەکانی ساڵحدا لەسەر هەیوانەکە یاری 'دەستشکاندنەوە'ی دەکرد.. مۆنو مات بوو هیچ بەهایەکی بۆ شەقایق دانەنا.

نێرگس شەقایقی بانگکرد:

پێرێ شەو، دیاری تۆو مونیرەم لەبیرچوو، وابزانم مەنوچەریش دیاری تایبەتی بۆ تۆ کڕیوە!

نێرگس هەستاو ڕۆیشت، مەنوچەر هاتە ژوورەوە.

ئەڵێی شەقایق کەسێکی نەناس بوو، بێگرنگیدان پێی چووە ژوورەکەی تر، پاش خۆگۆڕین لەماڵ چووەدەر.

نێرگس هاتەژوورەوەو بەسەرسامییەکەوە وتی:

- ئا.. مەنوچەر بۆچی ڕۆیشت؟!

"١٨"

عەسر بوو، ماڵ چۆڵو بێدەنگ، دور لەهەموو دەنگەدەنگێک، کەشێکی غەمباربوو، شەقایق لەهەیوان دانیشتبوو سەوزەی بۆ ژنی مامە ئیسماعیل پاکدەکرد، مەنوچەر کەمێک ئەولاتر سەرقاڵی نوسین بـوو،، لەئاکامدا مەنوچەر بێدەنگییەکەی شکاندو بەتانەلێدانەوە:

- خۆش ڕایبورد؟!..

شەقایق بەبێ ئەوەی تەماشای بکات:

- نەخێر، خۆزگە نەدەڕۆیشتم.

مەنوچەر وتی:

- خۆ تۆ تەنیا نەبوی؟!

- چۆن، بەڕێکەوت تەنیا بوم.

مەنوچەر وتی:

- دەی نەنەگیانت نەهات؟

شەقایق وتی:

- چۆن هەم ئەو هاتو هەم ئەو!

مەنوچەر پێکەنینێکی تانەبازی کردو وتی:

- ئا، دەی سادقیش بووە!

- بەڵێ، کوڕی گێل.

مەنوچەر سەرسامانە ئەبڵەقی شەقایق بوو، لەمەبەستەکەی تێنەگەیشت.

بەهەمان ئاواز بەردەوام بوو:

- ئیتر بۆچی گێل؟!

شەقایق سەیرێکی مەنوچەری کردو وتی:

- هەر وێڵی کە..، حەزناکەم لەبارەیەوە قسە بکەم، ئێستا تۆ پێم بڵێ چیت لێهاتوە؟.. بۆچی ئەوەندە ماتی؟..

مەنوچەر هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی:

- هیچ، هەروا.

شەقایق لەبەردەمی هەستاو چوە ژوورەوە، دوای چەند خولەکێک دوبارە گەڕایەوە بۆ هەیوانەکە بەزەردەخەنەیەک لەسەر لێوی وتی:

- ئەمەش دیاری برای خۆشەویستم!

مەنوچەر مۆنەی کردو وتی:

- کێ وتویەتی من برای تۆم؟

شەقایق پێکەنی وتی:

- زۆرباشە، ئەمەش دیاری مامۆستای خۆشەویستم.

مەنوچەر لەژێر لێوەوە وتی:

- زۆر باشە، سەرەتا بڵێ ئەمە چییە؟

شەقایق وتی:

- خۆت بیکەرەوە.

دەی پێش ئەوەی بیکەمەوە ئارام بگرە تادیارییەکەتت بدەمێ.

دوای چەند چرکەیەک مەنوچەر دیارییەکەی شەقایقی کە زۆر بەتاقەتەوە پێچرابوو، هێناو گەڕایەوە بۆ هەیوانەکە.

- ئەمەش پێشکەش بەخۆشەویسترین.،، ئێستا بیکەرەوە بزانە پەسەندی دەکەیت؟

مەنوچەر سەرپۆشێکی جوانی کڕیبوو بۆ شەقایق، ڕاست هاوڕەنگی چاوەکانی بوو، شەقایق پێنوسێکی جوانوسی بۆ مەنوچەر کڕیبوو، مەنوچەر بەپێکەنینەوە وتی:

- بەم پێنوسە جوانوسە نامەت بۆ دەنوسم.

شەقایق بەسەرسامییەوە پرسی:

- نامە؟!

مەنوچەر بەهێواشی وتی:

- لەنێوان خۆمان بمێنێتەوە، خەریکم دەڕۆم بۆ سەربازیی!

شەقایق سەرسامتر لەپێشوو:

- دەتەوێت بڕۆیت بۆ سەربازیی؟

- بەڵێ.

بەرنامەی هەینییەکان وەک هەمیشە بـەردەوام بـوو، بەو جیاوازییەی کە سادق ئیتر تەنانەت بۆ چەند ساتێکیش لەماڵ نەمایەوە.

هەر هەینییەک بەبیانوی کارێکەوە لەماڵ دەچویە دەرەوە، خۆرئاوا کاتێک هەمووان ڕۆیشتبوون، ئیتر دەگەڕایەوە بۆ ماڵ.. شەقایق بۆ ئەمە خۆشحاڵ بوو، بەڵام بۆ ئەوانیتر جیاوازی نەبوو، نەنەگیان وردە وردە ئاگاداری بابەتەکە دەبوو، بەڵام باوەڕکردنەکەی کێشە بوو.

لەو کاتەدا بوو کە زانی سادق کینە لەدڵە، ئەو ڕۆژی هەینییە، تەنیا کەسێک کە هات بۆ ماڵی نەنەگیان شەقایق بوو، پورە مەنیجەو کچەکان نەهاتبون، مونیرەش بەیانی زوو ڕۆیشتبوو

بۆ سەر ئیش، بەڵام پێش ڕۆیشتن شەقایقی گەیاندەبووە ماڵ دایکی، لەو کاتەی ڕۆژدا سادق هێشتا لەماڵ بوو، بەڵام بەبینینی شەقایق بەبێکوشتنی کات کەوتەڕێ، گومانەکەی نەنەگیان گۆڕا بۆ ڕاستی.

دوای ڕۆیشتنی سادق نەنەگیان هەستاو بەیارمەتی شەقایق جێگەکانی کۆکردەوە.

*******

"١٩"

بەڕاستی مرۆڤەکان دوو ڕون، تا کاتێک باوکەگیان لەماڵ بوو هەمووان خۆشەویستیان دەنواند.. هەرکە لەماڵ دەچووە دەرەوە دەستبەجێ ماڵ کەسی تێدا نەدەما، هەمووان دەکەوتنە خەیاڵی خێزانەکانیان، باوکەگیان لەگەڵ هەموو تورەیەکانییدا هەقی نەبوو بەسەر ڕۆیشتنە دەرەوەی بوکەکانی، بەڵام بوکەکان لەترسی یەکتر تا ڕۆیشتنی باوکەگیان پێ لەماڵ نابەنە دەرەوە.

دوێنێ لەگەرمەسێر هەواڵیان هێنا کە کوڕی مامی باوکەگیان مردوە، هەر ئەو عەسرە باوکەگیانو حاجی ژن ڕۆیشتن بۆ گەرمەسێر سەرەتای بەیانی هەموو بوکەکان ڕۆیشتنە دەرەوە، مونیرە وەک هەمیشە بەیانی زوو چووە سەرکار، پەروێزیش کە دەچووە سەرکار نێرگسی لەسەر ڕێگەکە برد بۆ ماڵی خوشکەکەی.

ماڵ بێدەنگ بوو، تەنیا دەنگی خڕەخڕی مەکینەی بەرگدورییەکە بێدەنگییەکەی دەشکاند، شەقایق لەخەیاڵەکانیدا

نوقم بوو.. چیتر دەنگی مەکینەکەشی نەدەبیست، دەنگی زەنگی دەرگا لەشوێنی خۆی هەڵیپەڕاند. بۆ چەند ساتێک گێژو مات ئەبڵەقی دەرگاکە بوو، بەرونی دەستەکانی دەلەرزین، کاتێک بەسەر خۆیدا زاڵبوو، هەستاو بەپەلە بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت، عەباکەی ڕێککردو دەرگاکەی کردەوە.

- سەرباز "مەنوچەری فیدائیان" لەخزمەتی تۆدایە.

- ئازادیت جەنابی "فیدائیان"!

مەنوچەر پێنج مانگێک دەبوو کە ڕۆیشتبوو بۆ سەربازیی، شوێنی خزمەتەکەی بوو، ئیسماعیل زۆر ئیرەیی بەپەروێز دەبرد.. کوڕەکانی خۆی چەند شڕو پڕ دەردەسەری بوون.

مەنوچەر هاتە ژوورەوەو لەکاتێکدا سەیری دەوروبەری دەکرد وتی:

- دەی تۆ بۆچی دەرگات کردەوە؟!

شەقایق عەباکەی خستە سەرپەتەکەو وتی:

- چونکە کەس لەماڵ نییە.

مەنوچەر هاتە پێشەوەو بەخۆشحاڵییەوە:

- کەواتە کەس لەماڵ نییە، تەنانەت باوکەگیانیش؟!

شەقایق بەسەرسامییەوە:

- بەڵێ، مەگەرچی؟!

مەنوچەر لەخۆشیدا جانتاکەی بەرەو ئاسمان هەڵداو وتی:

- ئۆخەی، بێدەنگە، تێر دەنووم،

شەقایق وتی:

- کەواتە سوپاس بۆ خوا چێشتی نیوەڕۆ، چات ناوێت ئیتر، نە؟!

مەنوچەر لەسەر قادرمەکە دانیشتو لەکاتێکدا پێڵاوەکانی لەپێی دادەکەند:

- بەدەستی تۆ، مەحاڵە شتێک نەخۆم.

پاشان سەری بەرزکردەوەو ڕاستەوخۆ چاویبڕییە ناوچاوانی شەقایق:

- ئاخر تۆ شانازی بەهەموو کەسێک نادەیت!

شەقایق وتی:

- کەواتە وەرە ژوورەوە تا بۆت بێنم.

مەنوچەر وتی:

- هەوا لێرە زۆر سارد بووە!

شەقایق سینییە چاکەی خستە بەردەم مەنوچەرو بەگاڵتەجاڕییەوە:

- سەر بورج خۆش ڕادەبوێرێت؟

مەنوچەر سەیرێکی شەقایقی کردو وتی:

- ئەمە ئیتر، ئێمە دەبێت لەو سەرمایەدا وەک بی بلەرزینو ئەو کاتە تۆ لێرە گاڵتەمان پێ بکەیت.

شەقایق لەکاتێکدا لەپشت مەکینەی بەرگدورەکەوە دادەنیشت وتی:

- باشە دەتوانی نەڕۆیت!

مەنوچەر زەردەخەنەیەکی شاراوەی خستەسەر لێوی و پاشان ڕاستگۆیانە وتی:

- دەمەوێت هەرچی زوترە تەواوبێت، تابڕۆم ژن بهێنم!

شەقایق بەسەرسامییەوە تەماشای دەکرد، مەنوچەر وتی:

- چییە؟.. بۆچی بەمشێوە تەماشام دەکەیت؟

شەقایق بەتانەوە وتی:

- نە، دەمەوێت بزانم چ گێلێک دەیەوێت ببێتە ژنی تۆ؟

مەنوچەر پێکەنینێکی کورتی کردو وتی:

- قسە بەژنەکەم مەکە، ها! من زۆرم خۆشدەوێت.

شەقایق دوبارە هەستاو بەتانەوە وتی:

- ئۆو، مردم لەئیرەییدا، باشە ئەم خاتونە لەکوێیە؟.. کە تۆی شێتکردوە؟

مەنوچەر تەماشایەکی تەماشاکردنەکەی شەقایقی کردو بەدەنگێکی وەک چییە وتی:

- چیت پێ بڵێم ئەی کچ، تۆ بۆچی دەمت ئەوەندە لارە؟!

شەقایق وتی:

- ئاخر، کاتێک نایناسم، بەدرۆوە بڵێم، بەڵێ دەیناسم!

مەنوچەر بەئاوازێکی پچڕپچڕەوە:

- دەمەوێت تۆ بێنم.

پاشان بەدەم پێکەنینەوە وتی:

- ئەو ژنە گێلە تۆیت.

شەقایق بەگاڵتەجاڕییەوە:

- وای، مەڵێ ئیشی ماڵ، شەکر لەناو دڵم بوو بەئاو!

مەنوچەر هەستاو لەسەر پلەکانەی هەیوانەکە دانیشت.

- وادەزانی گاڵتە دەکەم؟

شەقایق وتی:

- گاڵتە یان ڕاستی تۆ بۆ من برایەکی گەورەتری.

مەنوچەر برۆکانی تێکەڵبوو وتی:

- شەقایق بەقورئان، زلەیەکت لێدەدەم، ئەگەر جارێکیتر ئەم

قسە دوبارەبکەیتەوە!

شەقایق بێگرنگیدان وتی:

- تو گیانی دایکت زوتر بڕۆ بۆ ماڵی پورت، ئەگەر یەکێک بێتو منو تۆ پێکەوە ببینێت، خەیاڵات هەڵیدەگرێت.

مەنوچەر وەکو منالٚ وتی:

- کەس نایەت.. خەیاڵت ئاسودەبێت!

لەهەمانکاتدا دەنگی دەرگاکە بەرزبووە، شەقایق بەتوندی کێشای بەدەموچاویداو بەهێواشی وتی:

- بینیت.. بینیت وتم یەکێک دێت.

مەنوچەر بەپەلە پێلاوەکانی گرتە دەستەوەو ڕایکرد بۆ سەربانەکە.

شەقایق بێ تاقەت بوو بوو، بەهەمان ئارامی وتی:

بۆچی دەڕۆیتە سەربان؟

دەنگی دەرگاکە بەرزتربووە، شەقایق بەخێرایی بۆ کردنەوەی دەرگاکە ڕۆیشت، سەرەتا سەیرێکی سەربانی کردو پاشان دەرگاکەی کردەوە، کیومەرس بوو، هەناسە بڕکێی بوو، بەخێرایی هاتە حەوشەوە.. مەنوچەر لەسەربانەکەوە سەیری حەوشەکەی دەکرد).. کیومەرس وتی:

- کەس لەماڵ نییە؟

شەقایق وتی:

- نە، چی بووە، کیومەرس؟

کیومەرس دەستبەجێ چووە ژوورەکەی خۆیانو دوای چەند خولەکێک دوبارە هاتە حەوشەکەوە، تەماشاییەکی دەوروبەری کردو وتی:

- من خەریکم دەڕۆم، ئەگەر باوکم هاتەوە.. هەرکە بەشوێن مندا گەڕا، بڵێ کیومەرس مرد، بڵێ من نەمبینیوە.

شەقایق وتی:

- ئاخر چی بووە، بەمنیش بڵێ؟

کیومەرس وەڵامێکی ڕاستی نەداو بەپەلە لەماڵ دەرچوو، گەڵاو لقی داری ترێ ڕێگەیان نەدا تا مەنوچەر هەموو شتێک ببینێت، لەسەربانەوە بەئارامی وتی:

- س.. س.. شەقایق! ڕۆیشت؟

شەقایق هاتە پێشەوەو بەتوڕەیی وتی:

چیتە وەکو مار س.. س.. دەکەی، وەرەخوار، ڕۆیشت.

مەنوچەر بەخێرایی هاتە خـــوارەوە، زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕی خستەسەر لێوی‌و وتی:

- ها، من ئەم کیومەرسە بناسم، ئێستا دەروات کۆمەڵێک خۆڕایی خۆرتر لەخۆی کۆدەکاتەوەو دەڕوات بۆ گەڕان، لەوانەیە دوبارە لەگەڵ مامە ئیسماعیلدا شەڕی کردبێت! باشە بێ خەیاڵ.. بگەڕێینەوە بۆ سەر قسەکەی خۆمان.

شەقایق بەبێزارییەکەوە:

- توخوا بەسی کە.. وەرە برۆ، تا کەسێکیتر نەهاتوە.

مەنوچەر ڕاستگۆیانە:

- سەرەتا پێم بڵێ دەبیتە ژنم یاخود نا؟!

شەقایق بەتوڕەییەوە تەماشایکردو وتی:

- بۆچی تەواوی ناکەیت، خۆ من پێم وتی وەک برام وایت!

پاشان بێ گرنگیدان پێی بەرەو لای حەوزەکە ڕۆیشت، مەنوچەر لەپاڵ ئەو لای حەوزەکە دانیشت، تاویستی قسەیەک

بکات، شەقایق بەتوڕەییەوە هاواریکرد:

- دەزانی چییە؟ من لێت زویربوم!

چەند خولەکێک ڕاببورد مەنوچەر بەهێواشی:

- شەقایق لێم زویریی؟.

شەقایق بەکینەوە سەیری دەموچاوی کردو وتی:

- دەتەوێت چی بڵێی، بیڵێ؟

مەنوچەر وتی:

- چەند کوڕە مامت هەیە؟ کوڕە مامی تەنیا.

شەقایق هەناسەیەکی بەرزی هەڵکێشاو وتی:

- کیومەرس‌و فەرهاد!

مەنوچەر بەسەرسامییەوە!

هەر ئەم دوانە؟!

- بەڵێ.

- ئا، کەواتە من گەلای چەوەندەرم!

شەقایق بەچەند قسەیەکی پچڕپچڕ:

- نەخێر، تۆ وەک برام وایت.

مەنوچەر بەتوڕەییەوە هەستایە سەرپێ‌و وتی:

- نەخێر، من کوڕی براتم!

شەقایق بەبێزارییەکەوە:

- چ جیاوازییەکی هەیە؟

مەنوچەر زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوی‌و دوبارە بەرامبەری دانیشت.

- دەی، هەر ئەمەیە ئیتر ئەگەر من کوڕی مامت بم دەتوانم.. دەتوانم لەگەڵتدا شایی بکەم، بەڵام خۆ ئەگەر برات بم، ئەوا ناتوانم.

شەقایق سەیرێکی گاڵتەجاڕی ئەوی کردو بەگاڵتەجاڕییەوە:

- کێ بەتۆی وتوە ژنت دەدەنێ!

مەنوچەر وتی:

- دەزانی بەرات دراوە بەدڵم.

شەقایق بەگاڵتەوە:

- ها، ئەو بەراتە! بەهەڵە هاتوە بۆ دڵت.

مەنوچەر بەقسەکەی شەقایق کەوتە پێکەنین‌و بەپێکەنینەوە:

- ئێستا گاڵتە بکە، تاپێی پیشان بدەم بەدبەخت ئەمە شتێک نییە، من دە منالم لێت دەوێت‌و هەمووشیان کوڕ!

شەقایق زەردەخەنەیەکی کردو بەتەنیشتییەوە دانیشت‌و ئینجا ئەبڵەقی خاڵێک بوو:

- دەزانی مەنوچەر، ژنێک هەیە لەباخچەی ساوایان ئیش دەکات ناوی "خەنە سوڵتانە"، ئەگەر ئەو بهێنیت باشترە، لەرۆژێکدا نەوەد منداڵ تەڕو وشک دەکات، لەو نەوەد منالە، پەنجا.. شەستێکیان کوڕن.

مەنوچەریش بەهەمان ئاواز:

- ئەها، ئەوکاتە ئەم نەنە سوڵتانە تەمەنی چەند ساڵە؟

شەقایق وتی!

- گەنجە، هەفتا ساڵە!

مەنوچەر بەگاڵتەوە:

- هیچ، ئیتر لەسەر سفرەی مارەبڕین لەباتی مستیلەی ئاڵتون دەبێت ددانی ئاڵتونی بدەمێ!

شەقایق پێکەنی، دەیویست شتێک بڵێت، پێکەنین مۆڵەتی نەدەدا، مەنوچەر سەیرێکی پڕ ئارەزوی دەموچاوی شەقایقی

کردو وەک بەرەڵاکان وتی:

- گیان!

شەقایق لەتەنیشتی هەستاو بەرەو ژوورەکەیان ڕۆیشت، مەنوچەر سەرسامانە پرسی:

- دەستبەجێ، لێهات یەکسەر!

- هیچ، بۆ چەند ساتێک لەبیرم چوبوو کە تۆ چەند ڕوداریی.

## بەشی سێیەم
"٣٠"

دوو ساڵ ڕابورد..

هەوڵەکانی مامە ئیسماعیل لەگەڵ فەرهادی کوڕی گەیشتە ئەنجامو بەهەر شێوەیەک بوو ئەویش ڕۆیشت بۆ سەربازیی، لەگەڵ ئەوەشدا دڵی مامە ئیسماعیل هەموو ساتێک دەلەرزیو ساڵێک ڕایبورد بەسەر چونی بۆ خزمەتی سەربازیی، تا لەئاکامدا بەراوێژی باوکەگیان پلانیان داڕشت بۆ ئەوەی بەدوای کچێکی باشدا بگەڕێن بۆ فەرهاد، کیومەرس لەروخساریدا بێ خەیاڵ بوو، بەڵام بێئەندازە ئیرەیی بەفەرهاد دەبرد، بەم حاڵە ڕازینەدەبو کە بچێت بۆ سەربازیی.

خزمەتەکەی مەنوچەر بەرەو تەواوبون دەچوو، سێ مانگ دەبوو نەهاتبوەوە، شەقایق لەهەمووان زیاتر بۆی دڵتەنگ بوو، کاتێک نامەیەک لەوەوە دەهات بەهەر شێوەیەک بوایە نامەکەی دەخوێندەوە تاخەیاڵی لەبارەی ساغو سەلامەتییەوە ئاسودەبێت، پەروێز بەهۆی بێئۆقرەیی نێرگس حەوت جار ڕۆیشتبوو بۆ ساریو خۆی سەردانی مەنوچەری کرد بوو.

شەقایق بۆ هاتنەوەی مەنوچەر چرکەژمێریی دەکرد، کە هەندێک بیری دەکردەوە تێدەگەیشت کە جگە لەمەنوچەر هیچ هاودەمێکی نەبوو، کیومەرس لەبەیانییەوە تا ئێوارە لەدەرەوە دەسوڕایەوە، ئامۆژنەکانیش ئەوەندەی گرفتاری ئیشوکاری ناو

ماڵ بوون کە تەنانەت کاتیان نەبوو لەگەڵ یەکتردا قسەبکەن، دایکیشی زۆربەی کات کاتێک لەئیش دەگەڕایەوە بێزارو هیلاک بوو.

کۆتاییەکانی مانگی شەهریوەر بوو، کەشوهەوا دڵگیر بوو، ئێستا چوار مانگ دەبوو کە مەنوچەر بەمۆڵەتیش نەهاتبووە، پەرویز بەوە دڵی نێرگسی دەدایەوە کە کۆتایی خزمەتی سەربازی هەمیشە بەمجۆرە دەبێت،، نێرگس نیگەران‌و چاوەڕوانبوو، فەرهاد بەبێ دەنگەدەنگ پەیمانی دابوو، لەو کاتەوەی کە پەیمانی دابوو، زۆر چاکبوو.

هاوڕێتی کیومەرسی نەدەکرد، کیومەرس بێچارە بۆ ئەوەی تەنیا نەمێنێتەوە بۆ ساتێکیش لەماڵ نەدەماوە دەڵێی هەمووان لەبیریانکرد بوو، باوکەگیان دەیوت:

- ئێستا کاتێکی باشە بۆ ئامۆژگاریکردنی کیومەرس.

لەوانەیە کیومەرس هیلاک بوبێت، بەڵام هێشتا ملهوڕو خۆبەزلزان بوو.

مامە ئیسماعیلیش زۆر سور نەبوو، وتی:

- بەدۆزەخ، بەمن چی هەر هەڵەیەک دەتەوێت بیکە.

هەینی بەیانییەکەی بوو، مونیرە وەک هەفتەی پێشوو ناچاربوو بچێتە سەرکار، بەتەنیا شەقایق لەماڵ بوو، دەرگاکرایەوەو نێرگس هاتەژوورەوە، شەقایق بەهەراسانی پرسی:

- ئامۆژن چی بووە؟

نێرگس بزەیەکی کردو:

- ئەی بابە! خۆ تۆ حاڵو ڕۆژت لەمن خراپترە؟

شەقایق بەشـەرمـەوە سـەری کـردەخـوار، نێرگس چووە تەنیشتیو وتی:

- شەقایق دەڵێم ئەمڕۆ خۆ پەرویز ڕۆیشتوە بۆ ساری، دایکی تـۆش چـووەتـە سـەرکـار، وەرە خۆشمان بڕۆین بۆ ئیمامزادەی باڵەح!

- دڵم بەتەواوی بیری ئیمامزادە دەکات (دڵۆپە فرمێسکێکی شێوە مـرواری بەچاوانی نێرگسدا هاتەخوار، نێرگس خێرا بەسوچی سەرپۆشەکەی دڵۆپە فرمێسکەکەی سڕیو بەهێواشی وتی:

دەزانـی شەقایق ئەمڕۆ لەخۆوە کەوتمە خەیاڵی منداڵی مـەنوچـەر.. دەستبەجێ دڵـم ڕۆیشت بۆ لای کـاک ئیرەجی خوالێخۆشبوو!

شەقایق لەبەرامبەری نێرگس دانیشتو وتی:

- چۆن ئامۆژن؟!

نێرگس چاوبڕیبووە حەوشەکە، زەردەخەنەیەکی دڵگیر دەموچاوە خەمگینەکەی داپۆشی، بەدەنگێکی ئارام وتی:

مەنوچەر یانزە مانگ بوو.. بەڵێ، وابزانم یانزە مانگ بوو، لەلای دەرگاکە خەریکبوو وردە وردە ڕێی دەکرد.. لەدەوروبەری بوم نەوەک بکەوێت، هێشتا گێژی دەخوارد، لەپڕ لەناوەڕاستی حـەوشـەکـەدا شـپـرزە دەبــوو، قـیـژەی دەگەیشتە ئاسمان، منالێکیش کە بکەوێتە سەرپێ ئیتر لەجێگەیەک ئۆقرەناگرێت، تەنیا دەیەوێت ڕێبکات.

بـەکـورتـی، لـەسـەر سـەری وەسـتـابـوم نـەوەک بکەوێت، لەوکاتەدا دەرگا کرایەوەو باوکت هاتە ناو حەوشەوە ئەو کاتە

هێشتا باوکت ژنی نەهێنا بوو، بەڵام وەک ئەوەی ئارەزوی دایکت لەسەریدا بوو، هەر کە چاوی بەمەنوچەر کەوت بەسەرسوڕمانەوە:

- ئا، براژن مەنوچەر ڕێدەکات؟!

پێم وت:

- بەڵێ، دوو مانگە ڕێدەکات!

نێرگس ئاهێکی هەڵکێشاو بەردەوامبوو:

کاک ئیرەج، بەرەحمەت بێت دەستیکرد بەگیرفانیداو پێنج تومەنییەکی دەرهێناو بەدەوری سەری مەنوچەردا سوڕاندیو خستییە گیرفانی جلەکەی، ئەم باوکەگیانە کاتێک کە مەنوچەر لەدایکبوو دە تومەنییەکی پێدا، بەڵام ئیرەج مەنوچەری زۆر خۆشدەویست!..

نێرگس پێکەنینێکی کورتی کردو وتی:

هەمیشە بەمنی دەوت براژن منداڵەکانی کاکە ئیسماعیل چەند ناشرینن، مرۆڤ ئارەزوی تەماشاکردنیانی نییە،، کیومەرس و فەرهاد کاتێک منداڵ بوون لەو منداڵە ناشیرینو چەپەڵانە بوون کە هەمیشە دەچوونە ناو خۆڵو خشاکەوە، ئەعزەم پیایاندا نەدەگەیشت، هەمیشە یان نیوەی سکیان بەدەرەوە بوو، یان ئاوی لوتیان هاتبوە خوار.

نێرگس پێکەنیو لەکاتی هەستاندا وتی:

- لەکۆتایدا ئەمەوێت بزانم لەگەڵم دێی بۆ ئیمامزادە یان نە؟

کەشوهەوای پاکو پیرۆزی ئیمامزادە لەگەڵ دەنگی ئایەتەکانی قورئانو بۆنی گوڵاودا تێکەڵبوو، دەرونی مرۆڤی سوک دەکردەوە، کاتێک دەنگی قورئان بەرزدەبووە هەر چوار

لای لەشی مرۆڤ دەلەرزی‌و دەرۆیشتە خەیاڵەوە.

لەنێو ئەو هەموو دەنگەدەنگەدا، تەنانەت دەنگی ژماردنی تەزبیح‌و کەوتنی دانە دانەی بەسەریەکدا، دەبیسترا.. نێرگس دەستی بەدەوری پەنجەرەی ئیمامزادەدا سوڕدابو، دەگریا.

شەقایق دور لەچاوی ئامۆژنی چەند دڵۆپە فرمێسکی ڕشت، لەوە دەترسا کە نێرگس پێی بڵێت: سەری پیازی، قنجی پیازی بۆ کوڕی من دەگریت.. نێرگس زۆر میهرەبان بوو، لەژنی مامە ئیسماعیل‌و مامە ساڵح میهرەبانتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر لەوان سیاسەتی هەبوو، ئەگەر بیویستایە تانە لەکەسێک بدات‌و بەتوانجەوە قسەیەک بکات ئەوەندە بەشارەزایی‌و ئارامی دەیوت کە مرۆڤ سەرەتا وایدەزانی بەسودی هەمووان قسەدەکات، بەڵام پاشان کە بەدەریای قسەکانیدا دەرۆیشتیتە خوارەوە، تازە لەقسە چزودارەکانی تێدەگەیشتی، سەرباری ئەوەش بەشێوەیەکی گشتی خۆشەویست بوو.

نێرگس هات‌و لەتەنیشت شەقایق دانیشت، چاوەکانی سورو هەڵئاوساوبوو،بەدەنگێکی داگیرا:

- شەقایق گیان لەناو جانتاکەم کیسەیەک خورما هەیە، هەڵیگرەو بیبە لەناو خەڵکدا بەشی بکە.

کاتێک نوێژ تەواوبوو، هەردوکیان نوێژیان کردو لەئیمامزادەکە ڕۆیشتنە دەرەوە نێرگس بێدەنگییەکەی شکاندو وتی:

- ئەوبەری پردەکە دوکانی کەباب-ی هەیە، بابڕۆین لەوێ نانی نیوەڕۆ بخۆین‌و پاشان بڕۆینەوە بۆ ماڵ لەوانەیە تائێستا پەروێزیش هاتبێتەوە.

کاتێک خزمەتکارەکە چێشتەکەی خستە سەرمێزەکەو ڕۆیشت، شەقایق وتی:

- ئامۆژن دەمەوێت پرسیارێک بکەم، کە هەمیشە دەمویست لێتی بکەم، بەڵام لەوە دەترسام هەراسان بیت.

نێرگس بەمیهرەبانییەوە تەماشای ڕومەتی شەقایقی کردو پیشانیدا کە چاوەڕێی بیستنە، شەقایق وتی:

- بۆچی دوای مەنوچەر، منداڵی ترت نەبوو؟.. واتە مناڵت نەدەویست؟

نێرگس وتی:

- دەبوایە گومانم بکردایە کە پرسیارەکەت چییە؟.. زۆر کەس ئەم پرسیارەیان لێکردوم، دەزانی ڕاستەوخۆ لەچلەی مەنوچەر سکم پڕبوو، زۆر سەختبوو شیرم دەدایە مناڵێکو یەکێکیش لەسکدابوو،، بەهەر بەدبەختییەک بوو هاتە دونیاوە، موەکانی وەک خەڵوز ڕەش بوو، کەچی نەدەڕۆیشتە دڵەوە..

تێدەگەی چی دەڵێم، زۆر کەم شیری دەخـوارد، ڕۆژی هەژدەیەم بەهیچ شێوەیەک شیری خۆمی نەخوارد، شیری وشکم پێدەدا، لەوانەیە ئەمەبوو کە خۆشەویستییەکەی ئەوەندە نەرۆیشتە دڵمەوە، ناوم نابوو لەیلا.. لەیلا گەیشتە تەمەنی سێ مانگ، بەڵام لەم سێ مانگەدا چەند بەڵایەک بوو بەسەرمدا هات کە هەر مەڵیو مەپرسە، وردەوردە خۆشم گەیشتمە ئەو بڕوایە کە ئەم منداڵە خۆش بەخت نییە.

کاتێک لەیلا مرد حاجی ژن پێی وتم:

- من دەمویست هەر ڕۆژی لەدایکبونییەوە شتێکت پێ بڵێم، بەڵام لەوە دەترسام لێم زویربیت.

حاجی ژن وتی:

- لەکۆنەوە وتویانە منداڵ لەکاتی لەدایکبونیدا ئەگەر موی ڕەشی درێژی هەبوو، ئەو منداڵە سەر خۆرەی دایکی دەبێت، بەڵام تۆ دەبێت سوپاسی خوا بکەیت کە منالەکەت مرد، چونکە لەوانەیە خۆتی بکوشتایە.

بەکورتی، چیتر منداڵم نەویست، هێشتا کە دەموچاوی لەیلا دێتەوە بیرم لەشم دەلەرزێت، تەنانەت پەروێزیش دوای ئەوەی پێی وتم:

- من هەر لەیلام خۆش نەدەویست، لەگەڵ ئەوەی منالی خۆم بوو، بەڵام هیچ خۆشەویستی لەدڵمدا نەبوو، دەموچاوی جوان بوو، بەڵام دڵگیرنەبوو.

کاتێک گەیشتنە ماڵەوە هێشتا مامە پەروێز نەهاتبووەوە، لەدەنگەدەنگی ماڵی ئیسماعیلەوە دیاربو بوکی تازە هاتوە بۆ ماڵیان، کیومەرس لەناو حەوشە بوو، بەڵام هەرکە ئەوان هاتنەوە خێرا لەماڵ ڕۆیشتە دەرەوە، نێرگس بەهێواشی لەگوێی شەقایقدا وتی:

- کارەکەی ئەعزەم هیچ باش نییە، کیومەرسی زۆر لەبیرکردوە!

بەبیروبۆچونی شەقایق ئامۆژن نێرگس ڕاستی دەکرد، لەگەڵ ئەوەی کیومەرس بیستو یەک ساڵ تەمەنی بوو، هێشتا دەبوایە لەگەڵ ئەویشدا وەک منالێک ڕەفتاریان بکردایە، ئەویش پێویستی بەخۆشەویستی دایکو باوک بوو، شەقایق حەزیدەکرد هەرچی زوترە بوکی مامی ببینێت، ژنی مامە پەروێز دەیوت:

- لەفەرهاد جوانترە!

بەو جۆرەکەی کە دیار بوو مامە ئیسماعیل دەیوست لەماوەی چوار ڕۆژی داهاتو، ئاهەنگەکەی فەرهاد بکرێت، هەڵبەتە زیاتر لەسەر قسەی حاجی ژن، حاجی ژن زۆر نەخۆشبو دەیوت:

- دەمەوێت تا لەسەر پێم ژنهێنانی فەرهاد گیانم ببینم.

عەسر دەنگەدەنگێک بەرزبوەو هەمووان خەریکبون دەڕۆیشتن بۆ ماڵی بوکەکەی مامە ئیسماعیل، شەقایق لەپشت پەنجەرەکەوە تەماشای حەوشەکەی دەکرد، لەکۆتایدا سەرکەوت بۆ ئەوەی بوکەکەی مامەی ببینێت، ئامۆژن ڕاستی دەوت زۆر لەفەرهاد جوانتر بوو، خۆشەویستو باڵابەرزتر بوو.

تەنیا سەرو ملی لەفەرهاد کورتتر بوو، بەڕۆشتنی مامە ئیسماعیلو ساڵحو باوکەگیان ماڵ چۆڵ بوو، کاتی بانگی ئێوارە لەدەرگا درا، شەقایق کاتێک ویستی لەژوورەکە بچێتە دەرەوە چاوی بەمامە پەروێز کەوت، باوەڕینەکرد، مەنوچەر لەدوایەوە بوو، پەروێز بەهێواشی لەپلەکانەکان هاتەسەرەوە، خەریکبوو سەیری ناو ژوورەکەیانی دەکرد، مەنوچەر سەری بەرزکردەوە، چاوی بەچاوە تیشکاوییەکانی شەقایق کەوت لەناو تاریکی ژوورەکەدا چەند دەدرەوشایەوە، ئەڵێی دەگریا، دەستی خستەسەر شوشەی پەنجەرەکە، مەنوچەر بەبێویستی خۆی هەنگاوێکی بۆ پێشەوەنا، حەزیدەکرد لەپشتی شوشەکەوە هەست بەگەرمی دەستەکانی شەقایق بکات،، دەنگی پەروێز هێنایەوە هۆشی خۆی.

شەقایق خێرا لەپشتی پەنجەرەکە لاچوو، ماوەیەک دوای ئەوە دەنگی هاواری خۆشی نێرگس لەهەموو ماڵەکە بەرزبووە،

شەقایق لەژوورەکەی خۆیان بەئارامی دەگریا.

بەیانی ڕۆژی دوایی قەرەباڵغی بەرپابوو، مونیرە پێش ڕۆیشتن بەشەقایقی وتبوو کە لەژوورەکە نەچێتە دەرەوە، هێشتا پاش ئەم هەموو ساڵە پردێکی خۆشەویستی لەنێوان ئەوانو باوکەگیاندا نەبوو، مونیرە حەزی لەماڵی باوکی مێردەکەی نەدەکرد.

بەپێشنیاری باوکەگیان مەڕیان کڕیو قوربانیان کرد بۆ مەنوچەر، بەپێشنیاری یەکێک لەدراوسێکان بڕیاردرا چێشتەکە لەماڵی دراوسێکەیان دروست بکەن، نێرگس سەوزەی هێنا بوو، دەیویست سەوزەی سورەکراو دروستبکات.

داوای لەشەقایق کرد کە یارمەتی ژنەکان بدات تا سەوزەکە پاک بکرێتەوە، خۆی ئارامی نەبوو، بەدەم ڕۆیشتنەوە قاقا پێدەکەنی، مەنوچەر بەردەوام بەڕێوەبوو، حەزیدەکرد ئەویش لەناو ژنەکاندا دابنیشێتو لەگەڵ شەقایق سەوزە پاکبکات، بەڵام تادەهات ساتێک ئارام بگرێت، بانگیان دەکرد، بێزاربوو، حاجی ژن کە تا کەمێک پێش ئێستا توانای ڕۆیشتنی نەبوو، ئێستا دەیتوانی لەسەر پێکانی بڕواتو بڕیاربدات، وەک ئەوەی ئارەزوی گەنجی دابێتی لەسەری، باوکەگیان لەژێر مێوەکە، لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشتبوو لەگەڵ ساڵحو ئیسماعیلدا قلیانی دەکێشا، تەمشاکردنی وەک ڕابردو بەفیز بوو.

سەوزەکان بەکۆمەڵ زوو پاککرا، ژنەکان خێراو خێرا سەوزەکانیان شۆردو لەسێبەرەکەدا بڵاوەیانپێکرد تاپاش نیوەڕۆ وردی بکەن، شەقایق لەسەر داوای نێرگس سەرقاڵی شۆردنەوەی میوە بوو،، حاجی ژن هەموو جارێک دەهاتو

لەسەر سەری دەوەستاو ڕەخنەی دەگرت و پاشان دەرۆشت، شەقایق بێزاربوو.. دەستو دڵی ئیشکردنی نەمابوو، لەناو ئەم هەمووەدا تەنیا بۆڵەی بەسەر ئەودا دەکرد، وردە وردە هەستیکرد لەکۆمەڵەکە دورکەوتەوە، هەر کەسێک سەرقاڵی ئیشێک بوو، مانەوەی پێویست نەبوو،، دایکی ڕاستی دەکردو دەبوایە بگەڕێتەوە بۆ ماڵ، مەگەر بونو نەبونی بۆ ئەوانیتر گرنگ بوو، مەنوچەر تازە لەشت کڕین گەڕابووە، دە پاکەت شیرینی کڕیبوو کە بەبڕوای خۆی زۆر زۆر بوو، بەڵام باوکەگیان دەیوت:

- هەرچی زیادەهات دەمێنێتەوە بۆ ئاهەنگەکەی فەرهاد،، فەرهادیش کۆتایی هەفتەکە ژن دەهێنێت!

شەقایق نەبوو، نەلەناو کۆمەڵی خانەوادە، نەلەژوور، نەلەچێشتخانە، نێرگس پلاوی لۆبیای بۆ نیوەڕۆ دروستکردبوو، مەنوچەر بەبێزارییەوە لەسوچێکی حەوشەکە تەماشای هاتوچۆی ژنو کچەکانی دەکرد، شەقایقی وەک کچی دراوسێکان دادەنا.

تەماشاکردنی شەقایق دڵرەفێن بوو، بەڵام بێ شەرمو زیادەڕەو نەبوو، ئەوانە دەڵێی مرۆڤیان بەسەیرکردنیان قوت دەدا، نۆکەریان بەسەر هەموو کوڕەکانەوە دەکرد هەڵبەتە کیومەرس ڕقی لێی نەبوو.

- ئاه، کەواتە ئەم شەقایقە لەکوێیە؟.. بۆچی لەناکاو دیار نەما!

نێرگس لەپاڵ مەنوچەر وەستاو بەهێواشی وتی:

- دەی بۆچی لێرە دانیشتوی؟

مەنوچەر سەری بەرز کردەوەو وتی:

- دایکە ئامۆژن لەماڵ نییە؟!

نێرگس وتی:

- نەخێر، بێچارە دەیزانی.. ، ئەم حاجی ژنە ئەوەندە بۆڵەی بەسەر شەقایقدا کرد کە ڕۆشتەوە بۆ ژوورەکەیان..

- نێرگس گیان چێشتەکە بهێنێت؟

نێرگس لەکاتێکدا بەرەو چێشتخانەکە دەڕۆشت بەهێواشی وتی:

- کاتێک کە حەوشەکە چۆڵبوو چێشتەکەت پێدەدەم ببە بۆی.

مەنوچەر لەژێر لێوەوە زەردەخەنەیەکی کردو لەدڵەوە سوپاسی دایکی کرد.

شەقایق لەسوچێکی ژوورەکە خەوتبوو، کینەیەک لەقورگیدا نەیدەهێشت چاوەکانی ئارام بگرێت، دەنگی دەرگا بەرزبووە، بەتوڕەییەوە هەستاو دەرگاکەی کردەوە، بەبینینی مەنوچەر دڵی خۆشبوو.

مەنوچەر بەخێرایی چووە ژوورەوەو دەرگای لەدوای خۆیەوە داخست، مەنوچەر بەگاڵتەوە:

- چییە حەسودیت لێ دێت میوانداریمان بۆ کردوم؟! دەتوانی تۆش بچیت بۆ سەربازیی!

شەقایق بەزۆر زەردەخەنەیەکی کردو، بەهێواشی:

- لەم چوار مانگەدا چەند لاواز بویی؟

مەنوچەر سینی چێشتەکەی خستە سەر پەنجەرەکەو وتی:

- ئیتر، هەمووان کە خەفەت دەخۆن قەڵەو دەبن منیش لاواز بوم..

چەند ساتێک بەبێدەنگی ڕۆیشت، ئینجا مەنوچەر وتی:

- بۆچی بەتەنیایی هاتوی لەژوورەوە دانیشتوی؟

شەقایق سەری کردە خوارو، بەڵام قسەیەکی نەکرد، مەنوچەر بەدەنگێکی وەکو بڵێی چییە؟.. وتی:

- کچێ، تۆ زۆر ئارامگری!.. ئەگەر من لەجێگەی تۆ بومایە کورتم دەهێنا.

لەگەڵ ئەوەی مەنوچەر قسەکەی کرد شەقایق دەستی بەگریان کرد، بەگریانەوە وتی:

- ئەگەر کوڕیش بومایە ئەمانە هەر بۆڵەیان بەسەرمدا دەکرد؟

مەنوچەر بزەیەکی خستە سەر لێوی‌و وتی:

- وا مەڵێ شەقایق، ئەگەر تۆ کوڕ بویتایە من بێ ژن دەمامەوە.

شەقایق ڕاستەوخۆ سەیری چاوانی مەنوچەری کرد کە بەشەیتانانەوە ئەبڵەقی بووە، پێکەنی.

شەو مونیرەو شەقایق لەسەر داوای پەروێز ڕۆیشتن بۆ میوانی، نێرگس بەپەروێزی وت:

- ئەگەر تۆ ئەم دایکەت ببەیتەوە سەرەوە هەموو ئیشەکان چارەسەر دەبێت، تا دوو ڕۆژ پێش ئێستا دەیوت لەسەرە مەرگدام، کەچی ئێستا لێرە وەستاوەو خۆی لەئیشی هەموو کەسێک هەڵدەقورتێنێت، پەروێز حاجی ژنی بانگ کردو بەهەر شێوەیەک بوو لەچێشتخانەکە بردییەدەرەوە، خەیاڵی مونیرەش ئاسودە بوو، حەزی نەدەکرد لەلای دراوسێکانی خۆی

پێبکەنێت بەرامبەر قچە چزودارەکان، ژنی مامە ئیسماعیل زۆر خۆشحاڵبوو.

بەردەوام باسی بوکەکەی دەکرد، خۆ ئێستا بوکەکە لەبن دەستیدا دانیشتبوو، بەڵام ئەو وازی نەدەهێنا، ژنەکەی فەرهاد گەرچی دەموچاوێکی دڵگیری هەبوو، بەڵام ڕەفتارکردنی نەدەچووە دڵەوە، مونیرە بەشەقایقی وت:

- جگە لەشاییەکەی فەرهاد کە کۆتایی هەفتەکەیە، کەوتوینەتە شاییەکی تریشەوە!

شەقایق بەسەرسامییەوە پرسی:

- شایی کێ؟

- فەریبا!

شەقایق بەخۆشحاڵییەوە:

- ئا، چەند بێدەنگە؟!

بەو جۆرەی بیری لێدەکردەوە زاواکە ئەو دراوسێیەی ماڵ پورە مەنیجەیە، بەڵام پرسی!

- ئێستا زاوا کێیە؟

مونیرە وتی:

- برازای کاک ئەحمەد!

شەقایق بەسەرسامییەوە بەخۆی وت:

- دەی بەسەرهاتی دراوسێکەیان چی لێهات؟.. خۆ فەریبا زۆری خۆشدەویست؟!

"٢١"

- ئا، شەقایق ئەمڕۆ ڕۆژی لەدایک بونت بوو.

- بەڵێ، دایکە ڕۆشتمە هەژدەساڵیەوە!

مونیرە بێدەنگ بوو، ساتێک بیری لەرابردو کردەوە، قسەکانی ئیرەجی هێنایەوە بیری خۆی کە ڕۆژانی کۆتایی پێش مردنی داوای لێکردبوو کە شەقایق لەبیرنەکات، سوپاس بۆ خودا تائێستا کەموکوڕی نەنواندوە، دوای مردنی ئیرەج چەندین داواکاری هەبوو، کەچی هەموویانی ڕەتکردەوەو لەگەڵ شەقایقدا سوتاو دروستبوو.

ئێستا شەقایق تەمەنی هەژدە ساڵە، بەڵام لەشی بچوکو شۆخی تەمەنی کەمتری پیشانی دەدا، شێوەی دڵرفێنی کچەکەی بەتەواوی وەک خۆی بوو، مونیرە دەیزانی کە مەنوچەر دڵدۆڕاوی کچەکەیەتی، لەبەرئەوەی کە مەنوچەر بەکڕینی دیارییەک بۆ شەقایق مونیرەی خستبووە بیری ڕۆژی لەدایک بونی کچەکەی، ئەگینا ئیشوکارەکانی ڕۆژانە مۆڵەتی مونیرە نادات لا لەئەم ئیشانە بکاتەوە.

لەرویەکی ترەوە مونیرە بەم خۆشەویستیە خۆشحاڵ بوو، چونکە یەکەم خۆشەویستییەکە دولایەنە بوو، دووەم مەنوچەر کوڕێکی باشو لەسەرڕێ بوو، واتە لەکیومەرس شایستەتر بوو، خۆ فەرهاد دیارنەبوو لەوانەیە دوای ژنهێنان بەراستی باش بێت.

مونیرە هاتەوە سەرخۆی، شەقایق لەبەردەم ئاوێنەکە وەستابوو قژی شانەدەکرد.

مونیرە بەهێواشی وتی:

- باشە، ناتەوێت دیاریەکەت بکەیتەوە؟

شەقایق بەقسەکەی مونیرە سوربووەو بەئارامی ئاوڕیدایەوە، مونیرە بەپێکەنینەوە وتی:

- زوبە ئیترا!

شەقایق لەکاتێکدا بەرەو کۆمەدیەکە دەڕۆیشت بەخۆی وت:

- دایکم لەکوێ زانیویەتی کە مەنوچەر دیاری بۆ کڕیوم؟!

- باشە بیکەرەوە ئیترا!

شەقایق پاکەتەکەی هێواش‌و بەوردی کردەوە، سندوقێکی بچوک بوو، سندوقەکەی کردەوە،، بەبینینی ئەو شتەی کە لەسندوقەکەدا بوو هەم توڕەبوو هەم کەوتە پێکەنین.

مونیرە بەسەرسامییەوە:

- چییە؟ ناو سندوقەکە چی تێدایە؟

شەقایق هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی:

- وای بەحاڵت مەنوچەر، دەتکوژم.

دەنگی دەرگاکە بەرزبووە، مونیرە هەستاو دەرگاکەی کردەوە، شەقایق خێرا خۆی کۆکردەوە، مەنوچەر بوو بەبینینی مونیرە ئاگای لەخۆی نەما.

- سڵاو ئامۆژن! تۆ.. لەماڵیت؟

مونیرە بزەیەکی کردو وتی:

- بەڵێ مەنوچەر گیان خاوەن ئیشەکەمان ژنی بۆ کوڕەکەی هێنابوو، لەبەر ئەمە، ئەمڕۆ کارگەکە داخراوە.

مەنوچەر ویستی خواحافیزی بکات، بەڵام مونیرە زانی ئیشی بەشەقایق بووە، بەم بۆنەیەوە بانگیکردە ژوورەوەو خۆی بۆ هێنانی چا لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە.

مەنوچەر بەدەستە پاچەیی وتی:

- شەقایق بۆچی پاکەتەکەت لەبەردەم دایکتدا کردوەتەوە، دایکت نەیوت کێ دیاریەکەی پێداویت؟

شەقایق بەتوڕەییەوە وتی:

- مەنوچەر ئەمە چییە؟

مەنوچەر بەدەنگێکی هێواش پێکەنیو بەپێکەنینەوە:

- ئەوە بۆ منداڵەکەمان کڕیومە، بەڵام وتم ئەگەر خۆشت گریایت خراپ نییە بۆت!

شەقایق بەتوڕەییەوە:

- ئا.. ئا.. ڕودار زڕزڕەی بۆ کڕیوم!

مەنوچەر دەستی نیشانەی بێدەنگی خستە سەردەمیو لەکاتێکدا بەهێواشی پێدەکەنیو وتی:

شەقایق ئامۆژنیش بینی؟

- نە، زۆر هونەرت نواندوە، شێت، ئەگەر پیشانم بدایە ئابڕوت دەڕۆیشت.

مەنوچەر وتی:

- زۆر باشە، بابە بمبەخشە.. گاڵتەبوو دەمویست کەمێک پێکەنیو پاشان لەژێر کراسەکەی پاکەتێکی تری دەرهێناو، بەهێواشی وتی:

- ئەمە ئیتر ڕاستی دیاری لەدایکبونتە.

شەقایق بەتوڕەییەکەوە تەماشای لاکەیتری کردو وتی:

- نامەوێت.

مەنوچەر وتی:

- گاڵتە مەکە ئێستا ئامۆژن دێت..

شەقایق بەهەمان ئاواز:

- من دیاریی تۆم ناوێت، پێشکەشی خۆت بێت!

پاشان بەشێوەی چییە؟.. وتی:

- لەوانەیە ئەم جارە شوشەی شیری منداڵت کڕیوە.

مەنوچەر بەزۆر پێکەنینەکەی ڕاگرتو، ڕاستگۆیانە وتی:

- نە، بەخودا، ئەمە ئیتر بەڕاستی دیاری لەدایکبونتە.. ئەگەر وەرینەگریت زویردەبم.

شەقایق سەیرێکی دەموچاوی مەنوچەری کردو پاشان دەستی بۆ وەرگرتنی دیاریەکە برد، مەنوچەر دەستی کێشایە دواوەو وتی:

- وریای؟!.. سەرەتا پێکەنە تابیدەم بێت.

شەقایق بەڕاستی پێکەنی، مەنوچەر پاکەتەکەی دایە دەستیو لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە، مونیرە بەسینی چاوە هاتەژوورەوە.

- ئا! مەنوچەر ڕۆشت؟

شەقایق وتی:

- بەڵێ، تۆ چەند دواکەوتی؟

عەسر بوو وەحید لەگەڵ ژنو منداڵەکانیدا ئەمشەو لەماڵ مامە ئیسماعیل بوو.

- دایکە تاقەتم نەماوە بابڕۆین بۆ ماڵی نەنەگیان.

مونیرە کە خەریکی دورینی جل بوو سەری بەرزکردەوەو سەیری شەقایقی و وەگ بلێی ئەویش چاوەڕێی ئەم پێشنیارەبوو، جلەکانی خستە لایەکەوەو وتی:

- ڕاست دەکەیت، هەستە بابڕۆین بۆ ئەوێ.

هەردوکیان ئامادەبون، لەکاتی چونەدەرەوە لەژوورەکە شەقایق چاوی بەمەنوچەر کەوت، لەپشت پەنجەرەکە دانیشتبوو تاشەقایقی بینی، جێگۆڕکێی کردو بەهیماکردن سەری لەقاندن پرسی:

- بۆ کوێ:

لەهەمانکاتدا ژنی مامە ئیسماعیل لەژوورەکە دەرچوو.

- بۆ کوێ عەبات لەبەرکردوە، دراوسێ؟

ژنی مامە ئیسماعیل ئەو کاتانەی دڵخۆش دەبوو مونیرەی بەدراوسێ بانگ دەکرد.

مونیرە وتی:

- ئەمەوێت بڕۆین سەرێک لەماڵ دایکم بدەین.

دوای ڕۆشتنی شەقایقو مونیرە، مەنوچەریش نەیتوانی لەماڵ بوەستێت لەماڵ ڕۆیشتەدەرەوە.

نەنەگیان وەک هەموو ساڵێک کەرەستەی ترشیاتی کڕیبوو، سادقیش لەپاڵ دەستیدا دانیشتبوو بەردەوام نینۆکی دەدا لەگوڵی کەلەرمەکە، هەمیشە کە شەقایقو سادق چاویان بەیەک دەکەوت، خۆیان بەکارێکیترەوە سەرقاڵدەکرد..

ئەمجارە شەقایق بەبیانوی هەوا گۆڕینەوە چووە حەوشەکە، چێژی وەردەگرت، لەبێدەنگی ماڵی نەنەگیان، چونکە لەماڵی خۆیان تەنیا دەنگەدەنگ بووە، بێجگە لەمەش هێشتا دیارییەکەی مەنوچەری نەکردبووە، پاکەتەکە مەخمەڵە ڕەنگ سورەکە ملوانکەیەکی جوانی تێدابوو، شەقایق لەخۆشیدا ئاهێکی هەڵکێشا.

- باشە تۆ چی دەکەیت سادق؟

- باشم پووره!

دایکت چی دەکات، خۆ من سەرم زۆر قاڵە هیچ ئاگایەکم لێی نییە.

- خراپ نییە.

نەنەگیان بەسادقی وت:

- بڕۆ بانگی شەقایق بکە بابێت چا بخوات.

سادق هەستا، حەزیدەکرد لەبەردەم پوریدا شتێک بڵێت، بەڵام لەدەستی نەنەگیان بەتەواوی تورەبوو، خۆ نەنەگیان دەیزانی ئەو لەگەڵ شەقایقدا هاورێتی باش نییە.

شەقایق لەپاڵ دار هەنارەکە بوو، سادق سەرسام کە شەقایق سەیری چی دەکات، وردبین بوو، شەقایق ئاگای لەسادق نەبوو کە لەپشتەوە سەیریدەکرد، بەجولانی گەڵاکان شەقایق هاتەوە بەخۆیدا، سەرەتا تەماشای سەرەوەو ئینجا تەماشای پشتی خۆی کرد، سادق پێکەنینێکی توانجئامێزی کردو ئەبڵەقی شەقایقو پاکەتەکە بوو، شەقایق وەک مناڵ پاکەتەکەی لەپشتی دەستی شاردەوە.

بەهێواشییەک کە تورەیی تێیدا شەپۆلی دەدا وتی:

- فێرنەبوی وەک مرۆڤ ببیت؟!

سادق چەمایەوەو لەژێر دارەکە لاچوو، پاشان بەرامبەر شەقایق وەستاو وتی:

- گیانی من ئەمجارەیان درۆ مەکە، ئەمە کێ بۆی کریوت؟

شەقایق بەنیگەرانییەوە:

- دایکم!

سادق بەگاڵتەپێکردنەوە سەیریکردو وتی:

- برۆ ژوورەوە، نەنەگیان چای بۆ کردویت.

پاشان لەماڵ ڕۆیشتنە دەرەوە، شەقایق پاکەتەکەی بەقینەوە خستە ناو جانتاکەی‌و چوەژوورەوە، شەو بەقسەی نەنەگیان، مونیرەو شەقایق لەوێ مانەوە.

"٢٢"

حاڵی حاجی ژن حاڵی زۆر خراپ بوو، هەر شەوێک یەکێک لەبوکەکان لای دەخەوتن ئەڵبەتە بێجگە لەمونیرە، بەڵام ئەویش لەئیشەکاندا هاوکاریدەکرد، باوکەگیان وەکو مریشکی سەربڕاو لەکونجی ژوورەکە بەکزی دانیشتبوو، ئەویش بێ چێشت بوو، نەخۆشییەکەی حاجی ژن ئەویشی غەمبارکردبوو.

مەنوچەر هەموو ڕۆژێک دەڕۆیشتە سەرکار، پەروێز ئیشێکی یەک تاقی لەکۆمپانیاکەی خۆیان بۆ دۆزیبووە، بەڵام کیومەرس تانیوەڕۆ دەخەوت.

کاتێکیش کە هەڵدەستا لەماڵ نەدەمایەوە، ئەو پیاوی ئیشکردن نەبوو، نەپیاوی ژیان، ببووە سەربازی هەڵاتوو مامە ئیسماعیل زۆر لەدەستی خەفەتی دەخوارد، لەدەستی کیومەرس دەساڵ چووبووەسەر تەمەنی، کەچی ئەعزەم زۆر بێخەیاڵ بوو، قسەی دەکرد پێدەکەنی‌و، هەندێ کاتیش دەیوت:

- بەقەبری باوکی، بەمن چی کە ناڕوات بۆ سەربازیی.

فەرهاد ڕۆشتبووە بەردەستی مەڵ مەرزبدا گەورەکەی‌و بەتەواوەتی چەسپیبوو بەئیشێکەوە، نابێت لەڕاستی ڕابوێری ژنەکەی کردییە پیاو، بەتوندی لەبەردەمی وەستاو کە خۆڕایخۆری قەدەغەیە! سوپاس بۆ خوا بەتەواویی چاکبوو.

شەقایق تازە لەنانەواخانە گەڕابووە، مونیرە بڕیاریدابوو بۆ شەو کوکی سەوزە دروستبکات، لەو کەشوهەوا ساردەدا مەنوچەر خەریکی پیاسە بوو، هەرکە چاوی بەشەقایق کەوت مۆنیەکانی خستەسەریەک، ڕۆیشتە سەر هەیوانەکەو لەلای دەرگـای ژوورەکـەی ئـەوان وەسـتـا، شـەقایق لەپلەکانەکان هاتەسەرەوە:

- سڵاو، بۆچی لێرە وەستاوی، ئامۆژن لەماڵ نییە؟

- مەنوچەر سەیریکردو بەتوڕەییەوە:

- نەخێر ئیشم بەتۆ بوو..

پاشان بەگاڵتەجاڕییەوە بەردەوامبوو:

- چاوەڕێت بووم.

شەقایق کلیلەکەی دەرهێناو دەرگای ژوورەکـەی کردەوە، بەخوێن ساردی پرسی:

- چی بووە؟

مەنوچەر بەدەنگێکی هێواش‌و ئاوازێکی کیناوییەوە:

- لەکوێ بووی؟

- لەنانەواخانە..

- بۆچی ڕۆشتبوی؟

شەقایق پێکەنینێکی کورتی کردو وتی:

- باشە، بۆ ئەوەی نان بهێنم.

مەنوچەر بەتوڕەییەوە:

- دوو ڕۆژە ڕۆیشتوم بۆ ئیش، تۆش وێڵ بویت، باش بۆ خۆت دەسوڕێیتەوە!

شەقایق چووە پێشەوەو بەتوڕەیی ئەبڵەقی بوو، پێکەنینێکی

توانجئامێزی کردو وتی:

- بەتۆ چی؟

مەنوچەر دەستی بەرزکردەوە، شەقایق بەرقەوە تەماشایەکی کردو بەتوڕەییەوە:

- تۆ سەری پیازی یان قنجی پیازی لێم توڕەدەبیت؟!.. تۆزێک بەدەمتەوە پێکەنیم، بۆ وا ڕودار بویت.

مەنوچەر توڕەتر لەو وتی:

- مەهێڵە ئەو لا سەگەم بەرزبێتەوە.. شەقایق ببمە سەگ ئیتر کەس پێشم ناگرێت ها!

شەقایق ئەمجارە بەبێچارەیی‌و داماوییەوە:

- ئاخر کاتێک نانم دەوێت چی بکەم، بەخوا بەکیومەرسم وت،، وتم بڕۆ نانم بۆ بهێنە.. پێکەنی‌و وتی: بیدە بەمەنوچەر بۆت بهێنێت.

مەنوچەر وتی:

- باشە، ئارامت بگرتایە تامن بێمەوە.

شەقایق وتی:

- باشە ئێستا ڕۆیشتمو هێنام، ئێستا دەڵێی چی بکەم، من دەبێت لەبەر هەموو ئیشێک مۆڵەتی فەرمی وەربگرم؟

مەنوچەر وتی:

- پێویست ناکات بەزمانی قەڵەم لەگەڵم بدوێی، لەمە بەدواوە هەر کارێک ویستت بیکەیت بەمن بڵێ،، نامەوێت منەتی ئەو کوڕە زەبەلاحە هەڵبگریت.

شەقایق زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- بەسەرچاو، ئیتر چی؟

مەنوچەر بەئاراميیەوە:

- بمبەخشە ئەگەر..

شەقايق قسەکەی پێبڕیو وتی:

- نان دەخۆیت؟

- نەخێر، خەفەتم خواردوە، تێرم!

بەيانی ڕۆژی هەينی دوای ڕۆيشتنی مونيرە، شەقايق لەخەو هەستا، بێزاربوو، کتێبێکی نيوە خوێندراوەی هەبوو، بەڵام ئەوەندە تەمەڵبوو کە توانای خوێندنەوەی نەبوو، دڵی بەتەواوەتی گيرابوو، سەرما هەمووانی لەماڵ نابوو، تەنانەت کيومەرسيش لەژوورەکە نەدەهاتە دەرەوە.

بەقسەی پەروێز سەرماکەی لێرەبوو، بەفرەکەی لەو سەرانە.

دەنگی دەرگای حەوشە بەرزبووە، مەنوچەر وەک هەورەبروسکە لەجێگەی خۆی هەستاو حەزی نەدەکرد شەقايق دەرگاکە بکاتەوە، چەند سائێک ڕايبورد شەقايق کتێبی دەخوێندەوە کتێبەکەی دەخستەلاوە، لەدەرگای ژوورەکە درا، شەقايق هەستاو دەرگاکەی کردەوە، بەبينينی فاتمە ئەوەندە خۆشحاڵ بوو کە قيژەيەکی کورتی کرد.

مەنوچەر خێرا بەرەو ژوورەکەی خۆيان ڕۆيشت، کاک ئەحمەديش سڵاوو هەواڵپرسييەکی کورتی کردو بەخێرايی ئەوێی جێهێشت.

شەقايق بەسەرسامييەوە:

- خۆت تەنيای، دەی پورێ لەکوێيە؟!

فاتمە وتی:

- دایکم ڕۆیشت بۆلای فەریبا، وەک ئەوەی خەریکە دەبمە پوور، فەریبا حاڵی باش نییە.

- کەواتە چۆنبوو هاتی بۆ ئێرە؟

باوکم ویستی بمبات بۆ لای نەنەگیان وتم ناڕۆم،، شەقایق دەزانی تاقەتی ئەو سادقە خۆبەزلزانەم نییە، یەک وشە چییە لەگەڵ کەس قسەناکات.

شەقایق بەرەو لای سەماوەرەکە ڕۆیشتو وتی:

- باوەڕناکەیت، من ئێستا سێ مانگە نەمبینیوە! دوایەمینجار کە بینیم ڕۆژی لەدایکبون بوو.

فاتمە بەسەرسامییەوە:

- واتە نەنەگیانیشت سێ مانگە نەبینیوە؟

شەقایق تەماشایەکی بەمانای فاتمەی کردو وتی:

- ئاخر کچی کەمبیر مەگەر هەفتەی پێشو ئێمە لەوێ نەبوین،، بەراست فاتمە تاکەی لێرەیت؟..

فاتمە بەپێکەنینەوە:

- مەترسە دوو سێ سەعات لێرەم.

شەقایق وتی:

- دوبارە ڕەنجدانە، بەخودا خەریکبوو لەتەنیایدا دیقبکەم.

فاتمە ساتێک بێدەنگبوو، پاشان پرسی:

- ئەم کوڕە کێبوو؟ کیومەرس وا باسی دەکەیت ئەمەیە؟

شەقایق پیاڵە چاکەی خستە بەردەم فاتمەو وتی:

- نەبابە، مەنوچەر بوو، کیومەرس لەماڵ خۆیان لەژێر لێفەدایە!

فاتمە بەچەتونییەوە وتی:

- شەقایق دەڵێم زۆر جوانە، وا نییە!

شەقایق هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا:

- خەریکە شێتم دەکات بۆ ڕاست دەڕۆم، بۆ چەپ دەڕۆم دەڵی بۆچی وادەکەیت؟.. بۆچی قژت بەدەرەوەیە؟.. بۆچی ئەم جلەت لەبەردایە؟.. بۆچی پێدەکەنیت؟ بۆچی مۆنەت کردوە؟..

فاتمە وتی:

- باشە خۆشی دەوێیت، ئیترا!

شەقایق بەگاڵتەوە:

- هەمووان لەم درۆیانە دەکەن.. خۆشم دەوێیت!.. لەبەر خۆت ئەم قسانە دەکەم.

فاتمە ئاهێکی هەڵکێشاو بەئاوازێکی خەفەتبارییەوە وتی:

- ڕاست دەکەیت، وەحیدیش هەمیشە ئەم قسانەی بۆ فەریبا دەکرد، بینیت کۆتاییەکەی چی لێهات..

شەقایق وەکو دەستلێوەشێنراو دەستبەجێ هاواریکرد:

- ئەمە، من هەمیشە دەمویست لێت بپرسم چی بوو کە فەریباو وەحید لەگەڵیەک زەواجیان نەکرد، بەڵام لەبیرم دەچوو، کە فەریبام دەبینی دەکەوتەوە بیرم، بەڵام لەڕوم نەدەهات قسەیەک بکەم.

فاتمە وتی:

- هیچ، ئەم وەحیدە سێ ساڵ فەریبای خەڵەتاند، نامەی داو قسەگەلێکی باش باشی کرد.. لەبیرتە کە فەریبا دەیوت وەحید سەددانە وەحید لەدەمی دەکەوتە خوار، بەڵام ڕۆژێک دەنگی لێیدەو بیگرە لەماڵیان بەرزبووە، تا ئێمە زانیمان بەسەرهاتەکە چیبووە وەحید ژنی هێنابوو، ڕۆشتبوو.. هاوکات کوڕەکەی

مامم هاتبوو بۆ خوازبینی فەریبا، فەریباش ڕازیبوو، هەڵبەت کاک هاشم سەدجار لەوەحید باشتربوو، بەرەوشتتر لەوەحید، بێ چاوو ڕوو، زۆر دادەمی خۆشدەویست.

شەقایق وتی:

- تۆ چا دەخۆیت من بڕۆم میوەت بۆ بێنم.

کاتێک شەقایق بەسەبەتە میوەکەوە گەڕایەوە بۆ ژوورەکە فاتمە لەبەردەم پەنجەرەکە وەستا بوو، بەهێواشی وتی:

- شەقایق دەڵێم باوکت زۆر جوان بووە، ها!

شەقایق بزەیەکی کردو وتی:

- بەڵێ، ڕاستی دەزانی بۆچی دایکم ئەوەندە مەنوچەری خۆشدەویێت؟ لەبەرئەوەی لەباوکم دەچێت!

فاتمە بەسەرسامیەوە:

- بەڵێ، ڕاستدەکەیت ئەم کوڕە شێوەی چەند لەباوکت دەکات! من وتم بۆچی ئەم کوڕە ئەوەندە شێوەی دەناسم، مەڵێ وەک باوکت.

فاتمە لەتەنیشت شەقایق دانیشتو وتی:

- تۆ زۆر نهێنی دەشاریتەوە؟

شەقایق بەسەرسامییەوە چاویبڕییە فاتمە، فاتمە بەردەوامبوو:

- تۆ ئاگاداری هەموو نهێنیەکانی ئێمەیت، بەڵام خۆت یەک وشەت لەبارەی ئەم مەنوچەرەوە پێ نەوتین.

شەقایق زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- خۆ تۆ دەبێت باشتر بزانیت ئەویش لەو قسە بێمانایانە دەکات، هەر دەڵێت دەمەوێت بتهێنم، نازانم، تۆ سەرەتاو کۆتایی

هەر دەبێت ببێتە ژنی من، بەڵام من هەرگیز نییە بۆم.

فاتمە وتی:

- جارێک دایکت بەدایکمی وت کە مەنوچەر تۆی زۆر خۆشدەوێت،، من لەخوام دەوێت کوڕێکی وەک مەنوچەر ببێتە توشمەوە پاکو ڕاستگۆ بەڕاست ڕات بەرامبەر سادق چییە؟

شەقایق بەتوڕەییەوە:

- ئەو دەبێت سەری بخاتە زەوی‌و بمرێت، بەجۆرێک مۆنەدەکات دەڵێی دەمەوێت قوتی بدەم.

فاتمە وتی:

- شەقایق شتێک هەیە دەیزانی.. کچێک هەیە دراوسێی ماڵ نەنەگیانە، هەر کاتێک سادق دێتە حەوشەکەوە ئەمیش دەڕواتە سەربان، وابزانم حەز لەسادق دەکات، یان لەوانەیە سادق ئەوی خۆشبوێت.

شەقایق سەرسامانە وتی:

- بەڵێ، دەبینم هەندێ کات سادق دەچێتە سەربانەکە، دەی بڵێ دڵی کوڕەکەم بەدیل گیراوە!

فاتمە پێکەنی‌و وتی:

- لەگاڵتە دەرچووە، ئەم سادقە زۆر نەفامە، بۆ کڵاونانەسەر گیانی دەردەچێت، جارێک پورە "ملوک" لەگەڵ کچەکانیدا هاتبون بۆ ماڵی ئێمە، کچەکانی پورم زۆر ناشرینن سادقیش هات بۆ ماڵمان، ئەو شەوە بڕیاربوو بێت بۆماڵمان، نازانیت هەرکە هات‌و بینی کە پورە ملوک لەوێیە دوو پێی هەبوو دوانیتری بۆ قەرزکردو ڕۆیشت، پورم لەو ژنانەیە کە هەر بەدوای کوڕدا دەگەڕێت بۆ کچەکانی‌و، بەدەم پێکەنینەوە وتی:

- سادق وەرە لێرە دابنیشە بزانم.

سادق وەک چەوەندەری سورەبوی لێهاتبوو، سەری کردەخوارو بەدەنگێکی هێواش وتی: زۆر سوپاس من دوای دێمەوەو لێیداو ڕۆیشت، پورە ملوک سادقی زۆر خۆشدەویست، تادرەنگانێکی شەو لەگەڵ دایکم هەر باسی سادقی دەکرد، تا لەکۆتایدا دایکم هیلاکبوو وتی:

- ملوک گیان سادق شەرمنە، واناوزانم ئیتر لەم دەورە دەرکەوێت.

پورە ملوک مۆنەی کردو تاکاتی ڕۆیشتن قسەیەکی نەکرد، فاتمە لەکاتێکدا پێدەکەنی وتی:

هەر کاتێک پورمو کچەکانی دێن بۆماڵی ئێمە کچە گەورەکەی پورم "مەعسومە" هەر پێم دەڵێت فاتمە دەی براکەت کەی دێت؟

تاعەسر کاک ئەحمەد هات بەدوای فاتمەدا، هەردوکیان قسەیان دەکردو پێدەکەنین، مەنوچەر زۆر توڕەبوو، حەزیدەکرد کچە پورەکەی شەقایق هەرچی زوترە بڕوات، چونکە تاقەتی نەمابو لەتەنیاییدا.

بەڕاستی ئەم پەندە ڕاستە کە دەڵێت دوای هەموو پێکەنینێک گریانە، چەند خولەکێک دوای ڕۆیشتنی فاتمە دەنگی شیوەن و هاواری پەروین بەرزبووە، شەقایق بەترسەوە لەژوورەکە هاتەدەرەوە، مەنوچەر بەغەمباریەوە بەرەو ڕوی ڕۆشت، شەقایق بەهەراسانی پرسی:

- چی بووە مەنوچەر؟ مامە ساڵح شتێکی لێهاتووە؟

مەنوچەر سەیرێکی کردو بەئارامی وتی:

- حاجی ژن مرد.

شەقایق بەتوندی دای بەناو دەمی خۆیداو هەر لەویدا ڕێک وەستا.

شەقایق یەکەمجاربوو دڵی بەحاڵی باوکەگیان دەسوتا، بەغەمباریو داگیراوی لەکونجی ژوورەکە دانیشتبوو دور لەدەنگەدەنگو هاوارو دادی بوکەکان دەگریا.

کاتێک مونیرە گەیشتە سەر کۆڵانەکە، بەبیستنی دەنگی قورئان تەواویی لەشی هاتەلەرزین، بەهیلاکییەوە بەرەو ماڵ ڕایکرد، ماڵەکە لەزۆری خەڵکدا شوێن نەبوو، خەدیجە خانم دراوسێی دیواربەدیواری ماڵ باوکەگیان بەبینینی مونیرە هاتە پێشەوەو وتی:

– توخوا مونیرە گیان تۆ ئیتر فێڵ مەکە! من بەتەنیا خەریکم دەمرم، وەرە یارمەتیم بدە..

"٢٣"

پەروێز بەدەموچاوێکی تورەوە ئەبڵەقی مەنوچەر بوو وتی:

– هەر ئەوەیە کە سەرەتا وتم...من لەبەر تۆ لای پیاوو ناپیاو سەردادەنەوێنم، ئەوکات تۆش دەڵەیتکەنەمن نارۆم..! تۆ هەڵەدەکەیت.

نێرگس دەستی خستە سەردەمیو بەهێواشی وتی:

– پیاوەکە جوان نییە، نزمتر قسە بکە!

پەروێز تورەبوو بەقینیەوە وتی:

– هەر ئەمەیە تۆ هەمیشە پشتگیری دەکەیت کە کوڕەت لەسەر من وەستاوە!

مەنوچەر بەئارامییەوە:

- ئاخر باوکەگیان من دەڵێم هەر لێرە خەریکم ئیش دەکەم ئیتر..!؟

پەروێز هەستاو چەند هەنگاوێکی هەڵگرتو وتی:

- کوڕم بۆچی تێناگەیت، ئەم موچەیەی کە تۆ هەتە لێرە بەم هەموو سەگراکردنە وەری دەگریت، لە کەرەج دوو ئەوەندە وەردەگریت، تازە لەوێ لەپشت مێزێکەوە دادەنیشیتو دەبیتە کاکە، ئێستا هەر بڵێ نە! لێرە دڵت خۆشە موچەت هەیە.

پاشان بەئاوازێکی گونجاوتر بەردەوام بوو:

- کوڕم تۆ لەوێ بەدوو ساڵ دەتوانیت خۆت بگریتەوە، خانوو دەکڕیت، پاشان.. ژن دەهێنیت!

مەنوچەر ئیتر قسەیەکی نەکرد، ڕاستتر نەیوێرا قسەیەک بکات، بەڵام لەناخی دڵیدا هەزار قسەی هەبوو بۆ وتن، حەزی لێنەبوو بڕوات بۆ کەرەج، ئامادەبوو ئەم موچەیە وەربگرێت، بەڵام لەتاران بمێنێتەوە، ترسو نیگەرانی ئەو زیاتر بۆ شەقایق بوو، بەڵام شەرمی دەکرد ڕاستی نیگەرانیەکەی بەباوکی بڵێت.

بەڕێکەوت ماوەیەک پێش ئێستا لەکاتی پرسەکەی حاجی ژندا یەکێک لەدراوسێکانیان خوازبینی شەقایقی لەمونیرە کردبوو، مەنوچەریش لەسەر ئەم بابەتە زۆر هەستیاربوو، هەر کەزانی ڕۆیشت بۆلای شەقایق، لەکاتێکدا کە شەقایقی بێچارە لەو بەسەرهاتە ئاگادارنەبوو، بەڵام مەنوچەر وتبوی:

- ئامۆژن گیان بەژنە دراوسێکەی وتووە تا خزم هەبێت شەقایق نادەم بەبێگانە.

مەنوچەر کەمێک خەیاڵی ئاسودەبوو، بەڵام ئێستا قسەی کەرەجو دوورکەوتنەوە لەشەقایق هاتبووە پێشەوە.

ئاسمان هـەور بـوو، لـەدار هەنجیرەکەوە دەنگی چۆلەکە دەهاتو ناوبەناو با هەڵیدەکرد، لەدوای مردنی حاجی ژنەوە ئیتر شەقایق جلەکانی باوکەگیانی دەشـۆرد، مەنوچەر چەند ڕۆژێک دەبوو کە زۆر تەمەڵبوو، شەقایق ئاگای لەڕۆیشتنی مەنوچەر بۆ کەرەج نەبوو.

- مەنوچەر..

مەنوچەر لەجیهانی خۆیدا بوو، یەکسەر وەک واقرومان چاوی بەشەقایق کەوت.

- مەنوچەر وەرە سەرێکی ئـەم لێفەیە بگرە، دەمەوێت بیـخـەمـەسـەر پـەتـەکـە.. مـەنـوچـەر لـەئـاوازە منـاڵانـەکـەی زەردەخەنەیەکی کردو بەئەبڵەقی سەیری کرد.

شەقایق وتی:

- مەنوچەر چەند ڕۆژێکە بێزار دیاریت، چی بووە؟

دەموچاوی مەنوچەر چوبوبەیەکداو بەهێواشی وتی:

- دەمەوێت بڕۆم بۆ کـەرەج، من نامەوێت، باوکم دەڵێت دەبێت بڕۆیت بۆ کەرەج.

شەقایق بەرامبەر مەنوچەر وەستاو پرسی:

- کەرەج؟.. ئەوێ لەبەرچی؟!

- بۆ ئیشوکارکردن.

شەقایق وتی:

- ئێستا بۆچی ناڕەحەتی، کـەرەج خۆ هەنگاوێک لەتاران دورە!

مەنوچەر قسەکەی پێبڕی‌و وتی:

- وابڕیارە لەوێ بمێنمەوە.

شەقایق سەرسامانە وتی:

- ڕاست دەکەیت؟!

مەنوچەر ڕاستەوخۆ تەماشی کردو وتی:

- چییە؟.. خۆشحاڵ بویت!

- گاڵتە مەکە مەنوچەر، دەتەوێت بەڕاستی.. بەڕاستی دەتەوێت لەوێ بمێنیتەوە؟..

- هاوڕێیەکی باوکم لەوێ کارگەی هەیە، لەکەرەج، کەسێکی دەوێت بۆ ژمێریاریی کە لەبەردەستیدا بێت، باوکم پەیمانی منی پێداوە..

مەنوچەر سەری کردەخوارو بەچەتونییەوە وتی:

- تۆ دڵت تەنگ نابێت بۆم؟

شەقایق بەگاڵتەجاڕییەکەوە:

- لەخۆتەوە دڵم بەم قسانە مەکەرەوە، بابە.

کیومەرس ماوەیەک بوو کە لەپشتی پەنجەرەکە سەیری ئەو دوانەی دەکرد، بێمەبەست پەنجەرەکەی کردەوەو بەدەنگێکی بەرز وتی:

- سڵاو، ئێمە لەم ماڵەدا لەیلو مەجنونیشمان نەدەزانی؟!

مەنوچەر لەژێر لێوەوە وتی:

- دوبارە ئەم قیتنەیە دەرکەوت.

- کەی دێیتەوە؟

- نازانم، هەر کاتێک ئەوان مۆڵەتیان پێدام من لێرەم.. بەڵام باوکم وتی ئێمە زیاتر دێین بۆ سەردانت.

شەقایق هێوا هێواش وتی:

- خۆزگە..

بەڵام قسەکەی بەنیوەی بڕی.

مەنوچەر چەند کتێبێکی لەجانتاکەی دەرهێناو وتی:

- ئەمانەم بۆ تۆ کڕیوە، کاتی بێئیشی بیخوێنەرەوە.

دەنگی پەروێز قسەکەی مەنوچەری بڕی.

- وەرە مەنوچەر.

شەقایق بەهێواشی وتی:

- خوات لەگەڵ..

دەنگێکی لاواز لەقوڕگی مەنوچەرەوە هاتەدەر:

- خۆشم ئەوێیت شەقایق!

قسەکەی مەنوچەر گەرچی وەکو ئاه، ئارام بوو، بەڵام وەکو هاوارو ئازاردەری قوڵ لەدڵی شەقایقدا شوێنی گرت.

دوانزە ڕۆژ بەسەر ڕۆیشتنی مەنوچەردا ڕایبورد، هەموو ئەو کتێبانەی مەنوچەر پێش سەفەرکردن پێی دابوو، شەقایق خوێندبویەوە.

نزیکی نیوەڕۆ بوو، لەدەرگا درا، شەقایق دەیویست بڕوات دەرگا بکاتەوە، بەڵام لەترسی ئەوەی نەوەکو مەنوچەر لەپشت دەرگاکەوە بێت لەشوێنی خۆی دانیشت، مەنوچەر حەزینەدەکرد شەقایق دەرگای ماڵ بکاتەوە.

لەکۆتایدا کیومەرس بۆ کردنەوەی دەرگاکە لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوە.

شەقایق لەپشت پەنجەرەکەوە سەیری حەوشەی دەکرد، مونیرە بوو، دەموچاوی بەهەراسانی دەهاتە پێشچاو، شەقایق چاوەڕێی هاتنە ژوورەوەی بوو.

- چی بووە دایکە؟!

مونیرە بەرەو کۆمەدیەکە ڕۆیشتو وتی:

حاڵی نەنەگیان باش نییە، دەڕۆم بۆ نەخۆشخانە تۆش خۆت ئامادەبکە دەتبەم بۆ ماڵی نەنەگیان.. لەوانەیە شەو لەوێ بمێنیتەوە.

شەقایق بەپەلە ئامادەبوو، مونیرە کە هەمیشە بێزاربوو لەراکردن ئێستا وەکو با دەرۆیشتن، تەنانەت شەقایق هەناسەبڕکێی بوو.

مەنوچەر خۆشحاڵو ئومێدەوار هاتبووەوە بۆ ماڵەوە، دوای دوانزە ڕۆژ لەکۆتایدا دەیتوانی شەقایق ببینێت، کۆڵانەکەیان وەک هەموو ساڵێک لەبەر نیوەی شەعبان کرابووە چراخان، کیومەرس وەک هەمیشە لەسەر کۆڵانەکە وەستا بوو.

- سڵاو، مەنوچەر چۆن لەم ناوە دەرکەوتیت!

- سڵاو.

کیومەرس وتی:

- دەڕۆیتەوە بۆ ماڵ؟

- بەڵێ.

کیومەرس زەردەخەنەیەکی هێماداری خستەسەر لێویو وتی:

- شەقایق.. شەقایق لەگەڵ کچە پورەکەیدا ڕۆیشتووە.

مەنوچەر بێ ئەوەی مەبەستی بێت:

- قسە بکە!.. بۆ کوێ ڕۆیشتوە؟

- ڕۆیشتوە بۆ پیاسەی شەقامەکان!

مەنوچەر سەریکردەخوار، بەبیستنی ئەم قسانە توشی سەرئێشە هاتو بێگومان ئەگەر دەستی بەدیوارەکەوە نەگرتایە

دەکـەوتـەزەوی، کـیومـەرس پێکەنینێکی نـاحـەزانـەی کـردو بەهێواشی وتی:

**تا لەلای مەعشوقەوە کێشانێک نەبێت.**
**هەوڵو کۆششی عاشقی بێچارە ناگاتە شوێنێک.**

**"٣٤"**

ئـەو سـاڵانـەی حـاجی ژن لـەژیـاندابـوو نـیـوەی شـەعبان شەربەتی دروسـتـدەکـردو دەیـدایـە مەنوچەرو کیومەرس‌و فەرهاد، ئەوانیش ئەیان برد بۆ سەر کۆلانەکە، دوو خولەکێکیش ڕاینەدەبورد کە پەرداخەکان بەتاڵ دەبـوون، ئینجا نۆرەی منداڵەکان دەهات، کیومەرس بەتەنیا سوراحییەک شـەربەتی دەخواردەوە، پاشان ئاگریان دەکردەوەو خواردنی شەعرییەیان دروسـتـدەکـرد، حاجی ژن پەتاتەیەکی دەدایـە منداڵەکان‌و منداڵەکان لەژێر ئاگرەکەیان دەناو دواتر دەیانخوارد،، چەند بەتام بوو! هەمووان لەدەوری یەکبون‌و ئەمەش زۆر باشبوو، هیچ کەسێک لەدەستی دەنگەدەنگەکانی ئەم ماڵە ئاسودەنەبوو، قیژەو هاواری منداڵەکان، قاقای پێکەنین‌و وەرەو برۆکان.

ئەمساڵ ژنـی مامە ساڵح بۆ یـادی حاجی ژن شـەربەتی دروستکرد، هەموو لەوێبون، مەنوچەر بەماتی لەناو ژوورەکە دانیشتبوو، ئاگایەکی لەشەقایق نەبوو، لەکەسی نەدەپرسی کە شەقایق‌و دایکی بۆ کوێ ڕۆیشتون، دوای ئەو ماوە زۆرە لەکەرەجەوە هاتبووە بۆ تـاران، کەچی ئەوان لەماڵ نەبون،، لەراستیدا زۆر توڕەبوو، نێرگس بێ گرنگیدان لەحەوشەکە

دانیشتبوو، پەروین بەنێرگسی وت:

- ئەم شازادەی تۆ چیەتی؟ بۆچی لەژوورەکە نایەتەدەرەوە؟

نێرگس وتی:

- نازانم، دەڵێم حەزی لەئیشکردن نییە لەکەرەج، خۆ پەروێز نازانێت، ناوێرێت بەپەرویز بڵێت، من بۆڵەبۆڵەکەی دەبیستم.

ئەعزەم وتی:

- بۆچی ژنی بۆ ناهێنن با هەر لەوێ، لەکەرەج بمێنێتەوە؟

نێرگس وتی:

- هێشتا ساڵێک بەسەر مردنی حاجی ژندا تێنەپەڕیوە.. ئینجا من خۆم هەڵناقورتێنمەوە ناو ژنهێنانەکەیەوە.

ئەعزەم چاوو برۆیەکی ناسکی کردەوەو وتی:

- نابێت خەفەت بۆ ژنهێنانی مەنوچەر بخۆیت، مەنوچەر لەژوورەوە ژنی خۆی هەڵبژاردوە!

نێرگس وتی:

- لێتانی ناشارمەوە، من ناڕازی نیم.

پەروین وتی:

- ئەو جارە باوکەگیان خەریک بوو دەیوت کە دەیەوێت خۆی کچ بدۆزێتەوە بۆ مەنوچەر.

نێرگس پێکەنینێکی بەرزی کردو وتی:

- بێگومان ئەگەر مەنوچەر ئەمە بزانێت دیق دەکات.

خۆرئاوا بوو،، هێشتا هەواڵی شەقایقو مونیرە نەبوو، هەموو ئەندامانی خانەوادە ئەمشەو لەماڵی فەرهاد بانگێشتکرابوون،، مونیرەو شەقایق هاتنەوە، مونیرە بەبینینی مەنوچەر کە لەتاریکییەکەدا دانیشتبوو ترسا.

- بۆچی لێره دانیشتوی، ئامۆژن؟!
- سلاو ئامۆژن.. سەرم ئێشی دەکرد هاتم بۆ ئێره.
شەقایق هاته پێشەوه بەسەرسامی وتی:
- کەی هاتیتەوه؟!
مەنوچەر بەساردییەوه سەیرێکی شەقایقی کردو وتی:
- دوێنێ پاش نیوەڕۆ.
مونیره لەکاتێکدا دەڕۆیشته ژوورەکەوه پرسی:
- ئەوانیتر لەکوێن؟
- ڕۆیشتون بۆ میوانی، ڕۆیشتون بۆ ماڵی فەرهاد.
شەقایق بەو شێوەیەی کە لەپلەکانەکانی هەیوانەکە دەڕۆیشته سەرەوه وتی:
- هەستە وەره بۆ ژوورەکەی ئێمه.
مەنوچەر دەستی شەقایقی خسته ناو دەستیو بەدەنگێکی هێواش وتی:
- بمێنەرەوه ئێشم پێته.
شەقایق پلەکانەیەک سەروی ئەوەوه دانیشت، مەنوچەر بەفەرمانکردنەوه:
- دوێنێ لەکوێ بویت؟
شەقایق وتی:
- نەنەگیانیان برد بۆ نەخۆشخانه منیش لەگەڵ..
مەنوچەر بەتوڕەییەوه تەماشایو بەگاڵتەجاڕییەوه وتی:
- تۆش لەگەڵ کچه پورەکەتدا وێڵ بویت لەکۆلان.
- من؟!

مەنوچەر لەتەنشتیدا لەسەر هەمان پلەکانە دانیشت و بەتورەییەوە:

- بێخود ڕوخساری بێ تاوان مەگرە خۆت.

شەقایق لەتەنیشتی هەستاو بەرامبەری وەستا، بەرقەوە وتی:

- کێ بەتۆی وتوە من لەگەڵ کچە پورم ڕۆیشتوم بۆ ویلگەری؟

مەنوچەر چاوی لەسەر لابردو وتی:

- کیومەرس!

شەقایق کەمێک وەستاو وتی:

- بەڵام کیومەرس وتی کە تۆ لەگەڵ کچە پورەکەتدا ڕۆشتویتەتە دەرەوە!

مەنوچەر پێکەنینێکی تورەو بەرزی کردو وتی:

- ئینجا ئەو کیومەرسە ڕیخۆڵەیەکی ڕاست لەسکیدا هەیە؟

شەقایق بێدەنگ بوو، مەنوچەر تازە بەئاگای خۆیدا هاتەوە، شەقایق بەتورەیی لەبەردەمی لاچوو، مەنوچەر بۆ چەند خولەکێک بەو شێوەیە دانیشتبوو لەشوێنەکەی خۆی، چێژی لەبیرتیژییەکەی شەقایق وەردەگرت و، بەگێلیەکەی خۆی پێدەکەنی.

"٣٥"

مەنوچەر دوبارە سەفەریکردەوە، خەمبارتر لەجاران! ئەمجارە دیارنەبوو کەی دەگەڕێتەوە، دوای ڕۆیشتنی ئەو، قسەکانی کیومەرسیش دەستی پێکرد، بەڵام شەقایق بایەخێکی

پێنەدەدا، شەو مونیرە هیلاکو بێتاقەت هاتەوە بۆ ماڵو، کاتێک خوانەکەی بەئامادەکراویی بینی هێزێکی وەبەردا هاتەوەو وتی:

- شەقایق من ئەگەر تۆم نەبوایە بێگومان لەبرسێتیدا دەمردم.. ئێستا چێشتی چیت لێناوە؟

شەقایق مەنجەڵی چێشتەکەی لەسەر زۆپا عەلادینەکە لابردو وتی:

- یانی ئەم ئاوگۆشتە ئەوەندە بێبۆنە.

دەنگی زەنگی حەوشەکە بەرزبووە، دوای ئەوە لەدەرگای ژوورەکە درا، مونیرە بەترسەوە:

- وایِ نەوەک نەنەگیان شتێکی لێهاتبێ؟!

لەپشت دەرگاکەوە کاک ئەحمەد وەستا بوو، مونیرە بێخواست هاوارێکی کورتی کردو کاک ئەحمەدی بێچارە ترسابوو.

- بەخوا شتێک نەبووە مونیرە خانم!

شەقایق خراپتر لەمونیرە بەدەستی لەرزۆکەوە شەکراوی بۆ مونیرە دروستکرد، لەنێو گریاندا پرسی:

- چی بووە کاک ئەحمەد؟

ئەحمەد لەپاڵ دەرگاکەدا لەسەر ئەژنۆ دانیشتو وتی:

- هیچ بەخوا، ڕاستیەکەی مەنیجە منی نارد بۆ ئێرە، لەتۆ شاراوە نییە حاڵی فەریبا باش نییە، نازانم بۆچی مناڵبونەکەی دواکەوتوە؟ مەنیجە وتی ئەگەر بەئەرک نەبێت چەند شەوێک لەلای نەنەگیان بمێنیتەوە.

مونیرە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو ئارام ئارام هەستایەپێو تەماشایەکی شەقایقی کردو وتی:

- ئەبێت هەر ئەمشەو بڕۆین؟

کاک ئەحمەد هەستاو وتی:

- بەڵێ، ئۆتۆمبێل لەبەردەرگا وەستاوە.

مونیرە وتی:

- زۆرباشە، من ئێستا دێم.

شەقایق وتی:

- نایەوێت دایکە تۆ لەماڵ بمێنەوە من دەڕۆم، تۆ زۆر هیلاکی تازە سبەینێش دەبێت بڕۆیتە سەرکار، لەوانەیە پورە مەنیجە ناچاربێت کە ماوەیەک لای فەریبا بمێنێتەوە کاک ئەحمەد ڕۆیشتە نێوان قسەکەیان وتی:

- شەقایق ڕاست دەکات!

پاشان بەرەو دەرگای حەوشەکە ڕۆیشتو وتی:

- من لەبەردەرگا چاوەڕێم.

مونیرە وتی:

- ئاخر خۆ تۆ لەگەڵ سادقدا ڕێکت نایەت!

شەقایق بزەیەکی کردو وتی:

- سوپاسی خوا بکە کەڕێکم نایەت لەگەڵیدا، ئەگەر بەیەکەوە ڕێک بوایەین خۆ ئیتر..

مونیرە زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- باشە، بڕۆ منیش سبەینێ زوتر دێم بۆ ئەوێ.

شەقایق مونیرەی ماچکردو خێرا ڕۆشت.

لەبەردەم ماڵی نەنەگیان کاک ئەحمەد کەمێک وەستا تا مەنیجە هەندێ ڕاسپاردە بەشەقایق بکاتو پاشان ڕۆیشت، سادق سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد، نەنەگیان دەرمانەکانی خواردبوو حاڵی ماڵەکە خەماوی بوو، شەقایق بەخۆی وت:

- دەی پورە مەنیجە لێرە ئیشی چی بووە؟

مەنیجە لەبنچینەدا دەم بەپێکەنین و قسەخۆش بوو، لەهەرکوێ دادەنیشت قسەی دەکردو پێدەکەنی، کۆچی دوەمی ژنی مامە ئیسماعیل بوو، تەنانەت هەندێجار فاتمە دەیوت:

- دایکە مەنیجە وەکو کچێکی چواردەسالانە، هیچ ڕەفتارێکی لەژنی سی و حەوت ساڵە ناکات!

شەقایق بەبێ ئامانج بەسادقی وت:

- ناتوانیت لەو پیاڵەی کەچاکەت خواردوە کۆیبکەیتەوە؟

سادق بەگاڵتەجارییەوە:

- تۆ چی دەڵێی جوجەڵەی بەهاری هێشتا زۆرت ماوە بۆ گارەگارکردن.

شەقایق وتی:

- بەڵێ هەرکێ بێتە هاوڕێی بەڕەڵاکان، لەمە بەئەدەبتر نابێت.

سادق ئەبڵەقی ئەو بوو بەهەمان ئاوازی گاڵتەبازییەوە:

- تۆ لەلای شازادەکان دەژیت، ئەو ئامۆراتە، کیومەرس، بەرەڵای کۆلانەکەیە.

شەقایق بەتوڕەییەوە:

- بەئەدەب بە!..

سادق بەبێ گرنگیدان بەشەقایق ڕوی وەرچەرخاندو وتی:

- بڕۆ بابە دڵت خۆشە.

شەقایق لەم قسەیە بەسەختی توڕەبوو، بەدەم گریانەوە لەژوورەکە چووە دەرەوە،، دەنگی نەنەگیان بەرزبووە:

- سادق گیان ئەو تەلەفزیۆنە بکوژێنەوە.

شەقایق هاتەژوورەوە بەتوڕەیی تەلەفزیۆنەکەی کوژاندەوە.

سـادق سەیرێکی ژوورەکـەی نەنەگیانی کـردو بـەدەم هەستانەوە بەهێواشی وتی:

- سەیرکە بچکۆل.. خۆت دەزانی کە من سەرم خراپە، ئەگەر بتەوێت لێرە "نەنە من غەریبم" بکەیت حاڵێکت بەسەردا دێنم کە تاکۆتایی تەمەنت لەبیرت نەچێت!

شـەقایق دەیـویـسـت نـەگـری، بـەڵام نـەیـدەتـوانـی، بـەدەم فرمێسکڕشتنەوەو بەئاوازێکی کیناوییەوە وتی:

- بڕۆ ونبە تاقەتی تۆم نییە.

بەیانی کاتێک دەیویست بڕوات نەنەگیان شەقایقی بانگردو وتی:

- دایکە هەستە قاوەڵتیەکە ئامادەبکە، منداڵەکەم تاخۆرئاوا هیچ ناخوات.

شەقایق بەبێزارییەوە لـەژوورەکـە چـووەدەرەوە،، سادق ڕۆیشتبوو، شـەقایق بەتەواوی ڕۆژەکـە سـەرقاڵی ئیشکردن بـوو، نەنەگیانی بـردە گەرماوەکە، جلەکانی شـت، قاپەکانی شتو ماڵەکەی کۆکردەوە، گسکو ئاوی دا لەحەوشەکە، ئاوی حەوزەکەی گۆڕی.

خۆرئاوا کە مونیرە هاتەوە توانای ڕێکردنی نەبوو، دەیویست بەمونیرە بڵێت کە ناتوانێت لەگەڵ سادقدا ڕێکبێت، بەڵام مونیرە بەخۆشحاڵی لەوەی کە شەقایق بەباشی ڕەحەتی ئیشەکان دێت ڕۆشتەوە بۆ ماڵەوە.

سادق تازە لەسەرکار گەڕابووە، نەنەگیان وردە وردە خۆی گەیاندە ژووری دانیشتن، بێچارە لەپێ کەوتبوو.

- شەقایق دایکە، چایەک بێنە بۆ سادق.

سـادق دەيزانی كە شەقايق حەزناكات ئيشێكی بۆ بكات، بەڵام لەوەی كە ئەو بەناچاركردنی نەنەگيان ئيشی بۆ دەكات، چێژی وەردەگرت، زەردەخەنەيەكی كراوەی خستە سەر لێویو شێوەيەكی بەفيزی گرتەخۆی، شەقايق لەبەر نەنەگيان وازيهێنا، بەڵام سادق ڕودار بوو، لەبەردەم نەنەگيانيشدا شەڕی لەگەڵدا دەكرد.

- ئەم خواردنە بۆچی خوێی نييە!

شەقايق وتی:

- خوێدانەكەم خستووەتە بەر دەستت، لێی كە.

نەنەگيان وتی:

- دايكە لەبەر من كەم خوێ لێيناوە.

سادق پێكەنينێكی تانەی كردو وتی:

- نەخێر نەنەگيان ئەم قسانە نييە، ئەم كچە هەر نازانێت چێشت لێبنێ، سەيركە! برنجەكە نەكوڵاوە، دەنگی تەقە تەقی لەژێر ددانەوە بەرزدەبێتەوە.

شەقايق بەقينەوە وتی:

- ئەگەر برسيت نييە مەيخۆ؟

سادق بەتوڕەييەوە:

- كەواتە من چی بخۆم؟

شەقايق بزەيەكی خستەسەر لێویو بەگاڵتەوە وتی:

- ژەهری مار هەيە دەتەوێت؟

نەنەگيان قاقا پێكەنی، بەڵام سادق مۆنەی كردو لەسەر خوانەكە هەستا، پاكەتێك هێلكەی كڕيبوو، تاوەی خستە بەردەم تەلەفزيۆنەكەو دەستی كرد بەهێلكە شكاندن.

شەقایق قاپەکانی کۆکردەوەو شتی، کاتێک گەڕابووە ژوورەوەکە نەنەگیان ڕۆشتبووە ژوورەکەی خۆی.

- شەقایق گیان پەرداخێک ئاو بێنە دەمەوێت دەرمانەکانم بخۆم.

کاتێک شەقایق لەژوورەکەی نەنەگیان دەرچوو، لەناکاو چاوی بەسادق کەوت هەموو پاشماوەی هێلکەکەی خستبووە سەر فەرشەکە!

- ئا ئا، بۆچی قاپت نەهێنا توێکڵی هێلکەکانی تێ بکەیت؟!

- بەتۆ چی؟

شەقایق ڕۆشتە چێشتخانەو دەوریەکەی هێنا، هەرکە ویستی توێکڵی هێلکەکە کۆبکاتەوە سادق دەستی خستە لاوەو بەتوڕەییەوە وتی:

- مەگەر من گاڵتەم هەیە لەگەڵ تۆدا، دەستی لێ مەدە فیتنە!

لەبەر ڕقەکەی شەقایق ڕێگری لەهاتنەخوارەوەی فرمێسکەکانی کرد.

- زۆر بێڕەوشتی!

سادق بەگاڵتەوە وتی:

- هەستە برۆ ئەگەر دەتەوێت غەر غەرە بکەیت.

بەیانی شەقایق زوتر لەخەو هەستا، هیچ خواردنێک لەماڵەکەدا نەبوو، دەیویست ڕاسپاردە بەسادق بکات کە هەندێ خۆراک بکرێت، بەڵام سادق لەجێگەکەیدا نەبوو.

شەقایق لەپشت پەنجەرەکەوە ئەبڵەقی دەرەوە بوو بەهێواشی وتی:

- ئا، ئەو ڕۆشت؟ چەند بێدەنگ!

- لەپشت پەنجەرەکە چیت دەوێت؟

دەنگی سادق، شەقایقی لەشوێنی خۆی هەڵپەڕاند، ڕویکردە لایو بێخواست زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- وای منت ترساند!

سادق مۆنەی کردبوو، بەئاوازێکی فەرماندەرانە وتی:

- دەڵێم لەپشت پەنجەرەکە چیت دەوێت؟

شەقایق ڕووی وەرگێڕا لێیو وەکو مناڵەکان وتی:

- هیچ نییە لەماڵەوە نەسەوزە، نەپەتاتەو پیاز، نەڕۆن، میوەشمان دەوێت.

سادق بەبێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە، لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوەو ڕۆشت، شەقایق بەتەواوی تورە بوو، سادق وەک مەنوچەر نەبوو کینەلەدڵ بوو.

مەنوچەر کاتێک دەتۆرا خێرا بۆ ئاشتی دەستپێشخەری دەکرد.

عەسر کاتێک سادق شتەکانی دەخستە چێشتخانەکەوە زانی هەموو ئەو شتانەی کە شەقایق لەژوورەکەی نەنەگیان بوو، ویستی هەر لەوێ شەڕی لەگەڵدا بکات، بەڵام لەبەر نەنەگیان بانگی کرد.

- چییە؟

سادق بەتوڕەیی وتی:

- بۆچی کاتێک هەموو شتێک لەماڵدا هەیە بەمنت وت بڕۆ شت بکڕە، مەگەر شێتی؟

شەقایق زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- هیچ شتێک نەبوو، هەموویم کڕی.

سادق وتی:

- هەڵەتکرد ڕۆیشتی شتت کڕی!

شەقایق بەسەرسامییەوە ئەبڵەقی دەموچاوی سورەبوی سادق بوو، سادق بەردەوامبوو:

- گێل، ئەگەر واتدەزانی هاتی بۆ ئێرە دەتوانیت هەر کوێ کە ویستت بڕۆیت، خراپ تێگەیشتی.

شەقایق نەیدەتوانی پێش لەگریانەکەی بگرێت، ویستی لەبەرامبەری لابچێت، بەڵام سادق بەتوندی دەستی گرتو بەهەمان تووڕەییەوە:

- ئەگەر ئەتەوێت بگەڕێی، بڕۆ ونبە بۆ ماڵی خۆتان، لێرە ئەم هەوالانە نییە.

نەنەگیان لەژوورەکە هاواریکرد:

- چی بووە سادق:

سادقی ئەوی خستە لاوەو ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی نەنەگیان، بەهەمان توڕەییەوەلەگەڵ نەنەگیان وتی:

- بۆچی هێشتت بڕوات بۆ شت کڕین، مەگەر من مردوم کە دەهێڵیت ئەم کچە بڕوات بۆ ناو شەقامەکان؟

نەنەگیان وتی:

- دایکە خولەکێک ددان بەخۆتدا بگرەرت، کوڕەکەی ئەکرەم خانم هات، پارەم پێدا، ئەو ڕۆیشت شتی بۆ کڕین، شەقایق هەر لەماڵدا بوو.

شەو سادق چێشتی نەخوارد، لەبنەمادا خوی نەگرتبوو کە داوای لێبوردن لەکەس بکات.

خۆی بەتاوانبار دەزانـی، هەرچی هەبوو تاوانی شەقایق

بوو، هەر کە سفرەکەیان کۆکردەوە لەدەرگا درا، نەنەگیان بەسەرسامییەوە وتی:

- یانی کێیە!

ســادق دەرگــای کــردەوە، چەند دراوســێیــەک هاتبون بۆ سەردانی نەنەگیان، شەقایق ترسا بوو.

ســادق، بــەلام بێباکانە لەچێشتخانە دانیشتبوو سێوی دەخوارد، شەقایق بەداماوی وتی:

- توخوا وەرە یارمەتیم بدە!

سادق هەستاو وتی:

- چی بکەم؟

- میوەکان بشۆرەوە.

شەقایق سینییە چاکەی برد، کاتێک گەڕایەوە سادق میوەکانی شۆردبووە.

شەقایق میوەکانی یەک یەک بەدەستەسڕ وشککردەوەو لەناو قاپەکەدا لەسەریەک داینا، سادق بەهێواشی وتی:

- ئەو ژنەی کە لەپاڵ نەنەگیان دانیشتوو دوو کوڕی هەیە، هەردوکیشیان حاڵیان باشە.. .!

شەقایق بەبێزارییەوە:

- باشە بەمن چی؟

سادق وتی:

- هەردوکیان ژنیان هەیە، بەلام کوڕێکیان بەدوای ژنێکی تردا دەگەڕێت، دەیەوێت هەوێ بێنێتە سەر ژنی یەکەمی ٭سادق بەشێوەی نهێنی بەردەوام٭ لەوانەیە تۆیان هەڵبژاردبێت؟!

شەقایق بەسەرسامییەوە:

- ڕاست دەکەیت؟!

- بەڵێ.

شەقایق هەستا، بەمینکە مینگ وتی:

- سادق.. تۆ قاپی میوەکە دەبەیت بۆ ژوورەکە؟

سادق بزەیەکی خستە سەر لێوی‌و وتی:

- باشە، بمدەرێ دەیبەم.

"٣٦"

بمبەخشن!

تەنیا ئەمە.. دات لێی شکاندت پاشانیش دەڵێی بمبەخشن، ئەم بمبەخشە چ نەخۆشییەک دەرمان دەکات؟.. دەست‌و پێ لار تەنیا فێربە کە شت بگرێت.

شەقایق بێدەنگبوو، ئێستا ئیتر نەدەگریا، هەوڵیدەدا ئەم دەستبەرداری ئەم نەریتە بێت، کەچی هەڵسوکەوتەکانی سادق هەندێکجار دەیگریاند، سادق دوبارە بێدەنگیەکەی شکاند.

- بۆچی جێگۆڕکێ بەکەرەستەکانی ناو ماڵ دەکەیت؟

شەقایق وتی:

- ئەگەر ئەوەندە گرنگە بۆت خۆت چاکی بکە.

سادق بەقینەوە وتی:

- من دابنیشم ماڵداری بکەم؟

شەقایق بێزاربوو، بەتۆرانەوە وتی:

- من چیبکەم، هەر ئیشێک دەکەم تۆ بیانویەکی بۆ دەدۆزیتەوە.

سادق بەلەخۆبایبون‌و بەگاڵتەجاڕییەوە:

- نامەویت ئیشیک بکەیت.. تەنیا دەتوانی بگریت، بگری نەنگی نییە.

خۆرئاوابون مونیرە هات، سادق خوا خوایبوو کە شەقایق گلەییەک نەکات.

خۆشبەختانە شەقایق قسەیەکی نەکرد، مونیرە لەماڵ مەنیجەوە دەهـــات، فەریبا منالّەکەی بوبوو، شەقایق بەخۆشحالّییەوە پرسی:

- منالّەکەی چییە؟

مونیرە وتی:

- بپرسە منالّەکانی چین!

شەقایق بەسەرسامی وتی:

- مەگەر دوانەن؟

- بەڵێ، کچێکو کورێک، مەنیجە زۆر خۆشحالّبوو.

مونیرە بەهێواشی:

- سبەیشەو بۆ نانی شێوان بۆ ئێرە دێت، خۆت بەتەنیا دەبێت هەموو شتێک ئامادەبکەی شەقایق وەک مونیرە بەهێواشی وتی:

- سەوزەی برژاو "قورمە سەوزە" دروست بکەم، باشە؟

- بەڵێ.

سادق لەچپەکردنی مونیرەو شەقایق بەتەواوی بێزاربوو، بەپەلە لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوە، حەزی نەدەکرد ببێتە بابەتی قسەکردنی مونیرە، چونکە وایدەزانی کە شەقایق لەبارەی ئەوەوە لەگەڵ مونیرەدا قسە دەکات، دوای ڕۆیشتنی ئەو مونیرە پرسی:

- لەگەڵ سادقدا چی دەکەیت؟

شەقایق بەدەستەپاچەیی وتی:

- هیچ، لەگەڵیەکدا ڕێکدەکەوین.

بەیانی شەقایق بەدەنگی کەڵەشێری دراوسێکەیان لەخەو هەستا، خۆر بەتەواوەتی ژوورەکەی ڕوناککردبووە، سەری سوڕمابوو، هەمیشە بەیانی زوو خەبەری دەبـووە، کەچی ئەمڕۆ درەنگتر لەخەو هەستابوو بەخۆی وت:

- لەوانەیە کە ئەمڕۆ هەینییە زۆر خەوتبم.

کاتێک سادق لەخەودا بینی سەرەتا سەری سوڕما، پاشان ترساو بەهێواشی وتی:

- وای کاتژمێر هەشتە ئەمە چ درەنگە بۆی!

لەپاڵی دانیشت، بەڵام نەیدەتوانی بانگی بکات، ئەڵێی دەترسا، بەڵام کاتێک سەیری میلەکانی کاتژمێرەکەی کرد، ترسەکەی خستەلاوە:

هەستە.. درەنگە!

سادق ڕوی تێکردو بەچاوی خەواڵوەوە ئەبڵەقی بوو، ئینجا بەتوڕەیی وتی:

- چییە؟

بەڵام ئەو بەنەرمی وتی:

- ناڕۆیت بۆ ئیش.. سەعات هەشتە؟!

سـادق بـەبێزاری هەستاو لەشوێنەکەی خۆیدا دانیشت بەتوڕەییەوە وتی:

- کێشەی تۆ نییە، بۆچی ناڕۆیتو ڕزگارمان بێت لەدەستت؟!

کینە گەروی گرتبوو، بەسەختی تفی بۆ قوتدەدراو لەبەردەمی هەستا.

سادق خەوتەوەو بەتانییەکەی دایەوە بەسەر دەموچاویدا، بەڵام چیتر نەیتوانی بخەوێت، چەندجار ئەملاوئەولای کردو لەکۆتایدا بەداخەوە هەستا، ڕۆیشتە ناو حەوشەکە،، هەوای فێنکو پاکی بەیانیان توڕەییەکەی لەبیربردەوە، زەردەخەنەیەکی خستەسەر لێوی، هەستی بەئارامی دەکرد، بەڵام هۆیەکی بۆ ئەم ئارامییە نەدۆزیەوە، لەناکاو چاوی بەشەقایق کەوت، عەبای بەسەروە بوو، وەک ئەوەی ئامادەی ڕۆیشتن بێت، بەرامبەری وەستاو دوبارە توڕەیی هات بۆ لای.

- بۆ کوێ؟!

شەقایق سەیرێکی کرد، بەڵام بەدەنگێکی لەرزۆکو هێواش کە بەزۆر دەبیسترا وتی:

- دەمەوێت بڕۆم نان بکڕم.

- بڕۆ ژوورەوە من خۆم ئەڕۆم.

شەقایق سەبەتەو پارەکەی داناو گەڕایەوە بۆ ژوورەکە.

کاتێک سادق گەڕایەوە، شەقایق خوانی قاوەڵتی داخستبوو، نەنەگیانیش لەپاڵ خوانەکە دانیشتبوو، ڕادیۆکە داگیرسابوو، نەنەگیان بەمۆنی چاوبڕییە سادقو بەهێواشی وتی:

- بۆچی لەگەڵ شەقایقدا شەڕت کردووە؟

سادق بەخوێنساردییەوە:

- لەبەرئەوەی خۆتێهەڵقورتێنە.. بەیانی هاتوە بانگم دەکات، ئاخر بەئەو چی؟

نەنەگیان وتی:

- ڕاست دەکات، تۆ هیچ کاتێک هەینیان لەماڵ نەدەمایتەوە!

سادق زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- دەتەوێت بڕۆم؟

نەنەگیان بزەیەکی کردو بەئارامی وتی:

- نایەوێت بڕۆیت ڕەوشتت چاک بکە.

سادق سەری بردە پێشەوەو بەهێواشی وتی:

- لەبەر ئەم گێڕانەوەیە ڕقم لێیەتی.

نەنەگیان وتی:

- ئەو نەیگڕاوەتەوە.. من خۆم زانیم کە دوبارە شەڕتان بووە، لەچاوە گریاناویەکانی شەقایقەوە زانیم.

نیوەڕۆ کاتێک شەقایق قاپەکانی شۆرد، حەزینەدەکرد ئیشێک مابێتەوە بۆ شەو، بەدوای مەنجەڵێکی گەورەدا دەگەڕا بۆ دروستکردنی برنجەکە، بەڵام مەنجەڵی گەورە نەبوو لەچێشتخانە، ژێر خانەکە کەوتە بیری، نەنەگیان خەوتبوو، سادقیش لەژوورەکە سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد، چەند ساتێک ڕایبورد، دەنگێکی ترسناک لەژێر خانەکەوە هات، خۆشبەختانە نەنەگیان خەوی قورس بوو، ئەوەش لەبەر ئەو دەرمانانە بوو کە بەکاریدەهێنا، ئەگینا بێگومان بێچارە دڵی دەوەستا، سادق بەهەراسانی بەرەو ژێرخانەکە ڕۆشت، شەقایق خەریکبوو بەپەلە مەنجەڵەکانی کۆدەکردەوە، سادق بەترساوی وتی:

- چی بووە؟!

شەقایق وەکو مناڵ وتی:

- هیچ.. ئەمانە لەو سەرەوە کەوتنەخوار!

سادق هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو لەسەر قادرمەی ژێرخانەکە دانیشتو بەداخەوە وتی:

- باشە بەمنت بوتایە یارمەتیم دەدایت.

شەقایق ئەو مەنجەڵەی هەڵگرت کە مەبەستی بوو، لەکاتێکدا لەپلکانەکان دەچووە سەرەوە وتی:

- تۆ هەر سەرکوتم دەکەیت.. نە، من یارمەتی تۆم ناوێت.

پاش نیوەڕۆ سادق لەماڵ ڕۆیشتەدەرەوە، دەیویست تاشەو نەیەتەوە بۆ ماڵ.

لەگەڵ خۆیدا بیریکردەوە:

بێگومان ئەمشەو هەموو شتێک بەدایکم دەڵێ، منی بێچارە ئەمشەو بەدبەخت دەبم..

"٢٧"

شەقایق لەچێشتخانەکە دانیشتبوو، زۆربـەی ئیشەکانی تـەواوکـردبـوو، هەڵبەتە ئـەگـەر مەنیجە نەهاتبایە لەوانەیە ئیشەکان تاوەکو شێوان بمایەتەوە، نزیکی عەسر لەدەرگا درا، شەقایق وایزانی سادقە، کەچی دایکی لەپشت دەرگاکەوە بوو.

- سڵاو دایکە چی بووە؟

مونیرە زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- هیچ نەبووە تەنیا هاتوم..

دەنگی نەنەگیان بەرزبووەوە.

- کێ بوو شەقایق!

- منم نەنەگیان.

مونیرە لەپێشەوە شەقایق لـەدوایـەوە چونە ژوورەکـەوە بەکورتی دوای سڵاو هەواڵپرسیت مونیرە وتی:

- ڕاستییەکەی هەمووان ڕۆیشتون بۆ سەفەر، ڕۆیشتن بۆ گەرمەسێر لەگەڵ باوکەگیاندا، پەروێزیش سبەینێ، دوو سبەی

مۆڵەت وەردەگرێت دەڕوات بۆ کەرەج، وتم ئێستا کە ماڵ چۆڵە منو شەقایق پەردەو لێفەکان بشۆین، لەترسی باوکەگیان سێ ساڵە ناوێرم لێفەکان بشۆم!

نەنەگیان وتی:

- ڕاست دەکەیت ئێستا هەلێکی باشە، دەستی شەقایقیش خۆش بێت، بەتەواوی خستمە زەحمەتەوە.

مەنیجە وتی:

- ئێستا دادە ئەمڕۆ بمایایتەوەو چێشتی دەستی کچەکەت بخواردایە، سەوزەی سورەکراوی دروستکردوە.

مونیرە لەکاتێکدا هەڵدەستا وتی:

- ئەرکی سەرشانییەتی خوشکە، نۆشی گیانت.. ئێمە ئیتر دەڕۆین.

کاتێک شەقایق چووە ماڵەوە لەبێدەنگی ماڵەکە دڵگیرا، گەرچی هەمیشە گلەیی لەقەرەباڵغی دەکرد، بەڵام زۆر حەزیشی لەبێدەنگیو چۆڵی نەبوو.

- سڵاو!

شەقایق سەری بەرزکردەوە مەنوچەری بینی، بەگرژییو توڕەییەوە لەسەر قادرمەکان وەستا بوو، وەک بڵێی لێی تۆرابێت تەنیا لەگەڵ مونیرەدا سڵاوو هەواڵپرسی کرد.

شەقایق لەدڵەوە وتی:

- بێگومان ئەم وابیردەکاتەوە منو سادق هەموو شەوێک قسەی عاشقانە دەکەین، بەتەواویی یەکمان خۆش دەوێت، نازانێ وەک چەقوو پەنیرین.

- سڵاو ئامۆژن.

نێرگس بەپێچەوانەی مەنوچەرەوە سڵاو هەواڵپرسیەکی گەرمی لەگەڵ شەقایقدا کرد.

شەقایق باش وێڵت کردو ڕۆیشتی..؟. دایکت هەموو شەوێک بەتەنیا دەنوست، ئێستا حاڵی داپیرەت باشە؟

شەقایق لەپاڵیدا دانیشتو وتی:

- خراپ نییە، بەڵام ناتوانێت بەباشی ڕێبکات.. دەبێت کەسێک یارمەتی بدات.

نێرگس بەهێواشی وتی:

- دەتوانێت بەتەنیا بچێت بۆ دەستشۆر؟

شەقایق بەهەمان هێواشی وتی:

- کێشەی لەسەر ئەمەیە، دکتۆر وتویەتی جەڵدەی دوەمییەتی، لەبەر ئەمەیە کە بەمجۆرە لەپێ کەوتووە!

نێرگس لەژێر لێوەوە بەورتەورت وتی:

- خوا چاکی بکات.

شەقایق هەستاو عەباکەی لابرد، پاشان بەئاوازێکی بڕ تامەزرۆییەوە وتی:

- ئامۆژن سەوزەی چێشتی شۆربات هێناوە؟!

- بەڵێ، بەڵام کاتم نەبوو پاکی بکەم.

شەقایق وتی:

خۆم پاکی دەکەم، بەمەرجێک کاتێک چێشتی شۆربات دروستکرد لەبیرم نەکەیت!

نێرگس هەستاو لەکاتێکدا کە بەرەو چێشتخانەکە دەڕۆیشت وتی:

- بڕۆم سینیو چەقۆ بێنم.

مەنوچەر کە چاوەڕێی هەلێک بوو، هاتو لەلای دانیشت، بەگاڵتەجاڕی وتی:

- خۆش ڕایبواردو خاتوو نایتینگل؟

شەقایق وتی:

- پەرستاریکردنی نەخۆش، خۆش ڕابواردنە؟

مەنوچەر هێواش وتی:

- دەزانی حەزدەکەم لێت بدەم.

شەقایق بەگاڵتەوە وتی:

- ناوێری!

مەنوچەر بەئاوازێکی بڕاو وتی:

- دەیبینیت!

مونیرە لەژوورەکە دەرچوو لەلای مەنوچەر دانیشت هەردوکیان قسەیان دەکردو پێدەکەنین.

شەقایق بەسەرسامییەوە:

- دوو خولەک پێش ئێستا وەک بورجی ژەهری مار سەیری منی دەکرد، ئێستا سەیرکە چۆن پێدەکەنێت؟

شەقایق لەقیندا سەوزەکەی هەڵگرتو ڕۆشت بۆ لایەکیتر.

عەسر کاتێک سادق هاتەوە بۆ ماڵ وایدەزانی ئێستا شەقایق لای دایکی دانیشتووە بەتەواوی گلەیی ئەوی لای دایکی کردوە، لەگەڵ خۆیدا هەزار نەخشەی کێشا کە ئەگەر قسەی گێڕابێتەوە چی لێبکات، بەڵام کاتێک هاتەوە ماڵ جگە لەفاتمە کەس لەماڵ نەبوو، نەنەگیانیش لەژوورەکەی خەوتبوو، بەخۆی وت:

- لەوانەیە لەگەڵ دایکمدا ڕۆشتبێ بۆ شتکڕین.

شەرمی دەکرد کە شتێک لەفاتمە بپرسێت، بەڵام کاتێک شەو داهاتو زانی کە شەقایق ڕۆشتوەتەوە بۆ ماڵی خۆیان بۆ ساتێک هەستی بەبێزاریو نائومێدی کرد، دڵی ساردبووەو، ئێستا چیتر ماڵی نەنەگیانیش سەرنجراکێش نەبوو بۆی، ئێستا دەیزانی کە بۆچی ئەم تازەییانە بەخۆشییەکی زۆرترەوە دەهاتەوە بۆ ماڵ، سەرەتا وایدەزانی لەبەرئەوەی زوترە لەهەمیشە دەگەڕایەوە خۆشحاڵە، بەڵام ئەمشەو بەبینینی شوێنی چۆڵی شەقایق زانی کە هۆی خۆشیو چالاکییەکەی ئەو بووە، ئەگەر لێرە بوایە لەوانەیە لەبەردەم هەمووواندا بیانوی بگرتایە، دەیزانی کە شەقایق ڕقی دەبێتەوە، بەڵام لەبەر گاڵتەپێکردنەکانی ئەو بوو کە ئیتر نەدەگریا، ئەگینا لەسەرەتای هاتنییەوە دەستی دەکردە گریان، زۆر دڵ ناسکبوو، بەڵام کاتێکیش کە قینی دەکرو پێی دەوت:

- بگری عەیب نییە.

زیاتر توڕە دەبوو.

بایەکی مامناوەند هەڵیکردو پەردەکان بەجۆرێک خۆیان دابووە دەست باوە دەنگی ئاوەکە سەیرکردنی بەحەوشەکەوە بەستەوە، شەقایق بوو، خەریکبوو جلی دەشۆرد، ئەڵێی کەس لەحەوشەکە نەبوو، بیگای شەقایق تێکەڵ بەنیگای مەنوچەر بوو، دەڵێی میهرەبان بووە، مەنوچەر وەک سادق کینەلەدڵ نەبوو، شەقایق زەردەخەنەیەکی بەرویدا کردو بەئاوازێکی گاڵتە وتی:

- هەستە تەمەڵ، نیوەڕۆیە!

مەنوچەر حەزی لەئاوازەکەی بوو، هەستاو لەچوارچێوەی

دەرگاکە وەستاو تەماشایکرد، شەقایق ڕوی تێکردو بەهەمان ئاواز بەردەوامبوو:

- ئا، دەی جلەکەت کوا؟

مەنوچەر سەیری خۆی کرد، دوێنێ شەو کراسەکەی داکەندبوو، قەپی بەلێوی خۆیدا کردو بەشەرمەزارییەوە وتی:

- وای هەر بیرم لای خۆم نەبوو!

پاشان ڕۆیشتو جلەکەی لەبەرکرد، هاتە حەوشەکەو لەلێواری حەوشەکە دانیشت، دەموچاوی شتو دوبارە ئەبڵەقی شەقایق بوو، سەیری دەوروبەرەکەی کردو هێواش وتی:

- ئێمە هەردوکمان تەنیاین؟

شەقایق سەری بەرزکردەوەو بەئەبڵەقی سەیری مەنوچەری کرد، پڕی دەستی کرد لەئاوو ڕژاندی بەسەر جلەکەی ئەودا، مەنوچەر ڕەخنەگرانە وتی:

- ئا، بۆچی ئاوت کرد بەسەر جلەکەمدا؟!

شەقایق بۆری ئاوەکەی بەستو سەیرێکی تورەی کرد:

- لەبەر ئەوەی ڕوداری!

مەنوچەر وتی:

- مەترسە، خەیاڵی نابەجێ نەیداوە لەسەرم!.. ویستم بزانی کە بویریم هەیە، ئێستا دایکم لەکوێیە؟

- ڕۆیشتوە هەندێ شت بهێنێت، تۆ قاوەڵتی ناخۆیت؟

مەنوچەر سەریکردە خوارو وتی:

- دەمەوێت، بەڵام هەموو ڕۆژێک دایکم چای بۆ دادەکردم.

شەقایق پێکەنیو وتی:

- زۆر باشە، بڕۆ ئێستا من دێم.

خوانەکە بەدەقکراوی لەسەر پەرداخەکە بوو، مەنوچەر خوانەکەی کردەوە، پەنیرو کەرەی لەدەورییەکدا بوو، نانی تازەش لەپاڵیدا بوو، شەقایق هاتو لەلای دانیشت قۆریەکەی لەسەر سەماوەرەکە هەڵگرتو چای کردە پیاڵەکە، مەنوچەر وتی:

- بۆ خۆتیش تێ بکە.

- چام خواردووە، مەگەر هەموو کەسێک وەک تۆ تانیوەڕۆ دەخەوێت!

لەپاڵ سفرەکە هەستا، مەنوچەر وتی:

- دابنیشە، ئیشم بێتە.

شەقایق وتی:

ئیشم هەیە، دەبێت جلەکان بشۆم.

مەنوچەر ڕاستگۆیانە وتی:

- مەترسە ئەگەر مایەوە یارمەتیت دەدەم.

- باشە بیڵێ

شەقایق دەیزانی کاتێک مەنوچەر بەراستی قسەدەکات، نابێت دژایەتی بکەیت ئەگینا هاواری دەگاتە ئاسمان..

مەنوچەر بەگاڵتەوە وتی:

- حاڵی نەنکت باش بوو؟

شەقایق وتی:

- زۆریش نە، دەبێت خۆی بپارێزێت، خوێ باش نییە بۆی، ناتوانێت باش ڕێبکات.

مەنوچەر بۆ ساتێک بێدەنگبوو، ئینجا بەئاوازێکی کیناوی وتی:

- حاڵی پورزاکەت چی، ئەو باش بوو ئینشائەڵڵا؟

شەقایق ئەمەی وت:

- ئەویش باش بوو.

پاشان ئەبڵەقی حەوشەکە بوو.

مەنوچەر لەژێر چاوەوە سەیری کرد، دەیزانی کە ترساوە، پەنجەی نیشانەی بەتوندی خستە سەر گۆنای و قشاری خستە سەری و بەهەمان ئاواز بەردەوامبوو:

- خۆش ڕایدەبورد، بەڵێ؟

شەقایق بەتەواوی ڕوی وەرگەڕا لێی و ڕوی وەرگێڕا، هێواش وتی:

- نە، زۆر ماندوکەر بوو.

مەنوچەر هەستاو بەرامبەری دانیشت بەدەستی ڕویکردە لای خۆی، بەتوڕەییەوە وتی:

- دەبێت من بەردەوام چاوم لەتۆ بێت کە نەڕۆیت بۆ شوێنێک؟

شەقایق بێدەنگبوو، مەنوچەر لەم بێدەنگییە توڕەتربوو هاواریکرد:

- بەڵێ؟.. تۆ حەز دەکەیت من هەمیشە چاوم لێتەوەبێت؟

شەقایق بەرزتر لەو هاواریکرد:

- من تەنیا لەبەر نەنکم ڕۆیشتم، من.. ئیشێکم نییە لەگەڵ سادقدا، ئێمە لەگەڵ یەکدا قسە ناکەین، ئەگەر قسەیەک بکەین تەنها شەڕە.

مەنوچەر لەکاتێکدا قسەکانی ئەوی بەگاڵتەوە دوبارە دەکردەوە بەردەوام بوو:

- بەڵێ، تۆ ڕاست دەکەی، تەنیا چاوەڕێی ئەوەی کە من لەماڵ بچمەدەر، پاشان بەئۆتۆمبیلی تایبەتی لەوێی، لای.. لای نەنکت.

پاشان بەگاڵتەوە:

- خۆتی!

مەنوچەر لەبەرامبەری هەستاو لەپاڵ قادرمەکەوە وەستا، چەند هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، شەقایق بەئاوازێکی کیناوی وتی:

- تۆ هەڵە دەکەیت من..

مەنوچەر ڕوی تێکردو بەهاوارێکی گوێکونکەر هاواریکرد:

- بێدەنگ بە.. نامەوێت دەنگە شومەکەت ببیستم.

شەقایق هەستاو، بەدەم گریانەوە بەرەو حەوشەکە ڕۆیشت، مەنوچەر بەدەموچاوێکی سورەبوەوە ئەبڵەقی بوو، بەهەمان هاوار بەردەوامبوو:

- دانیشە، هێشتا قسەکانم تەواو نەبووە.

شەقایق تا ئەوکات تورەبونی مەنوچەری نەبینیبوو، وەک گرکان بوو لەکاتی تەقینەوەداو ساتێک لەقوڵایی نزیکدەبووە، ئەمجا ئارامتر لەپێش بەئاوازێکی هەرەشەئامێز وتی:

ئەگەر جارێکیتر بێمەوە ماڵو، ببیستم ڕۆیشتوی بۆ شوێنێک، دێم بۆ ماڵی نەنکت بەزۆر دەتهێنمەوە، بەجۆرێک لێت دەدەم کە هەرگیز لەبیرت نەچێت، ئیتر ناتوانی بڕۆیت بۆ ئەوێ مەگەر لەگەڵ دایکتدا.

ماوەیەک ڕایبورد، مەنوچەر بەخێرایی بەرەو ژوورەکەیان ڕۆیشتو بەتوندی دەرگاکەی داخست.

شەقایق بۆ چەند ساتێک بەماتی ئەبڵەقی حەوشەکە بوو، بەدەنگی ئاوەکە هاتەوە بەخۆیدا.

خوانەکەی کۆکردەوە، لەبەر لەرزینی دەستەکانی لەسەر سینیەکەدا دەیاندا لەیەک، کاتێک لەچێشتخانەکە هاتەدەرەوە، بەرەو لای حەوزەکە ڕۆیشت، ساردی ئاوەکە بووە هۆی ئەوەی لەرزەکە تەواوی لەشی بگرێتەوە.

عەسر کاتێک پەروێز هاتەوە، وایدەزانی کە مەنوچەر لەکاتی خواحافیزیدا داوای لێبوردنی لێدەکات، بەڵام ئەو لەدەرەوە چاوەڕێبوو شەقایق لەم ڕەفتارەی مەنوچەر زویربوو، تەنانەت نێرگس ئاگاداری خەمە شاراوەکەی بوو.

بەیانی ڕۆژی دواتر مونیرە کاتی ڕۆیشتن ئەوی گەیاندە ماڵی نەنەگیان، دەترسا لەتەنیا هێشتنەوەی شەقایق لەماڵدا، ئیشەکانی کیومەرس دیارنەبوو، لەناکاو دەهاتەوە، مەنیجە بەهاتنی شەقایق زۆر خۆشحاڵ بوو، زوو ڕۆیشت نەنەگیان خەوتبوو، ماڵەکە پاکبوو، هەندێک چێشت مابووەوە بۆ نیوەڕۆ، ئیشێک نەبوو کە بیکات.

سادق بەچەند هەنگاوێکی ئارام بەرەو ماڵ دەرۆیشتەوە، لەوانەیە ئەگەر دەیزانی شەقایق لەماڵ دانیشتووە ئەوەندە بێزارنەدەبوو،، کاتێک دەرگاکەی کردەوە بەبینینی شەقایق کە لەسەر هەیوانەکە دانیشتبوو، وەستا، نەیدەزانی خۆشییەکەی بشارێتەوە، کەچی شەقایق ئاگاداری نەبوو، بەچاوە جوانەکانی ئەبڵەقی خاڵێک بوو، بەڵام نە، دەڵێی زۆر ناڕەحەت بوو، دەگریاش، دڵۆپە جوانو مرواری ئاساکانی فرمێسک بەسەر گۆنا بچوکەکەیدا دەهاتە خوارەوە، سادق بەهێواشی ڕۆیشتە

پێشەوە، بەڵام شەقایق هێشتا ئاگاداری نەبوو، ئەمجارە لەپاڵیدا دانیشت بەئاوازێک کە ترس تێیدا شەپۆلی دەدا وتی:

- شەقایق چی بووە؟

شەقایق هاتەوە بەخۆیدا، بەو خەیاڵەی کە دەنگەکە، دەنگی مەنوچەر بەترسەوە سەیری سادقی کرد، بەڵام کاتێک ڕوخساری نیگەرانی سادقی بینی هەناسەیەکی ئاسودەی هەڵکێشاو فرمێسکەکانی سڕی، سادق وتی:

- بۆچی گریاوی؟ دایکت حاڵی خراپ بووە؟

شەقایق بەدەنگێکی لاواز وتی:

- نەخێر، من تەنیا خەریکی بیرکردنەوە بوم لەشتێک.

سادق بەتانەوە وتی:

- بیرت لەشتێکی سوتێنەر کردوەتەوە کە فرمێسکەکانی تۆی دەرکردوە! بزانم، نەوەک بیرت لەپیاز کردبێتەوە؟

شەقایق زەردەخەنەیەکی کردو بێدەنگ بوو، دەزوی بەدەرزییەکدا کرد کۆپلنەکەی پێبدورێت، سادق دڵی پڕ لەقسە بوو کە دەیویست هەمووی بڵێت، بەڵام لەوانەیە شەقایق حەزی نەکردبێت گوێبیستیان بێت یاخود لەوانەیە شەقایق ئەو کەسە نەبێت کە دەبوایە گوێ لەو قسانە بگرێت، بێ خواستی خۆی وتی:

- ئەم کۆپلنە هینی خۆتە؟

شەقایق وتی:

- نەخێر هینی ئامۆژنێکمە، خۆی ئیشی هەبوو، دای بەمن تا بۆی تەواوبکەم.

سادق وتی:

- دەتەوێت یارمەتیت بدەم؟

شەقایق بەسەرسامییەوە ئەبڵەقی بوو، وتی:

- مەگەر تۆ دەزانیت؟!

سادق پێکەنی‌و وتی:

- یانی ئەوەندە سەیرە!

شەقایق وتی:

- باشە کەسێک نەتوانێت قۆپچەی کراسەکەی بدورێتەوە، ناتوانێت ئەمەش بکات.

سادق هێواش وتی:

- ئەویش دەزانم، بەڵام تاقەتم نییە.

شەقایق وتی:

- زۆرباشە تاوەکو من چا دێنم تۆ دەزووەکە بکە بەدەرزییەکەدا.

سادق پرسی:

- جیاوازی نییە هەر ڕەنگێک بدورم.

شەقایق وتی:

- نە.

سادق لەکاتێکدا لەنێوان دەزووەکاندا بەدوای دەزوی سوردا دەگەڕا، هێواش وتی:

- تەنیا ڕەنگی سور.

شەقایق سینیە چاکەی لەبەردەمی داناو بەپێکەنین وتی:

- بزانم تۆش هەواداری تیپی پرسپولیسی؟ یانەیەکی ئێرانە کە جلەکانیان ڕەنگی سورە.

سادق وتی:

- نەخێر، زۆر حەزم لەتۆپی پێ نییە، تەنیا زۆرانبازی.

بۆ ساتێک بێدەنگی برپاردەربوو، لەکۆتایدا شەقایق وتی:

- بەراست تۆ ئیشت چییە؟ یانی چیکارەی؟

سادق بەسەرسامییەوە:

- واتە تۆ نازانی؟!

- باشە، نە.

سادق لەگەڵ خۆیدا وتی:

- باشە هەقیەتی، ئێمە هەمیشە تەنیا کاتی شەڕکردنمان هەبووە.

پاشان وتی:

- ئیشی دەستی، شیشە، گۆزە دروستکردن، ئێستاش بازاڕی دار ڕەواجی هەیە، لەسەر دار شیعر دەنوسینو دەیفرۆشین، دوکانێکیشم هەیە.

شەقایق وتی:

- ئەو نەخشە کە بەدیوارەکەوەیە لەئیشەکانی خۆتە!

سادق وتی:

- بەڵێ، شیعری لەسەر نەخشەکەش هینی خۆمە!

شەقایق پێکەنیو لەژێر لێوەوە وتی:

- باوەڕ ناکەم!

سادق پێکەنیو وتی:

- باوەڕ بکە، تەنیا سێ دێڕی شیعرەکەم نوسیووە، ئەگەر بمویستایە هەمووی بنوسم دەبوایە دارێکی گەورەیان بدامایەتێ.

دەنگی دەرگاکە بەرزبوەوە.. سادق سەری بەرزکردەوەو خاتوو ئەکرەمی بینی، لەژێر لێوەوە وتی:

- ئۆی ئەم ژنە فیتنەیە هەمدیس دەرکەوتەوە.

سادق هەستاو بەبێ وتنی هیچ قسەیەک ڕۆیشت، بەڵام کاتێک چونەدەرەوە گوێی لێبوو کە خاتوو ئەکرەم بەشەقایقی وت:

- مەگەر لەگەڵ سادق ئاشتبویتەوە؟!

سادق حەزیدەکرد بگەڕێتەوە بەتەواوی وەڵامی ئەم ژنە فیتنەیە بداتەوە، لەدڵەوە وتی:

ئەوەندە فیتنەیە دەزانێت منو شەقایق بەیەکەوە قسە ناکەین.

خاتوو ئەکرەم کاتێک زانی نەنەگیان خەوتووە، چەند خولەکێک دانیشتو پاشان ڕۆیشت.

شەقایق لەگەڵ خۆی وتی:

- سادق هەقیبوو کە بڕوات، ئەم ژنە چەند فیتنەیە دەیەوێت سەر لەهەموو شتێک دەربێنێت.

شەقایق هەستاو خێرا بەرەو ژوورەکە ڕۆیشت، هیچ کاتێک بەقوڵیو بەوردی سەیری شیعری سەر نەخشەکەی نەکردبوو.

**بەبێ تۆ من ئەو یاخی بوەم.**
**کە لەتۆفانی چاوەکانت دڵم هەمیشە لەبەردەم بایە.**
**تەواوی شەو من لەیادت ئەو ڕیسوا بێ خەوەم.**
**کە چاوە پڕ هیواکانم گرفتاری عەشقی تۆیە.**
**هەمیشە لەعنەتو نەفرەت لەچاوەکانی خۆم دەکەم.**
**کە هەرچی دەکێشم ستەمی ئەم چاوە هەوەسبازییە.**

یانی بەراستی ئـەم شیعرە سـادق خـۆی وتـویـەتـی!.. من باوەڕناکەم لەم کارانە بکات، بەو ڕەوشتە توندوتیژەی ئەم شتانە دورەلێی!

دەنـگێک لـەژوورەکـەی نەنەگیان بـەرزبـووە، نەنەگیان بەدەنگێکی ئارام وتی:

- خاتوو ئەکرەم ڕۆشت؟

شەقایق دەرگای ژوورەکەی نەنەگیانی کردەوەو وتی:

- بەڵێ، ڕۆیشت.

نەنەگیان وتی:

- لەخوا بەزیادبێت کە ڕۆیشت، بەخەبەربوم کاتێک هات، بەڵام ئای چەند ڕقم لەم ژنە فیتنەیەیە وەک یەکێک لەخزمەتکارەکانی شەیتانە! چەندە باسی ئەمو ئەو دەکات.

نەنەگیان بۆ ساتێک بێدەنگبوو، پاشان سەیری دەوروبەری کردو بەردەوامبوو:

- سادق نەهاتوەتەوە؟

شەقایق وتی:

- هاتەوە، بەڵام کە خاتوو ئەکرەم هات، ڕۆیشت.

نەنەگیان وتی:

- مناڵەکەم هەقیەتی، ساڵی پار ئەم ژنە ئەوەندە لاپەڕەی بۆ ڕیزکرد کە خوا دەزانێت، هەرچی خەڵکیش دەداتە ناو دەمیدا نابێتە مرۆڤ، مرۆڤی ڕودار ئەمەیە!

پاشان بەردەوامبوو:

- دایکە بۆنێک دێت، شتێکت لەسەر تەباخەکە داناوە؟

شەقایق حەزی لەقسەکردنەکەی نەنەگیان بوو، هەمیشە لەم

چڵ بۆ ئەو چڵ بازی دەدا.

- بەڵێ، قیمەی باینجانم لێناوە.

- باشتکرد دایکە، ئێستا سادق دێتەوە ماڵەکە ئەخاتەسەر سەری!

شەو لەدەوری خوانی شێوان، سادق وەک شەوانی رابردو ماتو مۆن بوو، رەفتاری ساردو بێ بایەخی سادق بەشەقایقیش زۆری کردبوو، بێزارو تورەبوبوو، حەزیدەکرد هۆی هەڵسوکەوتەکانی بزانێت، مەگەر چی بووە واسادق دوبارە بەدرەوشتبووە، خۆ پاش نیوەرۆ چاکبوو، میهرەبانبوو، پێدەکەنی.

نەنەگیان کە چەند خولەکێک بوو، بێزاربوو لەرەفتاریان، لەناکاو بەبێ پێشەکی، بەئاوازێک کە تورەی تێیدا شەپۆلی دەدا، وتی:

- ئاە! مێشکم تێکچوو.

شەقایق خێرا وتی:

- وای نەنەگیان، حاڵت باش نییە!

نەنەگیان تورەتربوو دەستی خستەسەر ئەژنۆیو هەستا، ئەمجارە سادق پرسی:

- چی بووە نەنەگیان؟!.. دەڵێی حاڵت باش نییە دەتەوێت دەرمانەکانت.. ..

نەنەگیان قسەکی بەسادق بڕیو بەتورەیی وتی:

- ئێوە هەردوکتان چیتانە وەک بورجی ژەهری مار بەرامبەر بەیەک دانیشتون، ئیتر شەڕیش ناکەن چییە، چی بووە؟!

شەقایق بزەیەکی کردو وتی:

- دڵت بۆ شەڕەکانمان تەنگ بووە؟!
نەنەگیان ئارامتر لەپێش وتی:
- من لەئێوە، دوو گەنج قسەم زیاتر پێیە.. بابە قسەیەک بکەن.
سادق بەبێ هیچ پێشەکییەک وتی:
- نەنەگیان بۆچی ئەم خاتوو ئەکرەمە دێت بۆ ئێرە، هەرچی ڕێزی سەگیشی لێناگیرێت ڕوودارتر دەبێت!
نەنەگیان وتی:
- لەم بێ ڕێزییە زیاتر کە چوارجار هاتووە بۆ ئێرە ڕێزم لێنەگرتوە!.. باشە بەوتەی خۆت ڕوودارو بێ چاوو ڕووە، ئیتر!
شەقایق خوانەکەی کۆکردەوە، قاپەکانی شت، جێگە نوستنی داخست، بەڵام تازە دەمەتەقێی نێوان سادق‌و نەنەگیان گەرم دەبوو، بەقسەی نەنەگیان هێشتا نەگەشتبووە نیوە.
شەقایق هەستاو ڕۆیشتە حەوشەکە، چەندجارێک بەناو حەوشەکەدا سوڕایەوە.
دیسان دڵە خورتێ هاتبوە گیانی، ئەگەر مەنوچەر بهاتبایەتە تاران دەیزانی کە ئەو دوبارە لەماڵ نییە، بێگومان نەدەوەستاو دەستبەجێ بەرەو ئەوێ دەهات، بەڵام.. بەڵام مەگەر مەنوچەر خاوەنی ئەوە.
دەنگی"زیکەزیک"کەرەکان بێدەنگی شەوەکەی دەشکاند، سادق نەیدەتوانی بخەوێت، خەیاڵی ئەو قسانەی کە لەسەر دڵی بوو بوێری‌و تەنیایی نەبوو بێ خەویکرد بوو، هێواش لەجێگەکەی هەستاو خۆی گەیاندە سەربانەکە، جارجارێک جگەرەی دەکێشاو دڵی پڕبوو، لەخەیاڵەکانیدا نوقم بوو، لەناکاو

دەنگێکی لاواز لەکۆڵانەکەوە هێنایەوە هۆشی خۆی، ڕێبوارێک وەک خۆی بێخەو، خەریکی گۆرانی وتنبوو، گۆرانیەکی غەمگین کە سادقی خستە خەیاڵەوە:

**ئەمە بۆنی نامۆیی ڕێگە نییە.**

**بۆنی ئاشنای عەشقە.**

**لێدانی دڵی زەوی نییە.**

**ئەم دەنگە، دەنگی عەشقە.**

**ناوی تۆ گەرمی شەرمە لەبۆشایی ساردی زستاندا.**

**ویستی تۆ ئەستێرەیەکە لەپشت ئەم هەورە قورسانەوە.**

دەنگەکە لەچۆڵی کۆڵانەکەدا نەما، بەڵام، کاریگەری هێشتا لەبیری سادقدا مابوو، هێواش وتی:

- ناوی تۆ گەرمی شەرمە.. وەک شەرمی گەرمو سور وەک ناوی شەقایق.

هەستێکی خۆش تەواوی لەشی داگرتبوو لەشەوێکی پڕچێژدا نوقمی کردبوو.

- دایکە لەسەربان خەوتوە، دەترسم بانگی بکەم!

نەنەگیان بەسەرسامی وتی:

- وای!.. بۆچی ڕۆیشتوەتە سەربان.. باشە هەر لەخوارەوە بانگی بکە، دوا دەکەوێت ها!

تا شەقایق ویستی سادق بانگبکات ئەو لەپلەکانەکان هاتەخوارەوە.. وەک منداڵ چاوەکانی پاککردەوەو بەیانی باشی کرد، شەقایق زەردەخەنەیەکی بەڕویدا کردو بەلایدا تێپەڕی.

سادق سەیری سەعاتەکەی کردو بەخێرای بەرەو لای

ژوورەکە ڕۆیشت، دوو خولەکی پێنەچوو بەئامادەیی لەسەر خوانەکە دانیشتبوو، بەکورتی وەک هەموو ڕۆژێک خێرا، بەنیوەو ناتەواوی قاوەڵتییەکەی خواردو لەماڵ ڕۆیشتە دەرەوە، بەڵام تاسەر کۆڵانەکە ڕۆیشتو یەکسەر وەستا، دڵی دەیویست بگەڕێتەوەو بپرسێت کە شەقایق ئەمڕۆش دەمێنێتەوە یان نە؟ دودڵبوو کە بگەڕێتەوە یان بڕوات، بەڵام داینا کەبڕوات، چونکە ئەگەر بیزانیایە شەقایق دەڕواتەوە، بێگومان تەواوی ڕۆژەکە نارەحەتو بێتاقەت دەبوو.

شەقایق دوبـارە وەک ڕۆژی پێشوو لەسەر هەیوانەکە دانیشتبوو، بەڵام کە هەر دەستی دەکرد بەدورینی کۆپلنەکە یەکسەر قسەکانی مەنوچەر دەکەوتەوە بیری، لەوانەیە ئێستا گەڕابێتەوە بۆ مـاڵ، خۆزگە مونیرە دەهـاتو دەیـبـردەوە بۆ ماڵەوە، شەقایق لەوە دەترسا کە مەنوچەر بێت بۆ ئەویێ.

- شەقایق چی بووە؟

- وای.. تۆی، ترسام.

سادق بەهێواشی:

- بیر لەچی دەکەیتەوە؟ ها!.. حەزدەکەم بزانم چی ئەوەندە خەیاڵی سەرقاڵ کردویتو هۆشت لەلای خۆت نییە.

شەقایق بێدەنگبوو، سادق چاوەڕێی وەڵام بوو، خەیاڵێک هەر وەک هەورەبروسکە بەمێشکی شەقایقدا هات، بەپەلە وتی:

- شتێک بڵێم سادق؟

سادق پێکەنیو وتی:

- باشە بیڵێ، من چاوەڕێم کە بیبیستم.

شەقایق هێواش وتی:

- دەزانیت کچێک عاشقت بووە؟!

سادق بەبیستنی قسەکەی شەقایق غافڵگیربوو.

خوایەگیان، سوپاس خۆی دەستپێشخەری کرد، ئەگینا من بوێری ئەوەم نەبوو کە بڵێم خۆشم دەوێی، ئاخر من لەکوێ و ئەو لەکوێ..

بەپێچەوانەوە، شەقایق لەخۆشییەکەی سادق بێتاقەتبوو، بەڵام باشە، ئێستا زانیبوی کە سادق کچی دراوسێکەیانی خۆش دەوێت، سادق دەستەکانی بەدەوری قاچیدا سوڕداو پرسی:

- باشە ئەو کچە کێیە؟

شەقایق ئەبڵەقی بەرامبەری بوو وتی:

- ئەوەتا لەوێ وەستاوە.

سادق سەرسامانە سەیری ئەو شوێنەی کرد کە شەقایق ئەبڵەقی بوو،، تورەبوو، بۆ ساتێک وایدەزانی کە شەقایق خۆی وتووە، هەستاو بەسەیرکردنێکی کیناوی ئەبڵەقی بوو نەیدەزانی چی بڵێت، بەتەواوی توڕەبوو، بەچەند وشەیەکی پچڕپچڕ وتی:

- یانی تۆ.. تۆ بەمجۆرە بیردەکەیتەوە؟

شەقایق سەریکردە خوارو بەساردییەوە وتی:

- بەسەیرکردنیت زانیم!

سادق دانیشت، ڕێک بەرامبەری، بەقینەوە سەری شەقایقی بەرزکردەوەو بەهێواشی، بەڵام بەتوڕەیی وتی:

- بەچاوی منیشدا زانیت؟

شەقایق سەیری چاوەکانی سادقی کردو کە تەنانەت کاتی توڕەیش بێتاوان دیاربوو، هێواش بەدەنگێک کە لەناڵەی دەکرد وتی:

- نه.. .

سادق هەستایەسەرپێو بەهەمان ئاواز بەردەوامبوو:

- کام گێلە وتویەتی کە دڵ ڕێگەی هەیە بۆ دڵ..

پاشان خێرا لەماڵ ڕۆیشتە دەرەوە، دەنگی نەنەگیان بەرزبووە:

- چییە دوبارە شەڕتان کرد؟

شەقایق لەگەڵ خۆیدا وتی:

- نازانم، یانی ئەمەش شەڕ بوو، یانی دوبارە دەتۆریێ؟

شەو هات،، سادق هێشتا نەگەڕابووە، شەقایقو نەنەگیان نانی شێوانیان لەبێدەنگیدا خوارد، نیو سەعات بەیەکەوە قسەیانکرد کاتێک نەنەگیان خەوت شەقایق ڕۆیشتە حەوشەکە، لەحەوشەکە لەلای دار هەنارەکە وەستا، سادق زوو دەرکەوت، شەقایق لەبەری خۆیەوە:

- خۆزگە زوتر بهاتمایەتە حەوشەکەوە!

سادق هێواش وتی:

- بۆچی لەوێ دانیشتویت، لەم تاریکیەشدا!

شەقایق هەستا هەوڵیدا زۆر ئاسایی قسەبکات:

- لەمن تۆراوی؟

سادق شتێکی نەوت، بەڵام ڕاست سەیری شەقایقی کرد، لەسەیرکردنی سادقدا شتێک نەبوو، نەمانایەکی تایبەتی کە ڕوناکیو خۆشەویستی لێوەدەربچێت، بەڵام هەر ئەو نیگا وشکو بێگیانە توانی دڵی شەقایق بکاتەوە.

سادق هێواش وتی:

- من هەر ناتوانم مەتەڵ هەڵبهێنم.

شەقایق بەنیگایەکی پرسیارگەرانە تەنیا ئەبڵەقی بوو، سادق ئارامتر لەجاران بەردەوامبوو:

- ئاخر هەرچی زیاتر سەیرت دەکەم کەمتر دەتناسم.. نیگات وەک ڕازێکە، عەسر کاتێک وتت کچێک.. وازی لی بێنە، ناتەوێت بخەویت؟

شەقایق هیچی نەوتو تەنیا تەماشای دەکرد وەک بڵێی چاوەڕێ بوو هەمدیس قسەبکات، سادق پێکەنینێکی شاراوەی خستەسەر لێویو بەرامبەری وەستاو بەئاوازێکی فەرماندەرانە وتی:

- شەوێک درەنگ لەکاتی گەڕانەوەمدا، یەکسەر دەنگێک لەتاریکیەکەوە هات، ئەو کاتە دوچاوی سەوز لەتاریکی کۆڵانەکەدا درەوشایەوە، سەرەتا وامزانی ئەمە چاوی تۆیە، بەلاّم پاشان زانیم کە ئەو چاوە چاوی پشیلەیەکی ڕەش و ناشیرین بوو!

شەقایق سەرەتا جێگۆڕکێی کرد، پاشان بەتوڕەییەوە:

- زۆر بێتامی..

## بەشی چوارەم

"٣٩"

شەقایق تازە خوانەکەی دادەخستبوو کاتێک دەنگی لێدانی دەرگا بەرزبووە، بێخواست کەوتە دڵەخورتێ، نەوەک مەنوچەر بێت، لەسەر هەیوانەکە بەدەنگێکی لەرزۆک پرسی:

- کێیە؟

ئاشنای دەنگی مەنیجە بوو، شەقایق هەناسەیەکی ئاسودەی کێشاو بەرەو حەوشەکە ڕایکرد مەنیجە وەک هەمیشە لەڕێگەوە نەگەشتبوو دەستی پێکرد پێکەنیو وتی:

- بۆ نیوەڕۆ چیت دروستکردوە؟

- دەم پوختەک.

شەقایق باش دەیزانی کە پوری ڕقی لەم چێشتەیە، مەنیجە ناوچاوی گرژکردو وتی:

- من لێوی پێوە نادەم!

نەنەگیان لەژوورەکە دانیشتبوو، بەبزەوە وتی:

- هێشتا نەهاتوی دەستت پێکرد؟

شەقایق مەنجەڵی چێشتەکەی هێنا.

- پورێ، فاتمە لەکوێیە؟

مەنیجە بەدەمی ئاوخواردنەوە وتی:

- ڕۆیشتوە بۆ لای دوانەکان.

شەقایق پرسی:

- پوری، لەئاکامدا ناوی منالّەکانتان نا چی؟

مەنیجە وتی:

- بڕیاریان لەسەر "میناو ڕەزا" دا، ئیتر ازانم دەگۆڕێت یان نە؟

نەنەگیان ئاهێکی هەڵکێشاو وتی:

- مەنیجە زۆر حەزدەکەم منداڵەکانی فەریبا ببینم، دوێنێشەو خەوم بەدایکمەوە بینی خوا لێی خۆش بێت.

نەنەگیان کەمێک وەستاو وتی:

- وابزانم کاتی ڕۆیشتنم هاتووە!

مەنیجە مۆنەیەکی کردو وتی:

- نەنەگیان توخوا ئەم قسانە مەکە.

نەنەگیان ئاهێکی درێژی هەڵکێشاو وتی:

- ئێستا چی بووە کە بەم ڕۆژە هاتوی بۆ ئێرە؟

مەنیجە وتی:

- هیچ بابە، دوێنێشەو هات بۆ ئەوێ، دەیوت دایکە نازانم چی بکڕم بۆ فەریبا.

- تۆ سبەینێ وەرە بۆ ماڵ نەنەگیان منیش مۆڵەت وەردەگرم کە بەیەکەوە بڕۆین شتێک بۆ فەریبا بکڕین.

لەدەرگا درا، مەنیجە وتی:

- خۆیەتی!

پاشان بەشەقایقی وت:

- تا تۆ دەرگاکە دەکەیتەوە، من چێشتەکە دەهێنم.

شەقایق هەستاو دەرگای حەوشەکەی کردەوە، سادق بەبێ پێشەکی وتی:

- دایکم لێرەیە؟

شەقایق وتی:
- بەڵێ، سڵاوەکەت لەبیرچوو!
سادق سەری باداو وتی:
- سەرەتا سڵاو پاشان، بزانم هەموو ژنێک وایە؟
- چۆن؟
سادق وتی:
- هەر ئەوەی کە مرۆڤ بێزاردەکەن.
شەقایق وتی:
- نەخێر هیچ کامیان بەمجۆرە نییە!
سادق زەردەخەنەیەکی شەیتانی خستەسەر لێوی‌و وتی:
- ئەگەر هیچ کامیان وانەبن یەکێکیان تەمەنێکە کڵاوی خستوەتەسەرم!
شەقایق تەماشایەکی کرد، بەڵام سادق سەیرکردنەکەی بێوەڵام دانا، مەنیجە بەشێوەی پرسیارگەرانە وتی:
- نەنەگیان سادق‌و شەقایق ئاشتبونەتەوە؟!
نەنەگیان وتی:
- بەڵێ، بەڵام مەیدە لەروی، سادق لەخۆبایيە، ئەگەر قسەیەکی بێپەیوەندی بۆ بکەیت دوبارە دەبێتەوە کورە خراپ‌و لەخۆرازییەکە!
لەسەر خوان مەنیجە وتی:
- نەنەگیان تۆ بڵێی.. من دەڵێم ئێستا کە پارەکەت ئەوەندەیە پارچەیەک ئاڵتون بکڕە.
سادق وتی:
- ئاخر دایکە خۆت دەڵێیت هێشتا دیارنییە، ناویان ڕەزاو

مینا بێت!

مەنیجە وتی:

- ناوی ڕەزا تازە پەسەند کراوە، ئیتر قسەشی ناوێت.

شەقایق وتی:

- باشە گوارەیەکی ئاڵتونیش بۆ کچەکە بکڕن!

نەنەگیان بەپێکەنینەوە:

- ڕاستیان وتوە لەهەر مێشکێکدا خەیاڵێک هەیە، شەقایق ڕاستدەکات!

سادق وتی:

- دایکە باشە یان نە؟

مەنیجە وتی:

- بەڵێ، باشە.

شەقایق وتی:

- بەڕاست فاتمە دەیەوێت چی بکڕێت؟

مەنیجە بەخۆشحاڵییەوە:

- دەمویست ئەمە بڵێم.. باشبوو وتت فاتمە خەریکبوو لەبیرمدەچوو، پێنج شەممەی ئەم هەفتەیە بڕیاروایە داواکاری بێت!

شەقایق وتی:

- ڕاست دەکەیت، پوری!

مەنیجە ئەمجارە بەئاوازێکی خەفەتبار وتی:

- بەلام دەڵێت نامەوێ، دەڵێت شەقایق لەمن گەورەترە، یەکەمجار دەبێت ئەو شوبکات.. مەنیجە بەپێکەنینەوە بەردەوام بوو:

- پوریَ بۆچی مێرد ناکەیت؟

نیو کاتژمێر دەبوو کە باسەکە بەدەوری شوکردنی شەقایقدا سورپیدەخوارد، لەم نێوەندەدا سادق بێدەنگی هەڵبژاردبوو، خۆزگە ئەوەندە بوێری هەبوایە کە قسەکانی ناخی بکات.

عەسر کاتێک مەنیجەو سادق لەشتکڕین هاتنەوە، مونیرەش هاتبوو، شوێنی فاتمە بەتەواوی چۆڵبوو، سادق وەک هەمیشە دور لەکۆمەڵەکە لەسوچێکدا دانیشتبوو، کاتێک شەقایق چای بۆ برد، لەسەیرکردنیدا ڕوناکییەک درەوشایەوەو تەواوی توانای خۆی کۆکردەوە بۆ وتنی وشەیەک، بەڵام بەهێواشی وتی:

- بمێنەرەوە.. ئیشم پێتە.

شەقایق بەسەرسامی لەئاوازی پاڕانەوەکەی دانیشت، سادق بەشێوەی دڵرەنجان وتی:

- نە، ئەویَ نە، لەسەر قادرمەکە.

شەقایق وتی:

- یانی پشتم لەتۆ بێت؟

سادق سەری کردەخوارو بەهێواشی وتی:

- دەمەوێت شتێکت لیَ بپرسم.. بەڵام شەرمدەکەم.

شەقایق بێخواست وتی:

- بەو چاوانەوە نایەت کە ئەوەندە شەرمن بێت!

سادق سەیرێکی ماناداری کردو بەچەند وشەیەکی وەک چپە وتی:

- تۆ ئامادەی ڕۆژێک لەگەڵ من،.. زەماوەند بکەیت؟

شەقایق بەبیستنی ئەم ڕستەیە کە بەڕاستگۆیی پێی وترا، بەشەرمنی سەری کردەخوار، بێدەنگی شەقایق زۆر درێژبووە،

سادق هێواشتر لەپێش وتی:

- خۆ پەرستم کە ئەمەم پێ وتی، هەر لەبیری..

شەقایق بەبێ پێشەکی، بەڵام بەدەنگێکی هێواش وتی:

- ئامادەم ئەگەر تۆ ئامادەبیت لەگەڵ کچێکی خۆهەڵقورتێن..

دەنگی مونیرە یەکسەر کۆڕی عاشقانەیانی تێکدا، دەنگێکی لاواز لەقوڕگی سادقەوە دەرچوو:

- ئاخ حەیف!

مونیرە هاتە هەیوانەکە.

- هەستە شەقایق.

سادق هەستاو وتی:

- بۆ کوێ پوری؟

- بڕۆین ئیتر.. تەنیا زەحمەتێک کەوتەسەر تۆ.. سبەینێ وەرە بەشوێن شەقایقدا بیبە بۆ ماڵ فەریبا!

سادق بەسەرسامییەوە پرسی:

- مەگەر سبەینێ خۆت نایەیت بۆ ئەوێ؟!

مونیرە لەکاتێکدا کە عەباکەی ڕێکدەکرد وتی:

- هەموو کارێکم کرد تاوەکو پێش سەعات چوار مۆڵەتم بدەنێ، نەیاندا، منیش تا ئەوکاتە خۆم دەگەیەنم.

سادق وتی:

- باشە، سبەینێ دەڕۆم بەشوێن شەقایقدا.. دەڵێم پوری باشە بهێڵە شەقایق لێرە بمێنێتەوە!

مونیرە وتی:

- نە پوری گیان، ئیشی هەیە....

کاتی خواحافیزی سادق بەهێواشی بەشەقایقی وت:

- زوتر دێم بەشوێنتدا....ئیشم پێتە.
دوای ئـەوان مەنیجەش ڕۆیـشـت، سـادق خۆشحاڵبوو، لەخەیاڵیدا تەنیا خۆی‌و شەقایق هەبوون، ئیتر بۆ هیچ کەسێک لەجێگەیەک نەبوو، دەیتوانی هەتا بەیانی بیر لەو دوو چاوە خوماراوییە سەوزە بکاتەوە، لەناکاو بەنەنەگیانی وت:
- نەنەگیان بەبڕوای تۆ پورم دەهێڵێت من لەگەڵ شەقایقدا زەماوەند بکەم؟
نەنەگیان بەوردی سەیری سادقی کردو بەئاوازێکی هێمادار وتی:
- خۆ تۆ ئەم قسەیەت بەڕاست نەکرد؟!
سادق لەلای پەنجەرەکە دانیشتو بـەرەو ڕوی نەنەگیان سوڕاو بەسەرسامییەوە وتی:
- بۆچی، زۆر بەڕاستی وتم:
نەنەگیان وتی:
ئەو کاتە کەپێم دەوتی شەقایق کچێکی باشە، خزمە، جوانە.. دەتوت ئەم کچە بەکەڵکی من نایەت!
سادق بەهەراسانی وتی:
- مەگەر ئێستا چی بووە؟
نەنەگیان وتی:
- کەسێک لەتۆ باشتر، پێشتر شەقایقی ڕازیکردوە.
سادق بەهەمان ترسەوە پرسی:
- کێیە، نەنەگیان؟
نەنەگیان وتی:
- کوڕە مامەکەی، مەنوچەر

سادق بەگاڵتەپێکردنەوە:

- ئەو ئوتوکراوە مناڵە! ها، مەگەر گەورە بووە؟

نەنەگیان وتی:

- پورت دەڵێت عاشقی شەقایق بووە، دەڵێت کوڕێکی باشە، شەقایقی دەدەمێ! تازە شەقایقیش ڕازییە.

سادق لەلای پەنجەرەکە هەستاو بەسەرسامییەوە وتی:

- شەقایق ڕازییە؟!

- بەڵێ، مەگەر کوڕەکە چییەتی؟

سادق بەرامبەر نەنەگیان دانیشتو وەکو منداڵ وتی:

- مەگەر من چیمە؟

نەنەگیان ڕاست سەیری چاوەکانی کرد، وتی:

- تەنیا گێلی، کچت نەناسیوە، سادەی؟!، کچ پەیوەندی بەیەکرەنگییەوە نییە، هەموو مێشکی لەچاویدایە، مەنوچەر جوانە، پارەی هەیە، وەک تۆ گێل نییە کە ڕۆژێک لەگەڵ یەزیدی‌و ڕۆژێک دەبیتە شمشێر بەدەستی ئیمام حسین!

سادق کینەیەکی خواردەوەو وتی:

- بۆچی شەقایق هیچی بەمن نەوتووە؟!

نەنەگیان بەتوڕەییەوە:

- مەگەر تۆ خاوەنی شەقایقی کە هەموو شتێک بخاتە دەستت؟!

سادق بێدەنگبوو، لەگەڵ خۆیدا وتی:

- دەی بۆچی وتی ئامادەیە شوم پێبکات.. یانی پشیلە سەمادەکات؟.. نەوەک بیەوێت تورەم بکات؟.. نەوەک بیەوێت کڵاوم لەسەر بنات؟ لەوانەیە دەیەوێت پێم پێ بکەنێت، وای

تۆ چەند خۆشباوەڕی، خۆتکردوەتە هاوتای ئەو شارەزایە، مەنوچەر! مەگەر شەقایق شێتە شوو بەتۆ بکات، بێگومان ئێستا قاقا بەقسەکانت پێدەکەنێت خۆڵبکە بەسەر سەرە سادەکەتدا، ئاخر بۆچی وتت خۆشتدەوێ؟.. نە! من نەموت خۆشم دەوێ، وتم تۆ ئامادەی لەگەڵ مندا زەماوەند بکەی، ها، ئەویش چەند خولەکێک بێدەنگبوو بیری کردەوە چۆن تۆ کەر بکات، ئاخ چەند سادە کەری کردم، بەوشەیەک منی کردە مۆم، چەند سادەم چ خەیالاتێک دابوی لەسەرم، ئەو منداڵە کڵاوی نایەسەرم!

کینەیەکی گەورە گەروی گرتبوو، لەو کاتەدا دوڕویی ژن بۆ سادق لەخەنجەر تیژتر بوو، لەژەهری مار سوتێنەرتربوو، لەچەکوشی ئاسن قورستربوو، ئەو لەوکاتەدا تەنیا شەقایقی بەتاوانبار دەزانــی، ئەستێرە گـەورەو بچوکەکان بەبڵاوی لەئاسمان خەوتوو، نەخەوتوو هەموویان تەماشای سادقیان دەکرد، سادق هەندێکجار بۆ نەهێشتنی توڕەییەکەی جگەرەکەی دەکێشاو دور لەسەیرکردنی مانگ فرمێسکی دەڕشت، هیچ کاتێک خۆی بەم گێلیو بچوکییە نەبینیبوو، چۆن کچێک بەچەند وشەی سادە یاری بەهەستی دەکرد، هەرگیز نەیدەتوانی لێی ببورێت، چاوی کەوت بەکاغەزەکەی گۆشەی سەربان، دوبارە کاغەزەکەی هەڵگرتو سەیرێکی نوسینەکانی سەری کرد:

**نیگای سەوزی چاوەکانت لەسەرم دەرناچێت**
**جگە لەگرتنی دەستەکانت مەگەر ئەم دڵە چی دەوێ؟..**

ئەو ڕۆژانەی کە لەگەڵ شەقایقدا شەڕی دەکرد، ئەو ڕۆژانەی چێژی لەتوڕەبونی شەقایق وەردەگرت، تەنانەت ئەو کاتەی کە بەنەنەگیانی دەوت ڕقی لەشەقایقە، ئەوی خۆشدەویست، هەمیشە لەخەیاڵیدا، لەخەیاڵی شەوانەیدا ئەوی لەجلی سپی بوکدا دەبینی لەپاڵ خۆیدا.

حەزیدەکرد دڵبداتە کچێکی ناسک، بەڵام هیچ کاتێک بیری لەوە نەکردبووە کە لەوانەیە کەسی سێیەمیش لەنێواندا بێت، لەوانەیە دڵێکی تریش بۆ شەقایق لێبداتو یاخود مێشکێکی تر بیر لەشەقایق بکاتەوە، هیچکات لەزمانی شەقایقەوە قسەیەکی لەبارەی مەنوچەرەوە نەبیستبوو، هیچکات بیری نەدەکردەوە کە شەقایق دڵی دابێت بەئەو!

ئەم خۆپەرست بوو یان شەقایقو یان مەنوچەر..؟

"٣٠"

نەنەگیان بەیەکەوە بڕۆین بەشوێن..

نەنەگیان بەتوڕەییەوە وتی:

نەنگی تۆ ئەمەیە، هەمیشە دەتەوێ ڕابکەیت، بۆ جارێک ڕووبەڕوی قسە بکە.. خەیاڵیشت ئاسودە دەبێت.

سادق وادیار بوو کە وەڵامی دراوەتەوە، کاتێک نەنەگیان ڕۆیشت بۆ ماڵ فەریبا بەپێ دواخستن چوو بەشوێن شەقایقدا.

لەدەرگای داو لەلایەک وەستا، دوبارە توڕەیی هاتەوە بۆ لای، لەگەڵ خۆیدا وتی:

- من نەئەبوایە گوێم لەقسەکانی نەنەگیان بگرتایە، ئێستا خۆمم زۆر سوک کردووە کە هاتووم بەدوایدا.

- سڵاو.. !

دەنگی شەقایق زنجیرەی خەیاڵەکانی لەیەککردەوە، هەر بەو جۆرەی کەسەری لەخوار بوو هێواش وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، سەری کردەخوارو کەوتەرێ، شەقایق سەری سوڕمابوو، بەڵام بێ ئەوەی قسەیەک بکات بەدوایدا هەنگاوی هەڵگرت، تەواوی خەیاڵە ئاڵتونییەکانی شەقایق بەرەفتاری ساردی سادق لەناوچوو، هەمیشە هەر بەمجۆرەیە کاتێک مرۆڤ وابیردەکاتەوە کە هەموو شتێک تەواوبووە، دەستبەجێ دەزانێت تازە سەرەتای بەسەر هاتەکەیە، شەقایق بێتاقەت بوو، بەتوڕەییەوە:

- سادق! ئارامتر ڕێ بکە، من ناتوانم توند ڕێ بکەم.

لەشەقامەکە ڕوداری ئۆتۆمبیل ڕوویدابوو ڕێگەکان قەرەباڵغبوو، لەبەر ئەمە ئاراستەیان گۆڕی بۆ ناو باخچەیەکی بچوک، شەقایق تەواو توڕەبوو، سادق ڕقی لەخۆی بوو لەوەی کە ناتوانێت قسەکانی بکاتو توڕەبوو، لەناکاو شەقایق وەستاو وەک مناڵە تۆراوەکان وتی:

- من چیتر ڕێناکەم!

سادق ڕویکردە لای، سەیریکردو وتی:

- بۆچی؟!

شەقایق لەسەر کورسییەک دانیشتو وتی:

- تا نەڵێی چیتە، ڕێت لەگەڵدا ناکەم!

سادق دەستیکرد بەگیرفانیداو لەکاتێکدا بەرەو لای ئەو هەنگاوی دەنا بەئاوازێکی ئارامو خوێنساردییەوە وتی:

- ناتوانم درۆت لەگەڵدا بکەم، ڕقم لێتە، تێکدەچم کاتێک

تەماشای دەموچاوت دەکەم.

شەقایق وەک پەیکەر ماتبوو، بەدەنگێکی لاواز وتی:

- تۆ.. تۆ لەگەڵ مندای؟!

سادق بەرامبەری وەستاو هاواریکرد:

- بەڵێ لەگەڵ تۆدام، بێوەفا!

شەقایق بەدەم فرمێسکرشتنەوە ئەبڵەقی بوو، ئینجا بەتوڕەییەوە:

- کیومەرس ڕاستی دەکرد کە تۆ مرۆڤێکی پیسی.

سادق بەرامبەری وەستاو وەک ئەو بەتوڕەیی وتی:

- دەتویست پێی بڵێی کە خۆت باڵەیەکی، حەزدەکەم وەک دەسرێکی چڵکنو پیس بتخەمە ناوەڕاستی شەقامەکە!

شەقایق ڕاست ئەبڵەقی چاوانی سادق بوو، لەنێوان توڕەیدا چاوەکانی دەیانتوانی شتێکیتر ببینن، نیگایەک کە بەپاڕانەوە ڕویتێکردبوو، هێواش وتی:

- چییە بەشەوێک دام لەدڵت؟

سادق پێکەنینێکی مەبەستداری کردو دەستی بەداری پاڵ کورسییەکەوە گرت.

- تۆ بەمشێوەیە سەیری مەنوچەریش دەکەیت؟!

شەقایق پێکەنینێکی توڕەو کورتی کردو لەنێوان پێکەنیندا بەئاوازێکی کیناوی وتی:

- کەواتە ئەو هاتووە بۆ لات.

- نەخێر، ئەو نەهاتووە، نەنەگیان پێی وتم کە عاشقتە!

سادق کەمێک وەستاو پاشان بەشێوەی چپە بەشەقایقی وت:

- تۆ دەتویست گاڵتەم پێ بکەیت، دەتویست پێم پێ بکەنیت،

لەلای خۆتەوە وتت باکلاو بخەمەسەری، گاڵتەت پێ بکەم، بابێتە داوام پاشان کاتێک زانی مەنوچەر عاشقمە خۆی دەڕوات، دەڕوات بەگێلی خۆی پێدەکەنێ، لەوانەیە وتبێتت لەخەفەتدا دیق دەکات، شێت دەبێت گرفتی من نییە!.. دەیتوانی عاشقم نەبێت.

شەقایق وتی:

- خۆت دەزانیت هەموو ئەم قسانە درۆیە!

سادق بەبێبایەخدان بەتوڕەییەوە:

- من نەمدەویست عاشقت بم، تۆ ویستت، تۆ کردت، تۆ هەر سەیری منت کرد تۆ منت..

شەقایق وتی:

- من!.. من بەدبەختم کردی؟! دەی بڕۆ بابەدبەخت نەبیت، من وامدەزانی مەنوچەر منداڵە، بەڵام تۆ لەو منداڵتری، تۆ.. هەر شێتی، تۆ ئەگەر دوێنێ ئەو قسانەت نەدەکرد من شتێکم نەدەزانی خۆ من قسەیەکم نەکرد، مەگەر من شێتم کە ڕۆژێک لەگەڵ شێتێکی وەک تۆدا لەژێر سەقفکێدا ژیان بەسەربەرم!

سادق وتی:

- تۆ درۆت لەگەڵ من کرد.. تۆ پێتنەوتم مەنوچەر خۆشی دەوێ.

شەقایق وتی:

- منیش ئەوم خۆشدەوێ نەک بەو جۆرە، خۆشم دەوێ، چونکە هەمیشە ئاگای لێمە، چونکە ئامۆزامە!.. هەندێ کات بیردەکەمەوە کە ئەگەر برام هەبوایە لەوانەیە وەک مەنوچەر بوایە، بەڵام هیچکات لەبیرمدا نەهاتوە کە ڕۆژێک لەگەڵ ئەودا..

من درۆم لەگەڵتدا نەکرد، هەرچیم پێ وتی ڕاستە، هیچ کاتێک نەمویستوە پێت پێ بکەنم، تەنانەت کاتێکیش کە شەڕم لەگەڵدا دەکردی.

سادق لەپاڵیدا دانیشتو لەسەر کورسییەکە وتی:

- یانی لەسەر قسەی خۆتی؟

- بەڵێ.

سادق وتی:

- یانی تۆ ئامادەی واز لەمەنوچەر بێنیت و، لەگەڵ مندا بمێنیتەوە؟

شەقایق سەری کردەخوارو وتی:

- بەڵێ ئامادەم!

سادق وتی:

- دەی مەنوچەر چی لێدێت؟

شەقایق وتی:

- خۆ من بەڵێنم پێنەداوە وابیردەکاتەوە کە هەرچی بڵێت دەبێ ئەوەبێت، بەڵام من نامەوێت!

سادق وتی:

- یانی بەڵێنم دەدەیتێ؟!

شەقایق سەیرێکی چاوە خەفەتبارەکانی کردو وتی:

- بەڵێ، بەڵێن دەدەم!

## بەشی پێنجەم

"٣١"

- شەقایق ماوەیەکە زۆر لەخەیاڵدای!

شەقایق چاوی لەسەر حەوشەکە لابردو ئەبڵەقی پەنجەرەکە بوو، نەیدەزانی چۆن قسەکەی دەست پێبکات، کارێکی سەخت بوو، بەهێواشی وتی:

- ئەمڕۆ لەگەڵ تۆدا نایەم بۆ ماڵ نەنەگیان!

مونیرە سەری بەرز کردەوەو بەسەرسامییەوە:

- نایەیت؟!.. بۆچی؟

مونیرە بەبێزارییەکەوە وتی:

- دوبارە شەڕتکردوە لەگەڵ سادقدا؟

شەقایق سەری کردەخوارو وتی:

- سادق.. ئیشی پێتە.

مونیرە هەستاو چووە تەنیشتی، سەرسامانە وتی:

- چ کارێکی بەمن هەیە؟!

شەقایق دوبارە بێدەنگبوو، مونیرە بەئاوازێکی دایکانە وتی:

- بیڵێ! شەرم مەکە

ئـاوازی میهرەبانەکەی مـونیـرە، شەقایقی دڵگەرمکرد، بەهێواشی وتی:

- دەیەوێت.. خوازبینی من بکات!

مونیرە پرسی!

- ڕاست دەکەی؟!

شەقایق سەیرێکی پڕ شەرمی مونیرەی کردو بەبادانی سەری ڕاستی قسەکانی پێشاندا، مونیرە وتی:

- هەمیشە وابیرمدەکردەوە کە ڕقتان لەیەکترە.

شەقایق بزەیەکی کردو وتی:

- سادق کوڕێکی خراپ نییە، بەڵام کیومەرس دەیوت کوڕێکی شڕوشێواوە!

شەقایق بەتوڕەییەوە وتی:

- بەقسەی مەنوچەر مەگەر کیومەرس جگە لەدرۆ دەزانێت قسەیەکی تر بکات؟!

پاشان ڕۆیشتە خەیاڵەوە بەردەوامبوو:

- جگە لەمە هەموو کوڕەکان شڕن!

مونیرە وتی:

- ئەی مەنوچەر چی؟ دەی چی بەو دەڵێیت؟!

شەقایق وتی:

- خۆ من بەڵێنێکم بەمەنوچەر نەدابوو، ئەو هەمیشە لەلای خۆیەوە قسەی دەکرد، من ناڵێم خۆشم ناوێ، بەڵام لەبارەی زەماوەندەوە لەگەڵ ئەو هیچکات بیریشی نەیداوە لەسەرم.

مونیرە شەیتانانە وتی:

- وادیارە سادق بەتەواوی دڵی بردوی، ها!

شەقایق لەشەرمدا سورهەڵگەڕاو بەئارامی وتی:

- تۆ هەمیشە دەتوت شەقایق بۆ ئاشناکانە، باشە سادقیش ئاشنایە، من.. من لەگەڵ مەنوچەردا گەورە بووم.

مونیره وتی:

- یانی دوا قسەت ئەمەیە؟

- بەڵێ!

مونیره وتی:

- دەی ئەمڕۆ بڕیاروایە سادق قسەم لەگەڵدا بکات.. هەستم زوتر بڕۆم ئەگینا دڵی دەوەستێ!..

مونیره ئامادەبوو بۆ ڕۆیشتن، مەنوچەر لەحەوشەکە وەستابوو یاری لەگەڵ کوڕەزاکانی مامەساڵحدا دەکرد، دوای ڕۆیشتنی مونیره، خێرا بەرەو لای ژوورەکەیان ڕۆیشتو لەدەرگایدا، شەقایق دەرگای کردەوەو بەبێ ئەوەی سەیری مەنوچەر بکات وتی:

- چیت دەوێت؟

مەنوچەر بەتانەوە وتی:

- بمبەخشە، لەبیرم چوو سڵاو بکەم!

شەقایق بەبێ تاقەتی وتی:

- دەی سڵاو..

مەنوچەر ئەبڵەقی بوو بەشێوەی پرسیار گەرانە وتی:

- حاڵت باش نییە؟

شەقایق بەتوڕەییەوە تەماشای کردو وتی:

- من هەر تاقەتی تۆم نییە، بڕۆ بەجێم بهێڵە.

پاشان دەرگاکەی داخست.

سادق لەهۆڵەکە دانیشتبوو، لەسەیرکردنی مونیرەوە زانی کە ئەو شتێکی لەشەقایق بیستووە.

نەنەگیان لەسوچێکەوە هەموو شتەکانی بەمونیره وتبوو،

مونیره لەژوورەکەی نەنەگیان هاتەدەرەوەو لەپاڵ سادق دانیشت، سادقی دەناسی، بێڕو بوو، زۆر سەرو زومانی نەبوو وەک مەنوچەر زمانی شیرین نەبوو، بەڵام زۆر دڵسۆز بوو، بەهێواشی وتی:

- پوریێ گیان بیڵێ شەرم مەکە، وامەزانە من پورتم، وابزانە هاوڕێتم، ئەوکات هەموو قسەکان بەئاسودەی بکە.

سادق خۆی لارکردەوە بەسەر سنگیداو بەدەنگێکی لەرزۆک وتی:

- پوریێ ئامادەی کچەکەتم بدەیتێ؟.. نەخانوم هەیە، نەخوێندەواریەکی باشم هەیە، نە.. نەگەورەیەک کە لەبەر من ئامادەبێت داوای کچەکەت بکات.

مونیره دڵی لەراستگۆی قسەکانی سادق گرانبوو، بەڵام بەمیهرەبانی وتی:

- دەی من کێم؟!.. هەرچیت دەویێ بەمن بڵێ، من هیچم لەتۆ ناوێت، ئەگەر قسمەت هەبێتو ئەوەندە بژیم دەستتان بگەیەنم بەیەک تەنیا ئەوەم لێت دەوێت کە مێردێکی باش بیت بۆی!

قسەکانی مونیره، دڵی سادقی گەرمکردەوە، بۆ چەند ساتێک خۆی بەخۆشبەخترین مرۆڤی سەرزەوی بینی.

مەنوچەر لەسەر پلەکانەکە دانیشتبوو، هەرکە دەرگاکە کرایەوە، هەستا، شەقایق ویستی بێبایەخدان بەلایدا تێپەڕێت، ئاوازی خەمبارانەی مەنوچەر لەشوێنی خۆیدا وەستاندی.

- لەمن تۆراوی؟!

شەقایق وتی:

- نەخێر لێت نەتۆراوم.

مەنوچەر وەک منداڵ وتی:

- تۆراوی، دەزانم تۆراوی، سەیرکە هەر سەیری ناوچاوانم ناکەی!

شەقایق بەتوڕەییەوە:

- بەڵێ تۆراوم، چیتر نامەوێت دەموچاوت..

ئەو دڵۆپە فرمێسکەی کە بەسەر گۆنای مەنوچەردا هاتەخوارەوە، قسەکەی شەقایقی بڕی، بێخواست بەدڵسۆزییەوە وتی:

- تۆ خەریکیت دەگریت؟!

مەنوچەر بەنیگای خەمبارانەوە ئەبڵەقی بوو وتی:

- ئێستا چەند ڕۆژە خەریکم دەگریم لەو کاتەوەی ڕۆشتوین بۆ سەفەر تاکاتێک هاتوینەنەوە.

شەقایق ڕوی لێوەرگێڕاو بێگرنگیدان وتی:

- ئیتر گرنگ نیت بۆم.. بڕۆ بمرە!

مەنوچەر ئەوێی جێهێشتو لەپلەکانەکانی ژێرخانەکە ڕۆیشتە خوارەوە، شەقایق سەریسوڕما، دڵەخورتەی بوو بێخواست لەپلەکانەکان ڕۆیشتە خوارەوە، بەبینینی خوێن قیژەیەکی کورتی کردو سێ پلەکانەی تێپەڕکرد بەجارێک بۆ خوارەوە، چەقۆ لەدەستی مەنوچەردا بوو!.. شەقایق بەترساوی، بەڵام ئارام بەرەولای ڕۆیشتو بەهەراسانی وتی:

- دەتەوێت چی بکەیت؟!

مەنوچەر سەیری کرد، لەنیگایدا دیاربوو دەیەوێت نەخشەیەک دابنێت، دەستی خوێناوی بوو، زنجیرەیەک فرمێسکی نەرم لەچاوەکانی دەهاتەخوارەوە، بەهێواشی وتی:

- مەگەر نەتوت چیتر گرنگ نیت بۆم، مەگەر نەتویست بمرم!

شەقایق دەستەپاچەبوو، بەتورەیی وتی:

- واز بهێنە! چەقۆکە بدە بەمن!

مەنوچەر بێبایەخدان چەقۆکەی لەدەستی داو ئارام ئارام بڕی، خوێنی سور هەڵدەقولاو دەهاتەدەرەوە، شەقایق لەکاتێکدا کە دەگریا، بەپاڕانەوە وتی:

- توخوا وامەکە.. بەخوا گاڵتەم کرد!

پاشان بۆ دەستەسرێک دۆلابەکانی ئەمدیوو ئەودیو کرد، مەنوچەر پێکەنینێکی خەمبارانەی خستەسەر لێویو بەهێواشی وتی:

- دەتویست تاقیم بکەیتەوە.. !

شەقایق قسەیەکی نەکرد، بەدەستە لەرزۆکەکانی ئەو پارچەیەی پەیدایکردبوو بەستی، مەنوچەر هێواشتر لەپێش بەئاوازێکی منالآنە وتی:

- جارێکیتر ئەم قسانە بکەیت سوێند بەم خوێنە خۆم دەکوژم!

شەقایق بەئاوازێکی تورەوە:

- چیتر هیچ کات وامەکە!

بەدرەوشانەوەی نیگای هەراسانی شەقایق دڵی مەنوچەر لەرزی، لەگەڵ ئەوەی کە دەستی ئازاری هەبوو، هەستێکی شیرینو چێژبەخش تەواوی بونی گرتبووە.

"٣٣"

نەنەگیان لەهەیوانەکە دانیشتبوو سەیری سادقی دەکرد، سادق خەریکی شت نوسین بوو لەسەر کاغەز، دەنگی ڕاکێشانی پێنوسەکە بەسەر کاغەزەکەدا تەنیا دەنگ بوو کە بێدەنگی نێوان ئەو دوانەی دەشکاند، نەنەگیان بەهێواشی:

هیچکات بیرم نەدەکردەوە بوون بەزاوای تۆ ببینم!

سادق پێکەنی و وتی:

- بۆچی؟!

نەنەگیان وتی:

ئاخر بیرم نەدەکردەوە ڕۆژێک خەیاڵی ژنهێنان بکەوێتە مێشکتەوە، تۆ لەبیری هەموو شتێکدا بویت ژنهێنان نەبێت، هەر لەمنداڵییەوە حەزت لەشەڕبوو تۆمان نەدەبینی، لەماڵدا ئارامگرو بێدەنگبیت، لەدەرەوەی ماڵ دەگەڕایت.

سادق کەمێک بێدەنگبوو پاشان بەمینگەمینگ وتی:

- بە.. دایکمت وتوە کە..؟

بەڵێ پێم وت، مەنیجە زۆر خۆشحاڵبوو، بەڵام بەوتەی پێشینان تاچوار قسەی تەواوی بیست، ناڕەحەت بوو.

سادق وتی:

- مەگەر چیت پێ وت:

نەنەگیان وتی:

- پێموت لەبەر منداڵی بێگانە کوڕەکەتت لەبیرکردوە، دەتوانی ناوی خۆت بنێیت دایک؟.. بۆ کچەکانی کاک ئەحمەد دایکی، بەڵام بۆ کوڕەکەی خۆت بویتە باوەژن! دای لەدڵی مەنیجە.

سادق وتی:

- نەوەک نەیەت؟!

نەنەگیان وتی:

- یەکەم بێخودی دەکات نایەت!.. دوەم خۆ من هێشتا نەمردوم، خۆم دێم بۆ خوازبینی ژن، منیش خۆ کوڕم نەبوو تۆ لەجێی کوڕم، شەقایق وەکو بوکم، بەڵام ئەی فێڵباز گوڵچنێکی باشت کرد ها!

سوپاس بۆ خوا مەنوچەر لەکەرەجە، ئێستا گریمان لێرەش بوایە، بەئەو چی.. بەڵێ ئێستا من خەریکم بەمجۆرە قسەدەکەم، ئەگەر لێرەبوایە بێگومان یەکەمجار منی دەکوشت پاشان سادقی دەکوشت هەرچی بڵێی لەدەستی ئەو شێتە دێت، ئەو جارە لەبەر شتێکی هیچو پوچ خەریکبوو خۆی دەکوشت!

شەقایق هەر بەو شێوەی کە لەگەڵ مونیرەدا قسەی دەکرد ڕۆیشتە لای پەنجەرەکە:

- ئا..، ئەم کوڕە فیتنەیە ئەمڕۆ لەماڵە!.. دەڵێم دایکە دەڵێی با گەیاندویەتە گوێی کیومەرس کە ئەمڕۆ هەواڵێک هەیە! لەبەیانیەوە تا ئێستا لەپشت پەنجەرەکە دانیشتووە.

مونیرە وتی:

- باشە با دابنیشێت، لەکۆتایدا چی دەڵێت؟.. لەکۆتایدا دەزانێت.. تازە زۆریش خراپ نەبووە! دوێنێ پەروین پێی وتم کە باوکەگیان دەیەوێت کوڕەزای کاک هاشم داوا بکات بۆ مەنوچەر، کچەکە هێشتا نەبووەتە سیازدە ساڵ!

شەقایق بەسەرسامییەوە:

- ڕاست دەکەیت دایکە؟!

شەقایق بەهێواشی:

- دایکە، ئەو کچەت بینیوە؟

مونیرەش بەهێواشی:

- بەڵێ بابە، منداڵێکە، بەڵام ئەگەر ببێتە ژنی مەنوچەر بەراستی حەیفە نە ڕوی هەیەو، نەکچێکی باشە.

مونیرە هەستاو بەردەوامبوو:

- ئەستەغفیروڵڵا.. خەریکم باسی خەڵک دەکەم! هەرچی قسمەت بێت ئەوە دەبێت.

دەنگی زەنگی دەرگا بەرزبووە، مونیرە سەیری کاتژمێرەکەی کردو وتی:

- یانی کێیە بەم نیوەڕۆیە!

مونیرە لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە، زۆری نەخایاند کە دەنگی هاواری مونیرە گەیشتە ئاسمان، شەقایق بەترساوی لەژوورەکە چووەدەرەوە، مەنیجە لەسەر زەویەکە بوو، مونیرە بەپێخاوسی بەرەو لای دەرگاکە هەنگاوی هەڵگرت، شەقایقیش بەهەراسانی بەرەو مەنیجە ڕایکرد، بەدەنگێکی لەرزۆک پرسی:

- پورێ چی بووە؟!

مەنیجە سەری خستەسەر شانی شەقایقو بەگریانەوە هاواریکرد:

- نەنەگیان مرد نەنەگیان ڕۆشت!

شەقایق قیژەیەکی بەرزی کردو بەرەو لای مونیرە ڕۆیشت.

ماڵی نەنەگیان ڕەنگی ماتەمی گرتبوو، دەڵێی نەنەگیان لەسەر هەیوانەکە وەستابوو بەزەردەخەنە بەخێرهاتنی لەشەقایق دەکرد، مونیرە خۆی گەیاندە ژوورەکەی نەنەگیان، لەپاڵ تەرمی نەنەگیاندا دانیشتبوو دەگریا، ئازاری دەچێشت،

بەڵام چی سودێکی هەبوو ئەم هەموو شیوەنە! هاواری هەموو ئەندامەکانی لەشی شەقایقیان دەلەرزاند، کاتی مردنی باوکی جارێکیتر هێنایەوە یادی خۆی.

هەموو شتێک ڕێک وەک ئەوکاتە بوو، دەنگی هاواری دایکی..

مونیرە دەستە گرێلاوەکانی دەدا بەسنگیداو بانگی دەکرد:

- توخوا هەستە دایکە.. دایکە، خۆ من جگە لەتۆ کەسێکم نییە.. دایکە جگە لەتۆ من کەسێم بۆ نەمابوو.. دایکە هەستە..

مەنیجە لەچێشتخانەکە بێهۆش کەوتبوو، فاتمە دەگریاو هاواریدەکرد، کۆمەڵەکە دەستە دەستە دەهاتن‌و دەڕۆیشتن، دراوسێکان یارمەتی زۆریاندا، ڕێورەسمەکە بوو بەڕەسمی، سادق خەفەتبارو تەنیا لەبەردەم دەرگاکە وەستابوو بەخێرهاتنی میوانەکانی دەکرد، دەنگی قورئان لەشی مرۆڤی دەلەرزاند.

حاڵی مونیرە باش نەبوو، لەگەڵ ئەوەی کە دوو مانگ ڕایدەبورد بەسەر مردنی نەنەگیاندا، بەڵام ئەو هێشتا کەوتبوو، مەنیجە کەمێک باشتربوو، هەندێکجار دەچوو بۆ سەردانی مونیرە بەقسەی کاک ئەحمەد شەقایق لەبری مونیرە دەڕۆیشتە سەرکار، کاک حەیدەریش بەمیهرەبانی پێشوازی لەشەقایق کرد، ڕۆژی یەکەم کاتێک شەقایق لەجیاتی دایکی سەر قاڵی کاربوو لەسەختی کارەکە بەتەواوی هیلاکبوو، ئینجا زانی کە دایکی بەدرێژای ڕۆژ چەند کاری سەختو بێتاقەتکەری ئەنجامداوەو، دڵی بەحاڵی دەسوتا.

بڕیاریدا تادەتوانێت لەجیاتی ئەو کاربکات، سادق پێی وتبوو کاتێکیش زەماوەندمان کرد، من ئیش دەکەم‌و دایکت دەبێت لەگەڵماندا بژێت، ئیتر پێویست ناکات ئیشبکات، کاتی خستنەوە

بیری قسه شیرینەکانی ئەو تەواوی هیلاکی لەلەشیدا نەدەما لەسەرو ئەمەشەوە! ڕەفتاری میهرەبانی هاوکارەکانی مونیرە دڵگەرمیان پێدەبەخشی

یەک دوو خولەکی مابوو بۆ داخستنی کارگەکە، خاتوو کیانی بەڕێوبەری کرێکارە ژنەکان هاتەژوورەو هێواش لەلای گوێچکەی شەقایق وتی:

پیاوێک لەبەردەم دەرگاکە چاوەڕێتە، دەتوانی برۆیت، سڵاو لەدایکیشت بکە!

سادق لەبەردەم دەرگاکە چاوەڕێی شەقایق بوو.

- سڵاو چی بووە؟!

سادق پێکەنیو وتی:

- تۆش وەکو پورمی، هەمیشە نیگەرانو ترساو! خراپم کرد هاتم بەدواتدا؟

شەقایق وتی:

- تۆ ئێرەت لەکوێ دەزانی؟

سادق وتی:

- ئەمشەو میوانی ئێمەن.

شەقایق پرسی:

- یانیماڵی کاک ئەحمەد؟

- بەڵێ، پوریشم لەوێیە!

ساتێک بێدەنگی بڕیاردەربوو، سادق بەهێواشی:

- زیاتر لەبەرئەوە هاتم بەدواتدا تابەیەکەوە قسەبکەین.

شەقایق وتی:

- دڵم زۆر گیراوە، ئازادی تا سبەینێ قسەبکەیت!

سادق سەیرێکی کردو وتی:

- دەترسم هیلاک بیت.. هەموو قسەکانم دوبارەیە!

شەقایق بزەیەکی کەمرەنگی خستەسەر لێوی‌و وتی:

- بیلێ ئیتر، دەمەوێت ئەو قسە دوبارانە ببیستم!

سادق وتی:

- من بەدبەخترین مرۆڤی سەر زەویم، ئەو ڕۆژەی کە ویستم بێمەخوازبینی نەنەگیان مرد دەیبینی کە چەند..

شەقایق ڕەخنەگرانە وتی:

- نامەوێت گوێم لەم قسانە بێت، ئەم شتانە هیچ پەیوەندیەکیان بەشانسەوە نییە، خۆ هیچ نەبووە!

سادق هێواش وتی:

- کەواتە هێشتا لەسەر پەیمانی؟!

- بەڵێ پەیمانەکەمان تەنیا بۆ ئەمڕۆ نییە، بۆ هەمیشە لەسەر پەیمانەکەمانم.

سادق وتی:

- نازانی کاتێک بەلامدا ڕێدەکەی چی هەستێکم هەیە؟

شەقایق نیگای تامەزرۆیی ڕوکردە سادق، سادق بەردەوامبوو:

- وادەزانم بومەتە پیاو، وابیردەکەمەوە ئەوەندە بومەتە مرۆڤ فریشتەکان لەگەڵمدا ڕێدەکەن!

شەقایق پێکەنینێکی کورتی کردو وتی:

- ڕاستە عیشق مرۆڤەکان دەکاتە شاعیر، لەمرۆڤێکی دڵبەرد عاشقێکی مەجنون دروست دەکات‌و لەکچێکی سادەی فیتنەش فریشتەیەک!

سادق مۆنەی کردو وتی:

- من دڵ بەرد نیمو نەبوم، تەنیا خەریکبوم خۆم فریودەدا، تەنیا بوێریم نەبوو، بـەڵام.. بەڵام تۆ هیچکات کچێکی فیتنە نـەبویو نیت، تەنیا من کوێربوم کە نەمدەتوانی بەچاوی کراوەوە فریشتەیەکی ڕاستەقینە ببینم!

- بـەڵام من کە بومەتە وتاربێژ، بومەتە بەندەی کچێکی بێبەزەیی!.

شەقایق بەسەرسامی وتی:

- بێبەزەیی!

سادق وتی:

- بێڕەحمی ئیتر، ئەم هەموو دانپێدانانەت لەمن بیست، بەڵام جارێکیش نەبوو خۆت دانی پیابنەی.

- داننان بەچیدا؟!

- بەوەی کە تۆش ئەم کەسەت خۆش دەوێ یانە؟

شەقایق وتی:

- دەمەوێ!

چیت دەوێ؟

شەقایق ساف سەیری چاوە خومارەکانی سادقی کردو وتی:

- خۆشم دەوێ!

لەو ڕۆژانەی کە مەنوچەر لەتاران بوو مونیرە دەڕۆیشت بەدوای شەقایقدا، ئەو کاتانەیتر سادق دەچوو بەدوای شەقایقدا، ئەمە داواکاری مونیرەبوو، دەیویست زەماوەندی شەقایقو سادق نەیەتە نێوانەوە، دەیزانی کە مەنوچەر بەزانینی ئەم بابەتە شەڕی هەڵدەگیرساند.

- بەپوریت وت ئەمشەو درەنگتر دەڕۆیتەوە بۆ ماڵ؟

شەقایق وتی:

- بەڵێ پێموت! بەڵام یەکەمجار بڵێ بزانە دەڕۆین بۆ کوێ؟

دەمەوێ بتبەم بۆ شوێنێکی خۆش بەیەکەوە نانی شێوان بخۆین، قسەبکەین، کەمێک بەیەکەوە گاڵتەبکەین، پاشان بتگەیەنمە ماڵەوەو تا بەیانی لەبەر فیڵەکانت پێڵوی چاوەکانم نەخەمە سەریەک.

شەقایق پێکەنیو وتی:

- دەی هەموو قسەکانم بەبڕوای تۆ گاڵتەکردنە ئیتر.. بەڵێ؟!

ئەو خەڵوەتەی کە سادق قسەکەی لەبارەوە دەکرد، چێشتخانەیەکی زۆر جوانبوو کە زیاتر پێشواییان لەعاشقان دەکرد، سادق وتی:

- ئێرەش خەڵوەتگای منە!.. ڕۆژانی هەینی کەتۆو دایکت دەهاتن بۆ ماڵی نەنەگیان، منی گێلیش دەهاتم بۆ ئێرە.

شەقایق بەسەرسامییەوە:

- ئیتر بۆچی گێل؟!

چونکە ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە دەبینم بێخود شانازی قسەکردنم لەگەڵ فریشتەیەکدا لەدەست دەدا! دەمەویست نکوڵی بکەم لەگەڵ خۆمدا، بەیانی تا خۆرئاوا کە دەڕۆیشتم بۆ دوکان، عەسریش دەهاتم بۆ ئێرە، خۆزگە زوتر لەگەڵتدا ئاشتبومایەتەوە.

شەقایق بەدەم پێکەنینەوە:

- من دەبێت ئەم قسانەی تۆ تۆمار بکەم، تاکاتی شەڕ مناڵەکانمان گوێی لێ بگرن!

ســادق ســەری كــردەخــوار، ڕوخســاری بـەخـەمـباری دەهاتەپێشچاو، شاگردی چێشتخانەكە چێشتەكەی خستەسەر مێزەكەو ڕۆیشت، سادق سەری بەرز كردەوەو بەهێواشی وتی:

- شەقایق دەمەوێت شتێكت پێ بڵێم!

ئاوازە خەمبارەكەی سادق بێخواست شەقایقی دڵتەنگكرد.

- چی بووە بیڵێ!

سادق وتی:

- من هیچكات مناڵم ناوێت، ڕقم لەمنداڵە!.. نە هەموویان، بەڵام وابیرناكەمەوە كە هیچكات مناڵی خۆمم خۆش بوێت، دەمەوێت تاكۆتایی تەمەن منو تۆ بەتەنیابین.

شەقایق سەرسامانە:

- بۆچی؟!

سادق وتی:

- منـاڵـە مـاوە دەخـاتـە نـێوانـمـانـەوە، مـنو تـۆ لـەیـەك دوردەخاتەوە، دەزانم خۆپەرستییە، بەڵام توخوا ڕازی بەپێی، مناڵ باش نییە، دەترسم تۆش وەك دایكمت لێبێت، فاتمەو فەریبا بونە هۆی ئەوەی كە من لەبیربكات، پێكەنیناوییە، بەڵام من هەمیشە ئێرەییم پێ دەبردن، من مناڵی دایە مەنیجە بووم، بەڵام خۆشەویستی ئەو تەنیا بۆ فەریباو فاتمە بوو.. هەر كاتێك نەخۆش دەكەوتم دایكم بەبێبایەخی دەیوت:

- تۆ كوڕیت، دەبێت بەتوانابیت!

حەزمدەكرد پێی بڵێم مەگەر كوڕەكان مافی نەخۆشكەوتنیان نییە.

شەقایق وتی:

- تۆ زۆر تەنیا بویت!.. ڕاست دەکەیت، بەڵام منداڵ خۆشەویستی نێوانمان زیاددەکات، بەهۆی ئەوەوە هەموو کێشەکان چارەسەردەکەین‌و هیچکات باسی جیابونەوە ناکەین، بەڵام ئێستا کە تۆ دەتەوێت من لەبەر تۆ ئامادەم لەپەیوەندی خۆم وازبێنم.

سادق بزەیەکی کردو بەئاوازێکی گاڵتەوە وتی:

- تۆ خانمی، ئەگەر بزانی کاتێک پێم دەڵێیت "لەبەرتۆ" چەند خۆشحاڵ دەبم!.. بیر دەکەمەوە کە لەکۆتایدا کەسێک پەیدابوە دڵی بەحاڵم بسوتێ، یەکێک پەیدابوە خۆشی دەوێم!.. دەزانی من‌و تۆ هەردوکمان لەڕەگەزێکین هەردوکمان تەنیاین، مەنوچەر هیچکات ناتوانێت درک بەحاڵی ئێمە بکات، ئەو کەی تەنیا بووە تابزانێت من چی دەڵێم، هەموو ساڵێک لەسەفەربووە، ڕۆیشتووە بۆ قوتابخانە، کاتێک ئیشی هەڵەیکردووە باوکی بەسەرسەریەوە بووە.

بەڵام من چی؟.. هەر لەمنداڵییەوە ئیشدەکەم، تۆ دەبێت ببیتە هی من، تۆ بەشی منی نە ئەو، ئەو زۆر لەخۆباییە هەمیشە بیروباوەڕی وابووە ببێتە خاوەنی هەموو شتێک، بەبێ زەحمەت، بێ ڕەنج، بەڵام من زۆر سەختیم کێشاوە، لەوانەیە باوەڕنەکەیت، بەڵام ئەوکاتەی کە بەخۆم دەوت، بۆچی درۆدەکەی، ئەگەر خۆشت ناوێ، بۆچی هەر کاتێک ناوی مەنوچەر دێتەپێشەوە ئیرەیی دەبەیت؟.. دەی ئەگەر شەقایق گرنگ نییە بۆت، بۆچی هەر سەختگیری دەکەیت؟..

"سادق هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا" کاتێک تۆم بەکارێک

تاوانباردەکرد کە نەتکردبوو، کینە گەروی دەگرتی، چەناگەت دەلەرزیو پاشان دەگریایت، ئەوکاتەبوو کە دێوانەت دەبوم!. عاشق دەبومو خۆشم دەویستیو حەزمدەکرد ئەوکاتە بڵێم بمبەخشە، بەڵام نەمدەتوانی هەر جارێک کە دەگریایت من عاشقاتر دەبوم.

سادق پێکەنینێکی کورتی کردو بەردەوامبوو:

- دەزانم، بێگومان لەلای خۆتەوە دەڵێیت ئەم کورە شێتە، بەڵام بەڕاستی دەڵێم کاتێک دەگریایت زۆر جوان دەبویت، مرۆڤ حەزیدەکرد لەو دوو چاوە گرینۆکو جوانەتدا مەلەبکات، هەندێکجار کە شەڕتدەکرد لەبەر دەممدا بگریت، کاتێک دەڕۆشتیتە چێشتخانەکە، دەنگی گریانەکەتم دەبیست، دەڕۆشتمە حەوشەوە بەدڵێکی تێرەوە سەیرم دەکردی، وەک منداڵە لێدراوەکان لەکونجی چێشتخانەکە بەکزی دەگریای، ڕێک وەکو من، من هەر کاتێک تەنیا بوایەم بۆ ئەوەی کەس نەمبینێ دەڕۆیشتمە ژێر پلەکانەکانو دەگریام، ئەم خەسڵەتەمان لەیەکدەچێت.

هەردوکمان دەگرین ئەوەنەبێ کەتۆ بوێریت هەبوو لەبەردەمی مندا فرمێسک بڕێژیت، بەڵام من هەر جارێک کە دەگریای لەدەرونەوە دەشکام، وێران دەبوم، حەزمدەکرد داوای لێبوردن بکەم، بەڵام تۆ بەتام دەگریایو منیش دڵخۆشبوم کە هەر هیچ نەبێ لەدڵمدا دڵۆپدڵۆپ لەگەڵ تۆدا فرمێسک دەڕێژم، بەڵام بەخوا گریانێک کە من دەمکرد لەسەر ئەوەندەی گریانەکەی تۆ ئارازدەربوو، تۆ دڵت سوکدەبوو، بەڵام من شێت دەبوم، "سادق لەناکاو بەخۆیدا هات".

- وای چەند قسەم کرد! فیلەکەی تۆش ئەوەیە کە هەروا بێدەنگ دانیشتوی‌و بەمن دەڵێی قسە بکە، چێشتەکەت بخۆ ساردبووە! دەتەوێت بیگۆڕم؟

شەقایق سەری بەمانای نەویستن باداو وتی:

- من دڵنیام لەگەڵ تۆ خۆش بەخت دەبم.

سادق هێواش وتی:

- یا من بەهەڵە بیستم، یان تۆ هۆشت نەبوو چیت وت؟!

شەقایق مۆنەی کردو وتی:

- خۆپەرست!.. چۆن من باوەڕ بەهەموو قسەکانی تۆ دەکەم، کە چی تۆ باوەڕ بەیەک وشەی من ناکەی؟

سادق وتی:

- دەی دوبارەی بکەرەوە.

شەقایق ئەبلەقی چاوە بێتاوانەکانی بوو، لەناخی دڵەوە هەمان ڕستەی دوبارەکردەوە.

- شەقایق!

شەقایق بەئاوازە منالانەکەی سادق پێکەنی، سادق بەردەوامبوو:

- شەقایق ، شیعرێکم بۆت نوسیووە، هەم بەناوی خۆتەوە، هەم لەشیعرەکەشدا حەوت کۆ دوجار ناوی تۆم هێناوە، کاتێک تەواوبوو دەیهێنم بۆت تابیخوێنیتەوە، دەبێت تا ڕۆژی لەدایکبونت ئارام بگری!

شەقایق بەسەرسامییەوە پرسی:

- حەوت کۆ دوجار!.. یانی نۆ ئیتر؟

- بەڵێ.

شەقایق وتی:

- باشە، دەی بۆچی ناڵێیت نۆجار؟!

- ئاخر حەزم لەژمارە حەوتە، بیستوتە دەڵێن: حەوت ئاسمان، حەوت زەوی، هەفتەش حەوت ڕۆژە....منیش ویستم ناوت حەوت جار لەشیعرەکەدا بەکاربێنم، بەڵام دوانی بۆی زیادبوو بووە نۆجار.

شەقایق زەردەخەنەیەکی چەتونانەی خستەسەر لێوی‌و وتی:

- دەڵێم سادق نەوەک من عەشقی حەوتەمت بم؟!

سادق پیکەنی‌و وتی:

- تۆ یەکەم‌و دوایەمینی!

مەنوچەر زۆر تورەبوو، هەر ئەو کاتەی کە نەنەگیان مرد، دەبوایە هەڵقەی بکردایەتە دەستی شەقایق، بەڵام نێرگس نەیهێشت، دەیوت مەگەر من چەند کورم هەیە، مەگەر من چەند منداڵم هەیە تاتۆ دەتەوێت بێدەنگ ژنەکەت ببەیتە خانوەکەت، دەبێت ئارامبگری، ئێستاش کە پەروێز دەیویست خانوو بکرێت‌و لەماڵی باوکی دەربچێت، مەنوچەر بەتەواوی نیگەرانبوو.

ئێستا هەر نەیدەتوانی بڕواتە پێشەوە، دوای مردنی دایکی، مونیرەش حاڵی باشنەبوو، مەنوچەر بەتوڕەیی بەخۆی وت:

دەی کەی سەرەی من دێت.. ئیتر تاقەتی خۆ ڕاگرتنم نییە، ئەگەر بمانەوێت خانوبکرین من بەچ بیانویەک هەموو ڕۆژێک بێم بۆ ئێرە؟!

بەڵام توڕەیی مەنوچەر بێسودبوو، پەروێز پەیماننامەی خانوەکەشی کردبوو.

بەپێچەوانەوە، شەقایق زۆر خۆشحاڵبوو، لەوانەیە ئەم

دوریەی مەنوچەر دڵی بەکارەکەوە نەدەچەسپا، لەخۆشحاڵی شەقایق تورەبوو.

- هەر ناڵێی ئێمە لەم ماڵە دەڕۆین!

باوکەگیان لەهەیوانەکە وەستابوو، چیتر تاقەتی ئەو کاتانەی نەبوو کە بیەوێت بۆڵەبکات یان شەڕبکات، لەناکاو شتێک کەوتەبیری، بەدەنگە نالەبارو گیراوەکەی وتی:

- مەنوچەر، وەرە ئێرە ئیشم پێتە.

مەنوچەر دەستی لەکارەکەهەڵگرت، نەرۆییشتە سەرەوە، باوکەگیان لەسەر هەیوانەکە سەیری دەکرد.

تۆش دەبێت بکەویتە بیری ژنهێنان، دەمەوێت تازیندوم خۆم بڕۆم بۆ خوازبینی ژن بۆت!

مەنوچەر لەدڵەوە وتی:

- سوپاس بۆ خوا لەکۆتایدا کەسێک پەیدابوو لەبیری دڵی مندا بێت.

باوکەگیان بەردەوامبوو:

- کوڕەزاکەی کاک هاشمی بنگام بینی، کچێکی باشە، ژنێکە، دایکو باوکیشی بنەماڵەیان باشو نەجیبە.

باپیرەیان دەگەڕێتەوە بۆ بەهادرخان، خۆ بەهادرخان دەناسی؟ هەر ئەوەی کە نیوەی بازاڕ موڵکێتی!

مەنوچەر گوێی لەقسەکانی باوکەگیان نەبوو، بەوتەی پێشینان چەقوت دەدا لەئێسکی خوێنی لێدەرنەدەهات، بەتەواوی تورەبوو، زەردەخەنەی شاراوەی شەقایقی دەبینیو زیاتر تورەدەبوو، نێرگس لەپێکەنیندا ڕۆشتبووە پشتدا.

پەروێزیش جارجارێک سـەری بـادەدا، بـەڵام کیومەرس بەدەنگێکی بەرز پێدەکەنیو بەردەوام دەیوت:

- ئەی بێچارە دڵی مەنوچەر!

شـەقایق بەترساوی بەرەو دەرگای حەوشـەکە ڕایکرد، لەناو حەوشـەکەدا دەنگی درێـژی زەنگەکە بـەرزبـووە، مەنوچەر لەپشت دەرگاکەوە بوو.

- مەگەر پێم نەوتبوی..

شـەقایق بەگریانەوە چووە ناو قسەکانیو وتی:

- توخوا وەرە، دایکم حاڵی باش نییە!

مەنوچەر بەخێرایی بەرەو لای دەرگای ژوورەکە ڕایکرد، بەترساوی ئەبڵەقی دەموچاوی ڕەنگپەڕیوی مونیرە بوو.

- کەس لەماڵ نییە؟

شـەقایق بەگریانەوە:

- نەخێر، هەموویان ڕۆیشتون بۆ سەر گۆڕی حاجی ژن!

مەنوچەر لەکاتێکدا لەژوورەکە دەرۆیشتەدەرەوە، وتی:

- دەڕۆم بەدوای ئۆتۆمبیلدا، لێرە چاوەڕێبە تادێمەوە.

کاتێک مونیرەیان گەیاندە نەخۆشخانە، مەنوچەر پەیوەندی بەمەنیجەوە کرد، مەنیجەی بێچارە خۆیشی نەخۆش بوو، حاڵی باش نەبوو.

پەرستیارەکە لەژووری بوژانەوە هاتەدەرەوەو وتی:

- هاوڕێی ئەم ژنە کێیە؟

شـەقایق هەستا، پەرستارەکە وتی:

- تۆ نە!.. "پاشان بەمەنیجەی وت:" تۆ خانم.. وەرە!

شـەقایق بەگریانەوە وتی:

- دەزانم شتێک بووە..!

مەنوچەر ئارامی کردەوەو خۆی بەدوای مەنیجەدا ڕۆیشت، دکتۆرەکە هێواش وتی:

- بەداخەوە خوشکەکەوت!خوشکەکەت..

مەنیجە هەر لەوێدا بێهۆش کەوت، حاڵێکی خەفەتبارانە بوو، مەنوچەر غافڵگیربوو، نەیدەزانی چۆن بەشەقایق بڵێ، مەنیجەی خەواند، شەقایقی بێچارە هێشتا لای دەرگاکە چاوەڕێبوو.

نێرگس لەتەلەفۆنەکەوە هاواریکردو تەلەفۆنەکەی بڕی، زۆری نەخایاند ساڵحو پەروێزیش هاتن، ساڵح خۆی بەشەقایقی وت شەقایق لەناوەڕاستی ڕێڕەوەکەدا بێهۆشبوو، حاڵی مەنوچەر لەهەمووی خراپتربوو، دەڵێی گیانی بەسترابوو بەگیانی شەقایقەوە، ئەویش بێهۆش لەسەر کورسیەک کەوتبوو، بەلام هەمووان ئەوەندە گرفتاری شەقایقو مەنیجەبون کە ئەویان لەبیرکردبوو، مەنوچەر کاتێک هاتەوە هۆشی خۆی کە شەقایقیان بەو حاڵە پەرێشانەوە دەبردەوە بۆ ماڵ.

مەنیجە دە ڕۆژ لەنەخۆشخانەبوو، شەقایق نەدەگریا! تەنیا بەماتی ئەبڵەقی خاڵێک دەبوو، هەموو شەوێک دەیانبرد بۆ نەخۆشخانەو دەرمانخانە.

ئەو ساڵە ساڵێکی تاڵبوو، بووە ساڵی مەرگو میر، گریان لەچاوەکانی دورنەدەکەوتەوە جلی پرسە نەیدەویست لەلەشی ئەندامانی خانەوادەکە جیابێتەوە، سادق خراپتر لەشەقایق قاچێکی لەماڵبوو قاچێکی لەنەخۆشخانە، مەنیجە بەتەواوی لەپێکەوتبوو، شەقایقیش لەو خراپتر، فرمێسک ئیتر سودێکی نەبوو، حاڵو ڕۆژی شەقایق وەک سادقی لێ هاتبوو، تەنیای تەنیا.

## بەشی شەشەم

"٣٤"

مەنوچەر! خولەکێک ئارامبگرە، بزانم چی دەڵێی.. چیتە ها؟ بۆچی هەرچی دەڵێم تێناگەی ئەو حاڵی..

مەنوچەر بەتوڕەییەوە تەماشای نێرگسی کردو وتی:

- ئێوە بۆچی تێناگەن! هەر وتتان ئارامبگرە!.. ئارامبگرەو، ئەمەش ئاکامەکەیەتی، ئیتر بڕام، ئیتر ناتوانم.

پەروێز هێواش وتی:

- مەنوچەر، شەقایق تەعزیەبارە، حاڵی باش نییە، دەبێت ڕەچاوی حاڵی بکەیت.

- کەمێک ددان بەخۆتدا بگرە!..

مەنوچەر وتی:

- بابە، بەسیکە! ئێستا حەوت مانگە ئامۆژن مردوە، ئێوە بەمکارانە خراپتر دەبنە هۆی نەخۆشکەوتنی، شەقایق ڕێدەکات دەڵێن حاڵی خراپە، دادەنیشێت دەڵێن لەخەفەتدا توانای ڕێکردنی نییە.. توخوا وازبێنن.

نێرگس وتی:

- تۆ دڵەخورتەی ئەوت نییە، نیگەرانی خۆتی!

پەروێز قسەکەی گرتەوەو ئەمەشی بۆ زیادکرد:

- تەماشاکە، ئێمە دەڕۆین مستیلە دەکەینە پەنجەی شەقایق، دوای ساڵی ئامۆژنت، ئینشائەڵڵا.. زەماوەنددەکەین، مەنوچەر وتی:

- ها، ئەوکاتە دەتوت وازبێنە خانوت نییە، ئێستا هاتوم، دەڵێم خانوم کڕیوە، شتێکیتر دەڵێت نە! من ناتوانم ئارامبگرم!

مەنوچەر بەبێ وتنی وشەیەک لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوە، دڵنیگەرانی ئەو لەبەر سادق بوو، سادقیش حەزی لەشەقایق بوو، دەترسا ئێستا دوای ئەم هەموو ماوە چاوەڕوانییە ئەو بێتو هەموو کارەکان خراپبکات، نەیدەتوانی گوێ لەقسەی دایکو باوکی بگرێت، بەوتەی پێشینان گوێیەکی دەرگابوو ئەوەکەی دەروازە، عەشقەکەی بۆ ئەمڕۆ سبەینێ نەبوو، شەقایقی هەر لەمناڵییەوە خۆشدەویست.

شەو داهات، نێرگس کەوتە دڵەخورتێ، کاتێک دەنگی دەرگا بەرزبووە، هەناسەیەکی ئاسودەیی هەڵکێشاو لەکاتێکدا هەڵدەستا وتی:

- مەنوچەر هاتەوە.

پەروێز پێکەنینێکی نیشانداری کردو وتی:

- نەخێر، ئەم دەستە گوڵێکە کە مەنوچەر داویەتی بەئاودا، ئێستا دەیبینی!

ساڵحو ئیسماعیل لەگەڵ پەروینو ئەعزەم لەپشت دەرگاکەوە بوون، دەڵێی پەروێز ڕاستی دەکرد، کاتێک هەمووان هاتنەژوورەوە، نێرگس وتی:

- چی بووە سەیرە لێرە..

ئەعزەم سەیرێکی هەمووانی کردو وتی:

- هەر ئەو کاتەی کە مونیرە مرد، ئێمە وتمان مەنوچەر کچەکەی دەوێت، بیبەنە لای خۆتان باشە، ئێوە هەر وتتان ئێستا کاتی نییە.

پەروێز وتی:

- مەگەر چی بووە؟!

پەروین وتی:

- وەڵڵا چی بڵێم، ئەمڕۆ عەسر کە ڕۆشتبوین بۆ بەهەشتی زەهرا کاتێک گەڕاینەوە شەقایق دیارنییە، کیومەرس دەڵێت ئیشی سادقە، کوڕی پوری شەقایق هاتوە شەقایقی بردوە.

پەروێز وتی:

- باشە بۆچی لەگەڵ خۆتاندا نەتانبرد بۆ بەهەشتی زەهرا؟!

ئیسماعیل وتی:

- بەخوا دەمانبرد، بەڵام.. بەڵام دەزانیٚ هەر کاتێک دەرۆیشتە سەر گۆڕی مونیرە هەستاندنی کاری حەزرەتی فیل بوو، دادەنیشت لەلای گۆڕەکەی ئەو خوا لێخۆشبووە، تا دەیتوانی دەگریا، ئەگەر بمانهێڵایە شەویش لای گۆڕەکە دەمایەوە.

پەروین وتی:

- بێچارە مەنوچەر، ئەگەر بزانێت..

پەروێز سەری باداو وتی:

- کیومەرس خۆی بینیویەتی سادق لەگەڵ شەقایقدا بێت؟

ئەعزەم وتی:

- نە، بەڵام.. ..باشە ئەگەر ئەو نەیبردووە دەی کیٚ شەقایقی بردووە؟

نێرگس سەری کردەخوارو وتی:

- ئیشی مەنوچەرە....!

ئەعزەم بەشێوەی پرسیار وتی:

- مەنوچەر؟!

پەروێز وتی:

- هەفتەیەکە دەڵێت بڕۆن مستیلە بکڕن، چوزانم دەڵێ مارەی بکەین.

وتم ئەی کوڕ حاڵی شەقایق باش نییە وازبێنە تاساڵی دایکی، گوێ ناگرێت.

ساڵح وتی:

- مەنوچەر هەر لەسەرەتاوە شەقایقی خۆشدەویست، گوناهێکی نییە ئەم دوو ساڵە ساڵی مەرگو میر بوو، تامرۆڤ دەرۆیشت جلی پرسە دابکەنێت دوبارە یەکێکیتر دەمرد..

پەروین وتی:

- باشە ئێستا لەکوێن؟

نێرگس بەروی خەمباریەوە سەری باداو وتی:

- ڕۆشتن بۆ کەرەج!

پەروین بەسەرسامییەوە پرسی:

- کەرەج؟!

بەڵێ، نەموتبوو لەکەرەج خانوی کڕیوە.

ئەعزەم وتی:

- ئێستا بۆچی ماتن؟.. بابە بەسەلامەتی ئەمشەو شەوی زەماوەندی کورتانە!.. مەگەر ئێوە چەند منالتان هەیە؟! کەس نەیوتوە دەبێت سازو دەهۆلی هەبێت، ئا، نێرگس دەی شیرینی یەکەت لەکوێیە؟!

ئاوازی دلگەرمکەری ئەعزەم خەفەتەکەی نەهێشت، زەردەخەنە بۆ ساتێک لەسەر لێوی هیلاکی میوانەکان دەرکەوت، ئەعزەم بەگاڵتەوە وتی:

- ئەمشەو بویت بەخەسوو!

"٣٥"

مەنوچەر قفڵی دەرگایەکی گەورەی ئاسنی کردووە.

- بڕۆ ژوورەوە.

شـەقـایـق ئەبڵەقی حـەوشـەکـە بـوو، حـەوش لەتاریکیدا نوقمبوبوو، تەنیا سێبەری دارێکی وشک بەسەر دیوارەکەوە دیاربوو، مەنوچەر دەستی نا بەپلاکی کارەبادا، حەوشێکی گەورەبوو، حەوزی هەبوو، بەڵام ئاوی تێدانەبوو، لەسوچی حەوشەکە لای دار گێلاسەکە زۆر شت هـەبوو، پلەکانەی شکاو، بێشکە، بەرمیلی نەوت، بێڵو قوڵنگە، دولای حەوشەکە وەک ماڵی نەنەگیان ژوور بوو، تەنیا ژوورە نزیکەکان بچوکتر بوو، لەلای ژوورەکانی ئەمبەری حەوشەکە، هەیوانێکی پان هـەبوو لەکۆڵەکەی گـەورەو گەچکاری کـرابـوو، مەنوچەر چووە پێشەوە کارەباکەی خستە ئیش، دەرگـای ژوورەکـەی کردەوە، ژوورەکان پاکو فەرشکراوبون، بەڵام سارد، لەلایەکی ژوورەکە خۆشنوسییەک بەدیوارەکەدا هەڵواسرابوو، دەنگی گیراوی مەنوچەر شەقایقی هێنایەوە بەخۆیدا.

- لەمە بەدواوە ئێرە ماڵتە.. ..

شەقایق بەچاوێکی پرسیاراوی ئەبڵەقی بـوو، مەنوچەر بەردەوامبوو:

- نە، وابیر مـەکـەرەوەوە مێردت بم! ئێرە زیندانە، منیش زیندەوانی تۆم، تۆش زیندانیت، تا ئەبەد تا هەرکاتێک لەژیاندا بیت چی یەکساڵ، چی سەد ساڵ،، مەنوچەر لەکاتێکدا بەرەو لای هەنگاوی دەنا هێواش وتی:

- بەڵام مەترسە، لێرە باسی زنجیر نییە، بەڵام ئەگەر بیر

لەهەلاتن بکەیتەوە دەبێت چاوەڕێی کوتەک بێت!

شەقایق بەبێزارییەوە بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتو وتی:

- گاڵتە بەسە!.. من حاڵی گاڵتەم نییە.

مەنوچەر بەرامبەری وەستاو ڕێگەکەی بەست، مۆنو بەدەنگێکی وەکو چپە لەگوێیدا وتی:

- لەهەموو کات جیدیترم.

شەقایق هەنگاوێکی بۆ دواوە ناو وتی:

- تۆ درۆت لەگەڵ کردم، وتت دەتەوێ بمبەی بۆ بەهەشتی زەهرا، بەلام نازانم ئێرە کوێیە!

- من دەمەوێت بڕۆمەوە بۆ ماڵ.

مەنوچەر قسەیەکی نەکرد، دەرگاکەی داخستو بەرەو لای ژوورەکەیتر ڕۆیشت، جێگەی خەوی هێناو لەلایەکی ژوورەکەدا داینا، شەقایق ترسابوو، مەنوچەر ڕەفتارێکی نائاسایی هەبوو، ئەمجارە هێواش وتی:

- دەمبەیتەوە بۆ ماڵ؟

مەنوچەر ئەبلەقی چاوانی بوو، شەقایق وتی:

- بەڵێ.. ؟ توخوا لێرە بمبەرەوە!

مەنوچەر پێکەنیو وتی:

- کاتێک لێم دەپاڕێیتەوە چێژ وەردەگرم! بەلام داوای لێبوردندەکەم، تۆ ئیتر هیچکات لەم ماڵە ناڕۆیتە دەرەوە.

شەقایق بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشتو بەتوڕەییەوە:

- تۆ شێتیت.. گێلێکی کە هەر چاوی کردەوە منی بینی، خۆزگە کوێر بوایەی، خۆزگە..

مەنوچەر بەئاوازێکی توڕە وتی:

- بيستو سێ ساڵە بينيم.. ئێستا ئيتر نامەوێ ببينم دەمەوێ كوێربم.

شەقايق بەرەو ڕوی وەرگەڕا، قايشێك بەدەستی مەنوچەرەوە بوو، مەنوچەر دەستی بەرزكردەوە، شەقايق قيژەيەكی كورتی كرد بەترساوی بەرەو لايەكيتر ڕايكرد.. دەنگی هاوارو ناڵەكانی شەقايق وردەوردە لەبێدەنگی ماڵەكەدا نەما، ئيتر دەنگێك نەبوو جگە لەدەنگی هەناسەی تورەيی مەنوچەر، شەقايق بەلەشێكی بريندارو خوێناويەوە لەلای ديوارەكە بێهۆشكەوتبوو.

مەنوچەر ئەو فرمێسكانەی سڕی كە بەبێخواست لەچاوەكانی هاتبونەخوارو قايشەكەی فڕێدايە لايـەك، لای پەنجەرەكە وەستاو سەيری مانگی كرد، دەنگی مەنوچەر بێدەنگی سەختی ژوورەكەی شكاند.

هەميشە دەمويست لێت بدەم ئەو كاتەی كە بەپێكەنينەوە دەچوويت بۆ ماڵی ئەو كوڕە.. لەهێنانەوە يادی ناوی سادق خوێنێكی سور بەدەمارەكانيدا ڕۆيشتو بەهاوار وتی:

تەواوی ڕۆژانی ژيانم لەگەڵتدا بووم، هەموو چركەساتەكانيم لەبيرە، دەزانی چەندە دانم هەڵڕشت دابيتە كۆترا ها، بەلام چ سودێكی هەيە سادق بەشەوێك هەموو شتێكی لەبيربرديتەوە، من زەحمەتم كێشا، من تەڵەم دانا، كەچی كەوتيتە داوی ئەو.. حەزمدەكرد لێت بدەم، ئەمشەو دڵم فێنكبووە، بەقەد ئەو هەموو ڕۆژە نەگبەتيانە! مەنوچەر ڕويكردە ئەو، پێكەنينێكی خەمبارو درێژی كردو بەردەوام بوو:

- تێدەگەی چی دەڵێم؟

تۆ هەردوکمانت فریودا، بەڵام هەمیشە لەسێ نەفەر یەکێک زیادەیە، یا ئەو یا من، ئەو گێلبوو، بەڵام من زیرەکیم کرد، باش دەزانم نابێت لەژن دڵنیابیت، تۆ هەمووانت بەمن ناساند، بەڵام لەئەمشەو بەدواوە، شەوانی سادق زۆر جوانە! ئەگەر بەراستی عاشقت بووە بێگومان دەبێ خۆی بکوژێت، بەڵام گێل، شێت ئەو زۆر پیسبوو، جانەوەرێکی سادە گوڵی سەر ڕێگەمی خوارد، نەیزانی ئەم پشیلەشە دەتوانێت دەستبکێشێت!

ساتێک بێدەنگی بڕیاردەربوو، مەنوچەر بەتوڕەیی بانگی کرد:

تاوانی تۆ نییە، من خۆم هیچکات ڕاستگۆنەبوم، هیچکات بۆم نەسەلماندی کە ئەگەر کاسەی ئارامیم بگاتەسەر چیدەکەم، تۆ.. تۆ هیچکات باوەڕت پێنەکردم، واتزانی هەر ئەو منداڵەی دوێنێم کە کاتێک پێی بڵێی بڕۆ ونبە دەڕواتە گۆشەیەک فرمێسک دەڕێژێ؟.. ئیتر هەموو شتێک تەواوبوو، تۆ لێرەی، سادقیش ناتوانێت هیچکارێک بکات، جگە لەوەی کە لەخەفەتدا بمرێت.. نە لەخەفەتی تۆ، بەڵکو لەخەفەتی گێلی خۆی!

ئەو.. ئەو لەکوێ بوو کاتێک من عاشقت بووم؟ لەمەیخانەکان سەرخۆشبوو، ئاگای لەدڵی من نەبوو، ئێستا بهێڵە بزانێت من چیم کێشاوە، لەخۆبایی نەبووم، بەڵام ئێستا دەمەوێت بم، بۆچی من دەبێت هەمیشە واز بهێنم؟.. بۆچی تۆ جارێک لەبەر من وازت نەهێنا؟ بۆچی جارێکیش نەتزانی کە من عاشقتم؟.. بۆچی جارێک باوەڕتنەکرد؟!

وەکو کەو سەرتکرد بەژێر بەفردا، نەڕۆژگارە، نەدونیا، هیچ کامیان گرنگ نەبوو بەلاتەوە، جگە لەو بەرەڵای پیسە! گۆڕی باوکی مەنوچەر، بەڵام داخەکەی دەخەمە دڵتەوە.

بەیانی شەقایق لەتاو ئازار چاویکردەوە، بۆ ساتێک لەبیری چوبوو لەکوێیە، بەبینینی خوێنی وشک لەسەر دەستی، جارێکیتر هەستی بەئازارکردەوە، توانای هەستانی نەبوو، ماڵەکە بەپێچەوانەی شەوی پێشو گەرمبوو، هیچ دەنگێک نەدەهات، جگە لەدەنگی کاتژمێرەکە کە ئەوی ئاگاداری کاتژمێرە بچوکەکەی سەر پەنجەرەکە کردەوە، کاتژمێر دە بوو، دەستی گرت بەدیوارەکەوەو ئارام ئارام هەستا، هێواش هەنگاوی نەنابوو کە دەرگاکە کرایەوە، لەشی مەنوچەر لەرزی خستەگیانی، هەر لەوێ لەشوێنی خۆی دانیشتەوە، مەنوچەر هاتو بەرامبەری دانیشت، شەقایق لەترسا هەناسەی لەسنگیدا قەتیسکردبوو، سەیری زەویەکەی دەکرد، مەنوچەر بەجوڵەیەکی خێرا سەری بەرزکردەوە، شەقایق بەترسەوە بەرەو دواوە ڕۆیشتو تەواوی لەشی ئازاری هەبوو، ترس‌و ئێش بووە هۆی ئەوەی کە جارێکیتر بگری، مەنوچەر بێ ئەوەی قسەیەک بکات چووە ژوورەکەیتر، کاتێک گەڕایەوە کراسێکی بەدەستەوە بوو، کراسەکەی بەرەو ڕوی شەقایق هەڵداو بەئاوازێکی فەرماندەرانە وتی:

- هەستە بڕۆ بۆ گەرماو.. ئیتر نامەوێ ئەم جلەرەشە لەبەرتدا ببینم.

شەقایق هەر بەماتی ئەبڵەقی بوو، مەنوچەر بانیگیکرد:

- هەستە!

شەقایق ئەڵێی تازە هۆشی هاتبووە لای خۆی، لەشوێنی خۆی وەستا، مەنوچەر لەپێشیەوە ڕۆیشت بەرامبەر گەرماوەکە وەستاو وتی:

هەموو شتێک لەوێیە، بەڵام ئەگەر شتێکت ویست بانگم بکە! من هەر لێرە دانیشتووم.

شەقایق زۆری خایاند، مەنوچەر بێزاربوو، هەستاو بەتورەیی مستێکی لەدەرگاکە دا، چەند خولەکێکی نەخایاند کە شەقایق لەگەرماو هاتەدەرەوە، کراسەکە زۆر جوانبوو بۆی، پەڵەیەکی شین لەسەر گۆنای شەقایق دەرکەوتبوو، کەوتەوە بیری کە دوێنێ شەو مستێکی دابوو لەدەموچاوی، مەنوچەر دەستی بردە پێشەوە بۆ ئەو پەڵەیە، شەقایق ترسا، دەموچاوی بردە دواوە، ئیتر نەیدەویست بگری ئەگەر بیزانیایە، مەنوچەر چێژ لەگریانی وەردەگرێت، هەرگیز ئامادەنەبوو بگری، بەڵام کینەیەکی قورس گەروی گرتبوو، مەنوچەر بەخوێنساردییەوە:

- مەترسە!.. نامەوێت لێتبدەم، یانی ئێستا نامەوێ، بەڵام هەر کاتێک بمەوێت لێتدەدەم!

مەنوچەر ئەبڵەقی ناو چاوی شەقایق بوو، شەقایق ویستی خۆی دورخاتەوە، بەڵام مەنوچەر سەری گرتو هێواش وتی:

- چەند ڕقم لەم چاوە بێ شەرمانەیە.

لەو ساتەدا دڵۆپە فرمێسکێک لەچاوی شەقایق هاتەخوارەوە، چەناکەی لەرزی، بەڵام دوبارە بێدەنگبوو، هیچکات نەیدەتوانی ئەو مەنوچەرە میهرەبانە بەمشێوەیە ببینێ، هەردوکیان دوبارە ڕۆیشتنەوە ئەو ژوورەوە، مەنوچەر وتی:

- لێرە لەبەردەم زۆپاکە دابنیشە!

خۆی لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە، کاتێک گەڕایەوە لەسەر سینیەک نانی بەیانی هێنابوو، سفرەکەی داخستو بەباشی شتەکانی لەسەری دانا.

- بخۆ.
شەقایق هاتە پێشەوە، دەستی بۆ نانەکە` درێژکرد، لەسەر برینەکەی هێشتا خوێنی وشک هەبوو، مەنوچەر بەتوڕەییەوە:
- لەگەرماوەکە چیت کرد؟ بۆچی دەستت نەشتووە؟.
شەقایق خێرا دەستی بـــردەدواوە، مەنوچەر لەبێدەنگی شەقایق بەتوڕەیی هاواریکرد:
- دەڵێم بۆچی دەستت نەشتووە؟
پاشان دەستی بەرز کردەوە بۆ لێدانی، شەقایق بەترسەوە:
- چیبکەم، جێگەکەی دەچوزایەوە، ئیشی دەکرد.
مەنوچەر هەستا دەستی ئەوی ڕاکێشاو بەرەو گەرماوەکەی برد.
- قۆڵەکەت بەرز بکەرەوە..
شەقایق وەک منداڵێک بوو کە داوای بەخشین لەدایکی بکات، بەڵام مەنوچەر بێبایەخ ئاوی بەدەستیدا کردو خۆی دەستی بۆ شت، بەتوڕەییەوە:
- ڕاستییەکەی بڵێ خۆت شت یان نە؟!
شەقایق بەئاوازێکی منالانە بەدەم گریانەوە:
- بەڵێ، خۆم شت!
- هەستە برۆ بۆ ژوورەکە دەبێت قاوەڵتیەکەت تەواو بکەیت.
مەنوچەر دەستی شتو ویستی لەگەرماوەکە بچێتەدەرەوە چاوی بەخاولیەکە کەوت.
خوێن بەسەر خاولیەکەوە بوو، بێبایەخ وتی:
- باشە، کەواتە خۆی شتووە.
کاتێک ڕۆیشتە ژوورەکەی شەقایق پیاڵە چاکەی خواردبوو،

بەهەمان تورەییەوە پێی وت:

- شیرت خوارد یان نە؟

- نامەوێ.

مەنوچەور مۆنەی کردو وتی:

- چیت وت؟! وەرە ئەم پەرداخە شیرە بخۆ، تاکۆتایی!

شەقایق بەدەستە لەرزۆکەکانی پەرداخەکەی لەدەستی وەرگرت.

مەنوچەر سینییەکەی کۆکردەوەو بردی، شەقایق ڕۆیشتە جێگەکەی دانیشت، مەنوچەر چەند کتێبو دەفتەری هێنا، ئامێری ژماردنو پێنووس، بێبایەخ سەرقاڵی ئیشەکانی بوو، شەقایق خەوتبوو، سەری خستبووە سەر باڵیو خەوتبوو.

مەنوچەر سەیرێکی کردو دەستی کردەوە بەئیشەکانی، نیوەڕۆ چێشتی لەدەرەوە کڕی، کاتێک هاتەوە شەقایق هێشتا خەوتبوو، دەموچاوە بچوکو بێتاوانەکەی بێگوناهـ دەریاندەخست.

- هەستە!

شەقایق چاوی کردەوە ئەبڵەقی دەموچاوی مەنوچەر بوو، مۆنەی کردبوو، وەکو بەیانی، وەک دوێنێشەو، دڵی گیرا، ئەگەر زەردەخەنەی بکردایە لەوانەیە بوێری هەبوایەو بیوتایە:

- دەمەوێ بگەڕێمەوە.

بەڵام ئێستا لەو دەترسا.

- برسیم نییە..

مەنوچەر ڕویتێکردو بەتورەییەوە وتی:

- جارێکیتر دەدەم لەگوێچکەت.

بۆنی کەبابەکە برسی کـرد، سـوپـاس بـۆ خـوا مۆڵەتی نانخواردنی هەبوو، کاتێک خـواردنـی چێشتەکە تـەواوبـوو، ویستی خوانەکە کۆبکاتەوە، مەنوچەر دەستی خستەلاوەو وتی:

- نایەوێ، برۆ لەشوێنەکەت دابنیشە!

دوای نـیوەڕۆ بـوو، مەنوچەر سەرقاڵی کـارەکـەی بـوو، شەقایق بەئارامی دەگریا، مەنوچەر سەری بەرزکردەوە، چاوی بەدەموچاوی گریاناوی شەقایق کەوت، بەتوڕەییەوە

- چیتە؟.. بۆچی دەگریت؟.. واتزانیوە بەم شانۆیانە دەهێڵم برۆی؟..

شەقایق بەهێواشی:

- نە، پشتم ئازاری هەیە!

مەنوچەر سەری کردەخوار.

- بۆچی؟

شەقایق بەدەم گریانەوە وتی:

- پشتم دەچوزێتەوە.

مەنوچەر بایەخی پێنەدا، شەقایق کاتێک بێبایەخی ئەوی بینی بەلادا کەوت، سەیرکردنی خوماراوی، خەوی لێکەوت.

مەنوچەر لێی نزیکبووە، جلەکەی شەقایق خوێناوی بوو، لەبەرئەمە پشتی ئێشی دەکرد.

"٣٦"

سـادق بـەتـەواوی نیگەرانبوو، هەفتەیەک دەبـوو ئاگای لەشەقایق نەبوو، پێنج شەممە ژوانی هەبوو لەگەڵیدا، لەپارک، بەڵام ئەو نەهاتبوو، چەند بیرێکی جۆراوجۆر دەهات بەمێشکیدا،

لەوانەیە بردبێتیان بۆ گەرمەسێر بۆ گۆڕینی هەوا، یا لەوانەیە نەیتوانیبێ بیانویەک بهێنێتەوە کە بێتەدەرەوە! نەوەک مەنوچەر بردبێتی بۆ ماڵی خۆیان؟.. بەخۆی وت:

بەمجۆرە نابێت دەبێت بڕۆم ناونیشانی خانووە تازەکەیان وەربگرم، بەڵام لەوانەیە لەوێش نەبێت.. کەواتە شەقایق لەکوێیە؟!

سادق بێزاربوو، نەیدەزانی چی بکات، لەکۆتایدا بڕیاریدا یارمەتی لەفاتمە وەربگرێت، ئەو بێگومان دەیتوانی هەواڵی شەقایق بزانێت، هەرچی بێت ئەو کچ بوو، مەنیجە خۆی لەماڵ نەبوو، سادق خۆشحاڵبوو ئێستا دەیتوانی هەموو شتێک بەئاسودەیی بەفاتمە بڵێ، فاتمەش دەیزانی سادق ئەم ڕۆژانە گرفتاری شەقایقە، لەبەرئەمە پرسی:

- شەقایق چۆنە؟

سادق سەری کردەخوارو بەدەنگێکی هێواش وتی:

- ڕاستییەکەی من لەبەر ئەو هاتم بۆ لای تۆ!

فاتمە بەهەراسانی پرسی:

- مەگەر چی بووە؟!

سادق ئارامتر وتی:

- هیچ هەواڵێکی نییە، نازانم لەکوێیە؟.. نیگەرانیم.

پاشان وتی:

- ئاخر من لەگەڵیدا یەک بینیمان هەبوو، بەڵام نەهات، دەترسم نەخۆش کەوتبێ!.. ناتوانم، نابێت بڕۆم بۆ ماڵیان، فاتمە تۆ دەڕۆیت هەواڵێکم بۆ بێنی؟..

فاتمە بزەیەکی شاراوەی خستەسەر لێوی‌و وتی:

- کاتێک دایکم گـەڕایـەوە، بەیەکەوە دەڕۆیـن بۆ ئـەوێ، نیگەران مەبە! بێگومان نەیتوانیوە لەماڵ بێتەدەرەوە ئەگینا شەقایق شتی لەبیرناچێت.

بەدرێژای ڕێگەکە هەردوو بێدەنگبون فاتمە لەگەڵ خۆیدا وتی:

- یانی بەڕاستی سادق عاشقی شەقایق بـووە؟.. هەڵبەت ئەگەر عاشقی نەدەبوو جێگەی سەرسوڕمانبوی، بەڵام ئەوەی کە شەقایق عاشقی سادقە زۆر سەیر نییە، سادق ڕەوشتێکی سەرنجراکێشی هـەیـە، هـەر بێبایەخییەکەی دڵـی مـرۆڤ دەدۆڕێنێ، چاوەکانیشی جوانە، کاتێک سەیری مرۆڤ دەکات وا بیردەکاتەوە کە لەسەیرکردنیدا مەبەستێک هەیە!.. بەڵام ئەو لەکۆتایدا بێبایەخ وازت لێدێنێتو دەڕوات..

کاتێک گەیشتنە بەرامبەر خانوەکە، سادق لەسەر کۆڵانەکە چاوەڕوانی فاتمەی دەکرد، پەروین دەرگاکەی کردەوە، فاتمە بەڕویەکی خۆشـەوە سـڵاوی کـرد، پـەروین دەیـزانـی فاتمە لەبەرچی هاتوە، بەرەو ماڵەوە بردی، پەروین وتی:

- ڕاستییەکەی نازانم چی بڵێم؟!.

تۆ زیاتر لەبەر براکەت هاتوی بۆ ئێرە.. سەیرکە فاتمەگیان شەقایق لێرە ڕۆشتووە، ئەوەندە بێدەنگ ڕۆیشت کە تەنانەت ئێمەش نەمانزانی، هەفتەیەکە شـەقایق زەمـاوەنـدی لەگەڵ مەنوچەردا کردووە!.. زۆر بێدەنگ، بەڵام لەکۆتاییدا بەرێگەی یاسا ئێستا بوەتە ژنی مەنوچەر، بڕوابکە تەنانەت ئێمەش نازانین مەنوچەر ژنەکەی بۆ کوێ بردوە، تەنانەت بەدایکو باوکیشی نەوتوە، بەمجۆرە پێت بڵێم، کە هێواش هاتو شـەقایقی

برد، ئێستا بەخواستی شەقایق، یان بەزۆر، جیاوازییەکی نییە هەر ئەوەیە کە شەقایق ئیتر شویکردوە، بەبراکەت بڵێ دەستبەرداری بێت، بهێڵێ بۆ خۆیان بژین، بەبێخودی نەبێتە مایەی ئازاردانیان، هەرچی بووە ڕۆیشتوە، ئینجا مەنوچەر ماوەیەکە چاوەڕێی ڕۆژێکی وایە.

ئەگەر مونیرە نەمردایە، بێگومان نەیدەزانی چی بڵێت، پەروین هەموو شتەکانی وتبوو ئیتر مەیەن بۆ ئێرە!

فاتمە دەمی داخستبوو، نەیدەزانی چی بڵێت، پەروین هەموو شتەکانی وتبوو، کاتێک خواحافیزی لێکرد تازە بەهۆشی خۆیدا هاتەوە، چۆن بەسادق بڵێت کە شەقایق چیتر بونی نییە.

چۆن تێی بگەیاندایە هەرچی لەنێوان ئەو شەقایقدا هەبوو تەواوبوە.

- چی بووە؟..

دەنگی سادق زنجیرەی خەیاڵەکانی فاتمەی بڕی، فاتمە نەیدەزانی چی بڵێت، سەیرێکی دواوەی کردو بەهێواشی وتی:

- سادق..! هەموو شتێک تەواوبوو.

سادق بەرامبەری وەستاو بەدەنگێک وەکو هاوار وتی:

- چی تەواو بووە؟.. شەقایق قسەیەکی کرد؟

فاتمە سەری کردەخوارو بەئاوازێکی کیناوی وتی:

- شەقایق ڕۆیشتووە.. مەنو.. مەنوچەر ئەوی بردوە، دیارنییە بۆ کوێ، ئەوان.. ئەوان زەماوەندیان کردوە!

وتنی ئەم ڕستەیە چەند سەختبوو، سادق دەستی بەدیوارەکەوە گرت، هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو نەیدەزانی دەبێت چی بکات، بێئامانج بەرەوماڵیان کەوتەڕێ، هێشتا

لەدەرگای نەدابوو دەرگاکە کرایەوە، کیومەرس سەری سوڕما بەبینینی ســادق، فاتمەش بەبینینی ئـەو هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو هێواش بەرەو لایان ڕۆیشت، سادق هێواش وتی:

- ڕاستە کیومەرس؟.. ڕاستە کە مەنوچەر..

مەنوچەر لەکاتێکدا پشتی پێڵاوەکەی ڕادەکێشا وتی:

- تەنیا ئەو نەڕۆیشتوە، لەگەڵ شەقایقدا بەیەکەوە ڕۆشتون، ئێمە ڕۆشتبوین بۆ بەهەشتی زەهـرا.. من دڵنیام شەقایق بەڕەزامەندی لێرە نەڕۆشتوە!

سادق بەتوڕەییەوە وتی:

- تۆ ناونیشانەکەیت هەیە؟

کیومەرس پێکەنیو وتی:

- ئەو مەنوچەرە ئەوەندەش بێ دەستوپێ نەبوو، خانویەکی لەکەرەج کڕیوە، ئێستا کوێی کەرەج خوا دەزانێت! بەڵام ئێستا هەفتەیەکە دیار نەماون، ئیتر ڕۆیشتون، دۆزینەوەی شەقایق چ سودێکی هەیە، هەموو شتێک تەواوبوە..

ئەوان ڕاستت دەکەن ئیتر گەڕانی تۆ چی سودێکی هەیە؟.. شەقایق ئێستا بەشەرعی ژنی مەنوچەرە؟.. چی ڕازی، چی ناڕازی، تۆ ناتوانیت کارێک بکەیت.

ســادق بەماتی لەحەوشەکە دانیشتبوو، مەنیجە بـەدەم ڕۆیشتنەوە: پەیوەندیان بەیەکەوە هەبوو قسەکان، بەڵام گوێی سادق پڕبوو لەدەنگی شەقایق، دڵی ئومێدەواربوو، هەر نەیدەتوانی وەک ئەوانیتر بیربکاتەوە، شەقایق پەیمانی پێدابوو کە ئەگەر مەنوچەر ناچاریکرد لەگەڵیدا بڕوات، شەو لەدەستی هەڵبێت.

سادق بەهێنانەوە یادی ئەم قسەیە لەناکاو ڕویکردە مەنیجەو وتی:

- بەڵام شەقایق پەیمانیدا کە ئەگەر ڕۆژێک ئەمە ڕوبدات هەڵبێت!

مەنیجە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو بەتوڕەییەوە:

- خۆت بخەرە جێگەی مەنوچەر، تۆش ئەگەر لەجێگەی ئەودا بوایەی نەتدەهێلا شەقایق جوڵەبکات.

لەوانەیە ئێستا مەنوچەر کردبێتیە زیندانەوە! تۆ مەگەر منداڵی، شەقایق کچێکە، چۆن دەیەوێت هەڵبێت؟

جارێکیتر خەم بەسەر سادقدا زاڵبوو، خۆی بەدۆڕاو دەزانی، هیچ ئیشێکی لەدەست نەدەهات.

یانی بەڕاستی هەموو شتێک تەواوبوو، ئەو خەیاڵانە لەناوچون، کۆشکە ئاڵتونیو ئارەزوەکانی بۆ هەمیشە وێرانبوو، سادق لەگەڵ خۆیدا وتی:

ئیتر ئومێدێک نییە، تەنانەت ڕوناکییەکی بچوکیش، کەمێک عاقڵ بە سادق، مەگەر گاڵتەیە ئیتر بەچی دڵخۆشی بڕۆ بمرە! بۆ هەمیشە تەنیا بوویت، بۆ هەمیشە، شەقایق ڕۆیشتە ماڵی مەنوچەر، ماڵی تۆش کوێربویەوە، وێرانبوو، هیوات بێهیوابوو، بەدبەختبویت، بینین.. بینیت ڕاستە، ئەوەی کە دەڵێت عەقڵ بەسەر هێزدا سەردەکەوێت! تۆ بەرەلابوی، بەڵام ئەو دانا، ئەو بیریکردەوە، بەڵام تۆ تەنیا دەمبوی، تەنیا قسەتکرد، بەڵام ئەو ئەنجامی دا.

بۆنی بەهار لەپشتی دەرگا بەستراوەکانەوە دەهات، داری گێلاسەکە دوبارە زیندودەبووە لەگۆشەی دیوارەکە، گوڵەکانیش

گەلایان دەکرد، بەڵام حەیف لەلای بەرمیلە ژەنگاویەکانەوە بوو، خراپ بوو، خۆیان دەرنەدەخست، ئاسمان ڕەنگی شین نەبوو، بەڵام بۆنی باران مانگی دەورداد دەهات.

لەبەیانییەوە تا ئەو کاتەی مەنوچەر لەئیش دەگەڕایەوە شەقایق بەتەنیا لەزیندانەکەی مەنوچەر ئەملاو ئەولای دەکرد زۆربەی کات لەسەر لێواری پەنجەرەکە دادەنیشت کە ئەوەندەی تاقێک بوو ئەبڵەقی حەوشەکە دەبوو، ئێستا ئیتر ناوی ڕۆیشتبووە ناسنامەی مەنوچەرەوە، بوو بووە ژنی مەنوچەر مۆڵەتی وەرگرتبوو لەڕێگەکەدا ڕۆیشتبوو بۆ شت کڕین، نەخشەی زۆری بۆ جەژن کێشابوو قفڵەکەی کردەوەو هاتە ژوورەوە، شەقایقی بینی لەپشت پەنجەرەکە خەوی لێکەوتبوو، چەند ڕقی لەمکارە بوو، وەک ئەو ژنە فیتنانەی کە بەردەوام باسی ئەمو ئەو دەکەن، هێواش دەرگاکەی کردەوە، دەیویست غافڵگیری بکات هێشتاش سەر سەختبوو لەگەڵ شەقایقدا، زۆر قسەیان بەیەکەوە نەدەکرد، زیاتر خۆی قسەی دەکرد، دەیویست بیسەلمێنێ بۆی کە دەتوانێ سەرنجراکێش بێت، بەڵام بەم ڕەفتارە، ئیشەکان باشترو زیاتر دەچونەپێشەوە، بەسەر سەری شەقایقەوە وەستاو مۆنەی کرد، بەدەنگێکی فەرماندەرانە وتی:

– هەستە، بزانم!

شەقایق ترسا بوو، خێرا لەپەنجەرەکە هاتەخوارەوە.

– سڵاو!

مەنوچەر بەسەرسامییەوە:

چیت دەوێ لەپشت پەنجەرەکە؟.. باش دەزانیت نامەوێ لەپشت پەنجەرەکەوە بتبینم.

- ئیتر دانانیشم.

مەنوچەر ئەو شتانەی کە کڕیبووی بردیە چێشتخانەکە، شەقایق بەدوایدا ڕۆیشتە چێشتخانەکە.

مەنوچەر میوەکانی کردە قاپشۆرەکە، بەدوای قاپدا دەگەڕا کە میوەکانی تێبکات، شەقایق ڕۆیشتە پێشەوەو لەشوێنی قاپەکاندا سەبەتەیەکی دەرهێناو پێیدا، مەنوچەر سەبەتەکەی لەدەستی سەندو هاواریکرد:

- کێ وتی بێی بۆ ئێرە؟.. بڕۆ ژوورەکە بزانم، ئەوەندە بەدەوروبەرمدا مەسوڕێرەوە!

شەقایق بەرەو ژوورەکە ڕۆیشت، ویستی لەهۆڵەکە دابنیشێت، بەڵام بڕیاریدا بڕوا بۆ ژوورەکەیتر، لەبەریانی تا خۆرئاوا تەنیابوو کاتێکیش مەنوچەر لەماڵ بوو، لەشوێنێکدا بەبێدەنگی دادەنیشت، بێزاربوو، مەنوچەر یەک وشەش قسەی لەگەڵدا نەدەکرد، مەگەر بیەوێت شەڕی لەگەڵدا بکات... دەستی لێدەرەکەشی خراپ نەبوو، بەوتەی نەنەگیان بێ کات بوو، کاتو بێ کات دەیدا لەژێر گوێی.

شەقایق هەندێکجار لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد، لەگەڵ خۆیدا دەیوت:

من دەزانم ئەمە دەیەوێت داخەکانی بڕێژێت، لەبیرم نایەت ئەمەندە خراپەم لەگەڵیدا کردبێت کە من ئێستا ئەوەندە سزام هەبێت، ئەمە، ئەو مەنوچەرە نییە، ئەو مەنوچەرە حەزی نەدەکرد بەخەڵک بڵێ "تۆ" ئەگەریش بیوتایە زوو داوای لێبوردنی دەکرد،

خۆزگە ئێستاش وەک ئەو کاتانە بوایە، بەخودا دەیبەخشم خۆ من کینە لەدڵ نیم، بەڵام وەک ئەوەی ئەو ڕۆژانەی لەبیرچوە، لەبیری چوە کاتێک دەتۆرام چۆن نازی دەکێشام، من بەراستی نەدەتۆرام، بەڵام حەزیدەکرد نازم هەڵگرێت، ئا...ئا ئەو جارە چی؟

مەنوچەر هاتە ژوورەکــەوە، سەیری دەوروبــەری کردو هێواش وتی:

- دەی ڕۆیشتی بۆ کوێ؟!

شەقایق لەژوورەکە لەولای دیوارەکەوە دانیشتبوو، مەنوچەر وتی:

- وەرە بۆ ئێرە

شەقایق لەدونیای خۆیدا بوو.

- حەز ناکەم بێم.

لەگەڵ خۆیدا وتی:

- ئێستا دەڵێت، شەقایق نازمەکە، وەرە ئیتر.. چییە دوبارە تۆراوی؟

شەقایق هەر لەدونیای خۆیدابوو کاتێک قورسی دەستی مەنوچەر لەسەر دەموچاوی، هێنایەوە هۆشی خۆی، وەکو منداڵ دەستی خستەسەر دەموچاوی‌و بەگریانەوە دەستی بەئای‌و وای.. کرد.

مەنوچەر بەرامبەری دانیشتبوو، بەتوڕەیی ئەبڵەقی بوو، بەهاوار وتی:

- چییە؟ وادەزانی ماڵی پورتە؟

پاشان بەگاڵتەوە ڕستەکەی ئەوی دوبارەکردەوەو وتی:

- زۆر ڕودار بویت، دیارە لێدانێکی باشت دەوێ؟

شەقایق بەشەرمەوە سەری کردەخوارو وتی:

- باشە، هۆشم نەبوو.

مەنوچەر وازی نەهێنا هاواریکرد:

- هۆشت لەکام گۆڕستانە بوو؟

شەقایق بەچەند وشەیەکی پچڕپچڕ:

- من.. من

مەنوچەر بەبێزارییەوە:

- تۆ چی؟

شەقایق نیگای هەراسانی ڕووکردە مەنوچەرو بەهەمان ئاواز وتی:

- من.. من لەتۆ دەترسم!

مەنوچەر بەسەرسامییەوە سەیری دەکرد، نەیدەزانی چی بڵێت، بەڵام زوو خۆی کۆکردەوە، هەستە چێشت ئامادەیە!

شەقایق بێخواست ئەو قسەیەی کرد، بەکاریگەری قسەکەی خۆشحاڵبوو، سێ چوار ڕۆژی مابوو بۆ جەژن، مەنوچەر ئیتر نەدەڕۆیشت بۆ سەر ئیش، تەواوی کات لەحەوشەکەدا دەسوڕایەوەو پێداویستییە زیادەکانی حەوشەکەی دەبرد بۆ کۆگایەک، حەوشەکە دەڵێی گەورەتربوو ، شەقایق لەپشتی دەرگاکەوە سەیری حەوشەکەی دەکرد، کاتێک هیلاکدەبوو خۆی بەکارێکی ترەوە سەرقاڵدەکرد، دەترسا لەژوورەکە بێتەدەرەوە.

مەنوچەر بەتەواوی ئیشی کردبوو، بەهیلاکی لەسەر هەیوانەکە دانیشتبوو، سەیری حەوشەکەی دەکرد، دەنگێک

لەپشتەوە دای لەگوێی، ڕووی بەرەو دەرگای ژوورەکە وەرگێڕا شەقایق لەناو ژوورەکە وەستابوو سینیەک چا بەدەستییەوە بوو، مەنوچەر هەستاو ڕۆیشتە ژوورەکـەوە، سینییەکەی لەدەست سەندو دانیشتو بەبێ پێشەکی وتی:

- سبەیشەو چێشت لێبنێ، مامە ساڵحو مامە ئیسماعیل لەگەڵ منالەکانیدا لەتارانەوە دێن بۆ ئێرە..

پاشان بەهێواش وتی:

- وەک منو تۆ زەماوەندمان کردووە.

دوای کەمێک وەستان بەهەڕەشەوە:

- بەلام، وای بەحاڵت ئەگەر ببیستم قسەیەکی بێخودت کردوە! یان گلەیت لای ئەمو ئەو کردبێت، ئاگات لەخۆت بێت، تێدەگەی؟

شەقایق قسەیەکی نەکرد، بەڵام خۆشحاڵبوو لەوەی کە دوای ئەم ماوەیە دەیتوانی هەمووان ببینێت، بەتەواوی بێزاربوو، بەیانی وەک هەموو ڕۆژێـک مەنوچەر ڕۆیشتە حەوشەکە، ئەویش سەرقاڵبوو، دەیویست پلاوی سەوزی لەگەڵ ماسیدا دروستبکات، بەڵام مامە پەروێز زۆر حەزی لەماسی نەبوو، کەواتە باشترە مریشکیش دروستبکات.

مەنوچەر وتبوی هەر شتێکمان نییە بەمن بڵێ بابیکرم، بەڵام هەموو شتێک لەماڵدا هەبوو، عەسر مەنوچەر ڕۆیشتە دەرەوە، قسەیەکی لەگەڵ شەقایقدا نەکرد، بەڵام هەرچی بوو بێگومان بۆ شتکڕین ڕۆیشتبوو، چونکە زەمبیلی بەدەستەوە بوو، کاتێک گەڕایەوە پاکەتێک شیرینی کڕیبوو هەندێک گلۆبەڕۆژەو چەرەسی هێنابوو، کاتێک هاتەژوورەوە، بۆنی چێشتەکە ئەو

ناوەی گرتبوو، شەقایق ڕۆشتبوە گەرماو، کاتێک هاتەدەرەوە مەنوچەر لەبەردەم گەرماوەکە وەستابوو، شتێک لەدەستیدا بوو، بەئاوازێکی جیدی وتی:

- ئەم کراسە لەبەر بکە!

کراسێکی جوانبوو، ئاورێشمی شین!

شەقایق سەیرێکی مەنوچەری کردو بەپاڕانەوە وتی:

- ئاخر مەنوچەر..

مەنوچەر فەرماندەرانە وتی:

- لەبەریکە!

شەقایق کراسەکەی بەبێ ئارەزو لەبەرکرد، بەرامبەر ئاوێنەکە وەستا ئەو پەیمانە کەوتە بیری کە لەگەڵ خۆیدا بەستبوی، پەیمانی دابوو تا ساڵی دایکی جلی ڕەش دانەکەنێت، بەڵام ئێستا بەزۆری مەنوچەر ناچاربوو پەیمانەکەی بشکێنێ.

مەنوچەر هاتەژوورەوە، ئەویش جلەکەی گۆڕیبوو، ئەمجارە بەئاوازێکی گونجاوتر وتی:

- ئەمانەم بۆ تۆ کڕیوە.

لەپاکەتە سورە مەخمەڵییەکەدا ئاڵتون هەبوو، جوتێک گوارەو دەستبەندو ملوانەو ئەنگوستیلەیەک!

شەقایق بێهۆ دەستی بەگریان کرد، مەنوچەر تەماشایەکی کردو بەدڵسۆزییەوە وتی:

- بەسە ئیتر، چەند دەگریت؟! ئێستا میوانەکان دەگەن!

پاشان لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوە.

- خۆرئاوا میوانەکان گەشتن، شەقایق زۆر خۆشحاڵبوو، ئەعزەم بەپێکەنین دەیوت:

- بەه، بەه، بوکو زاوای ڕاکردو چۆنن؟
ژنەکەی فەرهاد زۆر پێدەکەنی، بەدەم پێکەنینەوە:
مەگەر دەستو قاچتانیان بەستبوەوە کە بەمجۆرە ڕۆیشتن؟!
نێرگس سوپاسی خودای دەکرد، بەڵام دڵی گیرا بوو، دەیویست زەماوەندێکی درێژی بۆ بکردایەن، بەڵام ئیتر سودی نەبوو.
میوانەکان تاشەوی دواتر مانەوەو شەو دوای شێوان خواردن هەموویان ڕۆیشتنەوە، مەنوچەر هەرچی کرد نەیتوانی نێرگسو پەرویز دابنێت، دەڵێی بڕیاربوو هەموویان جەژن لەمەشهەد بکەن، ماڵەکە دوبارە بێدەنگبووە، مەنوچەر ڕۆیشتە ژوورەوە، شەقایق لەگەڵ خۆیدا بیریکردەوە هەموو شتێک وەک سەرەتابوو.
هەستە جلەکانم بهێنە!
شەقایق ڕۆیشتە ژوورەکەو جلەکانی مەنوچەری لەکۆمەدییەکە دەرهێنا، مەنوچەر جلەکانی گۆڕی، شەقایق هێواش وتی:
- دەتەوێت بڕۆیتە دەرەوە؟
مەنوچەر سەیرێکی کردو وتی:
- بەڵێ.
شەقایق بێخواست وتی:
- بەتەنیا؟
مەنوچەر پێکەنینێکی نێشداری کردو وتی:
- بەڵام، دەمەوێ بڕۆم خۆشی ببینم! تۆش دابنیشە، بخەوە.
شەقایق ڕۆیشتە ژوورەکەیترو لەکونجی دیوارەکەدا

دانیشت، مەنوچەر هاتە ژوورەوە، لەلای دەرگاکە وەستاو بەگاڵتەجاڕییەوە:

- دەرک بەحاڵت دەکەم، دەزانی بۆ؟

شەقایق ڕاست سەیری چاوانی کرد، مەنوچەر بەتوڕەییەوە:

ئەو کات کەتۆو دایکت دەڕۆشتن بۆ لای.."مەنوچەر کەمێک وەستاو فەرماندەرانە وتی:" لای نەنەگیانت من وەک ئێستای تۆ لای دیوارەکە کزەم دەکرد، ئەو کاتە لەکوێ بوی؟.. لەلای سادق خان دڵت دەداو دڵت وەردەگرت!.. ئێستا نۆبەتی منە، من دەڕۆمە دەرەوە، تۆ دەبێت لێرە بپیشێی.. چێژوەردەگرم لەدڵۆپبون بەئاوت چێژ وەردەگرم.

شەقایق بێدەنگبوبوو، بەڕاستی کێ تاوانبار بوو؟.. خۆزگە هیچکات ئەو نەبووایە، ئێستا کە بیری دەکردەوە دەیبینی ئەوو سادق هەردوکیان ڕاستیان کردوە، دەیبینی کە خراپەی کردووە لەگەڵ هەردوکیاندا، چونکە دڵی دابوو بەهەردوکیان، چێژی دەبرد لەوەی کە دوو کەس عاشقانە میهرەبانی لەگەڵدا دەکەن، لەخۆبایی بوو، هەردوکیانی فریودابوو، بەڵام نەیدەتوانی بەیەکێکیان بڵێ "نە"! نەیدەزانی لەوانەیە تاوانبار خۆی بێت، خۆزگە هەر لەو سەرەتاوە یەکلایی بکردایەتەوە.

سادق پەیوەندی لەهەموو شتێک بڕیبوو، هیچ کەس هەواڵی نەدەزانی، مەنیجە ئەوەندەخەفەتو گرفتاری بوو کە نەکەوتە دوایو لەبیریکرد، تەنیا فاتمە بوو کە هەندێکجار بیری لێدەکردەوە، چونکە سادق ئەوی دەخستە بیری شەقایق، سادق پەنای بردبووە لای هاوڕێیەکی "جەواد" ئاگای لەخەمی گەورەی ئەو بوو ئەوەی بەخەیاڵی خۆی لەبیرو خەیاڵ ڕزگاری

بکات ئەو پێشنیازی کرد سادق دەستبداتە ماددەی بێهۆشکەر، بەباوەڕی جەوادو هەردوو بەدوو لەدەنگەدەنگی ژیان کاری خۆیان دەکرد، جەواد ژوورێکی بچوکی هەبوو، هەردوکیان لەوێ ئیشیان دەکرد، دەیانخوارد، دەخەوتن‌و هەندێکجار بۆ دورکەوتنەوە لەکێشەکان پەنایان دەبردە بەر دوکەڵی تلیاک.

"٣٧"

بەیانی کاتێک مەنوچەر دەڕۆیشت بۆ سەر ئیش، نیگای خەواڵوی شەقایق کەوتە سەر حەوشەکە، بارانێکی توند دەباری، شەقایق بەخەواڵوییی هەستاو چەترەکەی پەیداکرد، مەنوچەر لەچێشتخانەکە توندو خێرا نانی بەیانی دەخوارد، کاتێک شەقایقی بینی، بەشێوەیەکی بزێوە وتی:

- مەگەر ناچاری هەستی؟

شەقایق چەترەکەی بەرەو ئەو درێژ کردو وتی:

- باران دەبارێت، لەبیرت نەچێت چەتر لەگەڵ خۆتدا ببەیت!

مەنوچەر بێبایەخ وتی:

- نایەوێت دڵنیگەران بیت، بڕۆ بخەوە.

شەقایق هەر لەوێ چەترەکەی لەدیوارەکە داناو بەخەمباری لەچێشتخانەکە ڕۆیشتە دەرەوە، ڕەفتاری مەنوچەر هیچ نەگۆڕابوو، وەک ڕۆژانی سەرەتا بەدرەوشت بوو، شەقایق لەگەڵ خۆیدا وتی:

- یانی من ئەوەندە خراپەم کردوە، کە ئێستا خەریکم سزاکەی دەدەمەوە؟!

شەقایق خوی بەتەنیاییەوە گرتبوو، زۆرجار بەبەرزی لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد.

- چ بارانێکە، ناوەستێ، حەزدەکەم لەژێریدا ڕێبکەم.

لەپشت دەرگاکە وەستاو ئەبڵەقی حەوشەکە بوو، بێئامانج دەستی گرت بەدەسکی دەرگاکەوە، لەتەواوی بێ باوەڕیدا ئاگاداربوو، دەرگاکە کرایەوە، هەر بیریشی نەدەکردەوە کە مەنوچەر لەبیری چووبێت دەرگاکە دابخات، دەرگای ژوورەکەی کردەوەو لەژوورەکە ڕۆشتە دەرەوە، دونیا فێنک بوو، دەنگی ئاوەکە تەنیا دەنگێک بوو کە دەبیسترا، شەقایق بەپێخاوسی چووە حەوشەکە، جلەکەی ناسک بوو، زۆر زوو تەڕبوو، سوڕایەوەو پاشان بەرەو ژوورەکە ڕۆشت، بەڵام دەرگاکە داخرا بوو، دونیا ساتبەسات ساردتر دەبوو، ڕۆیشتو لەگۆشەیەکی هەیوانەکە دانیشت، جلەکانی تەڕبوو، لەسەرمادا دەلەرزی.

جارێکیتر هەستاو دەرگاکەی تاقیکردەوە، زۆر هەوڵیدا، بەڵام سودی نەبوو، بەترسەوە لەگەڵ خۆیدا وتی: مەنوچەر چی؟.. ئەگەر مەنوچەر لێرە بمبینێ بێگومان دەمکوژێ.

کات بەئارامی دەڕۆیشت، بارانەکە لەلێزمە دەباری، شەقایق بۆ ساتێک لەگەڵ خۆیدا بیریکردەوە، لەوانەیە ئەگەر هەوڵی بدایە دەیتوانی هەڵبێت، دەرگای ژوورەکە کرابووە، شتەکانی کۆ بکردایەتەوەو بڕۆشتایە، بەڵام ئێستا زۆر درەنگ بووە، دەڵێی لەبیری چووە ئێستا بەڕاستی ژنی مەنوچەرە، ئێستا ئەگەر ڕایبکردایە لەئیسلامدا خوێنی حەڵاڵ دەبوو، شەقایق چوار کاتژمێری تەواو لەهەیوانەکە لەرزی.

لەکۆتایدا مەنوچەر هاتەوە، سەرەتا بەبینینی ئەو لەهەیوانەکە وەستا.

- بۆچی لێرە دانیشتویی؟!

شەقایق ئارام ئارام هەستاو هێواش وتی:

- من خەریکبوم..

مەنوچەر قسەکانی بڕیو هاواریکرد:

- دەی دەتویست ڕابکەیت!.. بەڵێ؟

شەقایق بەترسەوە وتی:

- نەخێر، نەمدەویست ڕابکەم.

مەنوچەر بەتوڕەیی هێرشی بردە سەری، شەقایق هاواریکرد:

- بەخودا نەمدەویست ڕابکەم.

مەنوچەر پەلی گرتو بردییە ژوورەکەوە، تا شەقایق ویستی لەژوورەکە هەڵبێت، مەنوچەر مستێکی توندی لەپشتی دا لەکاتێکدا بەتوندی لێی دەدا هاواریکرد:

- ئەمەت دەوێ؟.. بێگومان دەبێت لێت بدەم!

شەقایق نەیدەتوانی لەژێر دەستی دەربچێت.

- بەخودا چوومە حەوشەکە پیاسەبکەم، دەرگا کرابووە.. من.. نەمدەویست هەڵبێم.

مەنوچەر ڕۆیشتە لایەکەوەو بەبێزارییەوە هاواریکرد:

- بڕۆ جلەکەت بگۆڕە!

ماوەیەکی خایاند، شەقایق لەژووری نوستن دانیشتبوو، لەشی بەتەواوی ئێشی دەکرد، ئەوە لەتەڕبون‌و چوار کاتژمێری وەستان لەسەرمادا، ئێستاش بەتەواوی لێدانی خواردوە، دەرگاکرایەوەو مەنوچەر هاتەژوورەوە، هێشتا توڕەبوو، بەڵام ئارامتر.

- ڕاستییەکەی بڵێ، دەتویست ڕابکەیت؟

شەقایق بەئاوازێکی منداڵانە وتی:

- نە، بەخودا نە! من تەنیا بینیم دەرگا کرایەوە، دەمویست لەحەوشەکەدا پیاسەیەک بکەم.

مەنوچەر هاواریکرد:

- تۆ، لەژێر بارانەکە چیت دەویست ها؟ نەتوت لەسەرماندا دەمریت؟

شەقایق تەنیا گریا، مەنوچەر بەتوڕەیی بەرەو لای ڕۆیشتو سەری بەرز کردەوە، دەموچاوی خوێناوی بوو، مەنوچەر سەری باداو بەهەمان ئاواز بەردەوامبوو:

- واپێت دەڵێم، ئەگەر نەخۆش بکەوی دەتکوژم!.. تێگەشتی؟.. دەتکوژم، نەیەی بەمن بڵێی نەخۆشم! من تاقەتی پەرستاریم نییە لەتۆ.. "پاشان بەئاوازێکی گونجاو وتی:" هەستە دەموچاوت بشۆ!

مەنوچەر لەژوورەکە دانیشتبوو سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد، تازە تەلەفزیۆنیان کڕیبوو، بەڵام شەقایق حەزی لەسەیرکردنی تەلەفزیۆن نەبوو.

شەقایق خوانەکەی هێنا، ویستی مەنجەڵی چێشتەکە بهێنێ، بەڵام کۆکەی لێهات، چاوی بەمەنوچەر کەوت، مۆنەی کردبوو سەری بادەدا، چێشتەکەی هێنا، حاڵی باش دیارنەبوو، بەڵام نەیدەویست خۆی وادەربخات لەبەردەم مەنوچەردا، تاقەتی بیستنی بۆڵەبۆڵی نەبوو، مەنوچەر وتی:

- وەرە بۆ ئێرە لای من دابنیشە بزانم.

شەقایق بەترسو لەرزەوە ڕۆیشت بۆ لایو مەنوچەر

دەستی خستە سەر ڕومەوتیو وتی:

- بەه، بەه، هێشتا کاتژمێرێک تینەپەڕیووە، تات هەیە.

شەقایق پێکەنینێکی شەیتانئامێزی خستەسەر لێویو وتی:

- نە، دەستەکانی تۆ گەرمە!

مەنوچەر وتی:

- ئێستا پێبکەنە.. نۆبەتی گریانیشت دێت ئەوکاتە من پێدەکەنم!

بەیانی شەقایق خۆی کرد بەخەوتوو تامەنوچەر ئاگاداری حاڵی خراپی نەبێت، تەواوی دوێنێ شەو لەتادا سوتابوو، بەڵام وەک ئەوەی مەنوچەر نەیزانیبوو، کاتێک مەنوچەر ڕۆیشت، هەستا ڕۆیشتە چێشتخانەکە، حەزی لەخواردن نەبوو، دەموچاوی بەئاوی سارد شوشتو پاشان پەرداخێک ئاوی خواردەوەو ڕۆیشت خەوت.

کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ کاتێک لەخەو هەستا، دەبێت بیری لەخواردنی شێوان بکردایەتەوە، بەسەختی هەستاو بەرەو چێشتخانەکە چوو، دەموچاوی ڕەنگپەڕیوی دەریدەخست کە نەخۆشە قورگو سەری ئێشی دەکرد، خۆ مەنوچەر کوێرنەبوو بێگومان دەیزانی نەخۆشکەوتوە، بیرێکی باش هات بەمێشکیدا سەرەتا شێوانەکەی دروست کردو پاشان ڕۆیشت بەرەو لای ئاوێنەکە.

مەنوچەر وەک هەمیشە لەکاتی دیاریکراودا هاتەوە، هەرکە چاوی بەشەقایق کەوت پێکەنیو وتی:

- لەپشت ئەم دەموچاوەوە، خودا دەزانێت چی ڕوخسارێکت شاردوەتەوە؟

شەقایق بەدەستەپاچەیی وتی:

- خۆ نەخۆش نیم!

مەنوچەر بەهەمان ئاواز:

- من کەی وتومە نەخۆشیت؟!

شەقایق لەقسە بێجێگەکەی خۆی تورەبوو، بۆ ئەوەی باسەکە بەردەوام نەبێت بەرەو چێشتخانەکە ڕۆیشت، خوانی شێوانی داخست، مەنوچەر چووە چێشتخانەکەوە، سەیرێکی خوانەکەی کردو بەرەو تەباخەکە ڕۆشت، سەری مەنجەڵەکەی لاداو کەمێکی لەچێشتەکە خوارد، بەدەنگێکی فەرماندەرانە وتی:

- باش شلە دروست دەکەیت؟

شەقایق وتی:

- تا ئەو شوێنەی من لەبیرم بێت تۆ هیچکات شلەو شۆربا ناخۆیت شەوان! ئێستا چی بووە حەز لەشلە دەکەیت؟!

مەنوچەر بەپێکەنینەوە وتی:

- ئەو کەسەی دەبێت حەز لەشلە بکات تۆی، نە من!

شەقایق خۆی بەسەرسام نیشانداو پرسی:

- بۆچی من؟!

مەنوچەر بەهەمان ئاواز بەردەوامبوو:

- هیچ، ئاخر من نەخۆشم، دەمەویست تۆ شلە بخۆیت!

مەنوچەر پەنجەی خستەسەر دەموچاوی‌و بەگاڵتەوە وتی:

- زۆر ڕوداری "لەبەردەمی لاچوو بەردەوامبوو" دەی ئەم چێشتە چی لێهات؟!

نیوەشەو مەنوچەر لەسەرمادا بەخەبەرهاتەوە، سەرەتا وایزانی بەتانییەکە بەسەرییەوە نەماوە، بەڵام لەناکاو زانی کە

شەقایق نییە لەسەر جێگەکەی، بەترسەوە لەجێگەکەی هەستا، دڵی والێی دەدا کە دەنگی لێدانەکەی دەبیست، لەژوورەکە هـاتـەدەرەوە، لەناکاو شەقایقی بینی کە لـەلای پەنجەرەکە خـەوی لێکەوتبوو، پەنجەرەکە کـرابـووەو بایەکی سـاردی لێوەدەهات، لەتورەیدا ویستی هاواربکات، لەمەبەستی شـەقایق تێنەگەیشتبوو، بەهێواشی ڕۆیشتە پێشەوەو دەستی خستەسـەر شانی شەقایقو جولاندی، شـەقایق بەچاوانێکی خەواڵووە سەیری دەموچاوی سورهەڵگەڕاوی مەنوچەری کرد، ئەوەندە حاڵی خراپبوو کە وایزانی خەو دەبینێت، هێواش بەئاوازێکی وەک چپە وتی:

- بەخەبەری! تۆش گەرمات بووە؟

مەنوچەر بەحاڵی ئەوی نەزانیو بەتورەیی هاواریکرد:

- هەستە بزانم، شێت!

شەقایق جـولاو لەپەنجەرەکە هاتەخوارەوە، تـازە هۆشی بەخۆیدا هاتبووەوە، بەڵێ حاڵی من..

مەنوچەر بەئاوازێکی تورە وتی:

- واتـزانـی وەک خـۆت کـەرم؟! لەپشت پەنجەرەکە چیت دەویست، ها؟

شەقایق خێرا وتی:

- من تەنیا..

مەنوچەر بێبایەخ بـەرەو لای ڕۆشـتو لەکاتێکدا بـەرەو دەرگای ژوورەکەی دەبرد وتی:

- زۆر باشە، بـڕۆ.. گـۆڕت ونبکە!.. دوای ساڵێک هێشتا لەبیری هەڵهاتنتدایت.. دەرگـای ژوورەکـە ئەڵێی چووبوو

بەقیندا، نەدەکرایەوە، مەنوچەر بەدەستێکی کلیلەکەی کردەوە، بەدەستەکەی تریشی شەقایقی گرتبوو، شەقایق دەگریاو دەیوت:

- توخوا بمبەخشە!

مەنوچەر دەرگای کردەوەو بەتوڕەیی بەرەو دەرەوە پاڵیناو وتی:

هەر لەوێ بمێنەرەوە، ئەگەر توانیت ڕابکە! دەمەوێت بزانم چۆن ڕادەکەیت..

شەقایق وتی:

- من نەمدەویست هەڵبێم.

کەچی مەنوچەر بێبایەخ دەرگاکەی داخست، شەقایق ماوەیەک گریا، بەڵام سودی نەبوو، مەنوچەر گڵۆپەکانی کوژاندەوەو نوست.

شەقایق لەپشتی دەرگاکە دانیشت، دەنگی گریانی تەنیا دەنگێک بوو کە بێدەنگی سەختی شەوی دەشکاند.

چەند خولەکێک زیاتری نەخایاندبوو کە دەرگاکە کرایەوە، مەنوچەر بەداماوی لەژوورەکە چوو لەبەرامبەریدا دانیشت لەهەیوانەکە، زنجیرە فرمێسکی لەرزۆک لەچاوە سەوزەکانی شەقایق درەوشایەوەو ئەهاتەخوارەوە بەسەر گۆنایدا، مەنوچەر دەستی خستە ژێر چەناگەی‌و بەئاوازێکی دڵسۆز وتی:

- ئاخر نیوەی شەو، لەپشت پەنجەرەکە چیت دەویست؟ ئەویش لەم سەرمادا.

شەقایق ڕوی وەرگێڕاو بەچەند وشەیەکی پچڕپچڕ وتی:

- گەرمام بوو، دەمەویست... دەمەویست کەمێک فێنک بمەوە.

مەنوچەر سەرێکی باداو وتی:

- ئاخر لەم هەوا ساردەدا گەرمات بوو؟! بزانم نەوەک..

مەنوچەر دەستی خستە سەر دەموچاوی شەقایقو بەتانەلێدانەوە وتی:

- بەه، بەه، لەکۆتایدا نەخۆش کەوتی، شایستەی! کچی شێت لەم هەوا ساردەدا چویتەتە بەر بارانو پیاسەتکردوە، مەگەر ئەرکبوو؟.. ئێستا.. ئێستا هەرچیت لێبێت شایستەی، ئێستاش لێرە دابنیشە تافێنک ببیتەوە.

مەنوچەر هەستاو هەرکە هەنگاوی بەرەو لای دەرگاکە نا دەنگی لەرزۆکی شەقایق لەشوێنی خۆیدا وەستاندی.

- من.. ئێستا سەرمامە.

مەنوچەر سەیرێکی بێتاقەتی کردو هێواش وتی:

- هەستە وەرە ژوورەوە!

بەیانی کاتێک مەنوچەر دەچووە سەرکار، شەقایق نوستبوو لەڕوخساری ڕەنگپەڕیویدا دیاربوو تەندروستی باش نییە، بەڵام مەنوچەر بەناچاری، خێرا لەماڵ دەرچوو تاخۆرئاوا کە مەنوچەر گەڕایەوە، شەقایق هەر نوستبوو، ئەو دەنگەدەنگەی لەچێشتخانەکەوە دەهات بەخەبەری هێنا، سەیری دەوروبەری خۆی کرد، گەروی وشکبوو زۆر حەزی لەئاو بوو، هەستاو بەرەو چێشتخانەکە ڕۆیشت، گۆناکانی لەبەر تا سورهەڵگەڕابوو، توشی سەرئێشە هاتبوو، لەشی قورس بوو، مەنوچەر لەچێشتخانەکە لای تەباخەکە وەستابوو، شەقایقی بینی بەنیگەرانییەوە پرسی؟

- چی بووە، بۆچی لەشوێنی خۆت هەستایت؟

شەقایق هێواش بەدەنگێکی لاواز وتی:

- تینوومە!

مەنوچەر پەرداخێک ئاوی دایە دەستی، شەقایق پەرداخە ئاوەکەی خواردەوە، مەنوچەر ئەوی هەر لەوێ، لەچێشتخانەکەدا، شەقایق بەهەمان ئاواز وتی:

- تۆ بۆچی نەڕۆشتیت بۆ ئیش؟

- لەئیش گەڕاومەتەوە!.. دەڵێی ئێستا لەخەو هەستاوی؟!

شەقایق وتی:

- مەگەر کاتژمێر چەندە؟!

- حەوتو نیو.

شەقایق سەیرێکی دەوروبەری کردو پرسی:

- دایکم لێرەیە؟

مەنوچەر بەسەرسامییەوە سەیری کرد، بەئارامی لەلایدا دانیشت، دەستی خستە سەر گۆنایو لەژێر لێوەوە وتی:

- وای، چی تایەکت هەیە!.. هەستە، هەستە بڕۆینەوە بۆ ژوورەکە.

شەقایقی لەجێگەکەیدا خەواندو ڕۆیشت قاپێک ئاوو دەستەسڕێکی هێنا، تاگەڕایەوە شەقایق خەوتبوو، مەنوچەر دڵی بەحاڵی دەسوتا، بەمجۆرە نەدەبوو، بێگومان دەبێت کارێکی بکردایە.

- شەقایق، شەقایق گیان!.. هەستە.

شەقایق چاوی کردەوەو مەنوچەری بینی، بەدەموچاوێکی نیگەران ئەبڵەقی بووە بەدەنگێکی گیراو بێحاڵ وتی:

- چییە، ڕۆژ بوەتەوە؟

مەنوچەر بزەیەکی کردو وتی:

- خەواڵو هەستە، چەند دەخەویت؟

پاشان قاپەکەی هێنایە پێشەوەو وتی:

- وەرە سەیرکە کەبابم بۆ دروستکردوی، تاباش ببیتەوە.

شەقایق کەمێک وەستاو بەپاڕانەوە وتی:

- مەنوچەر، ئەمجارە دەبێت نەیخۆم؟.. تەنیا ئەمجارە؟..

مەنوچەر ڕاستگۆیانە وتی:

- نەخێر، تازە بەدڵنیاییەوە دەبێت ئەمجارە بیخۆیت، زوبە!

مەنوچەر بەسەر پەنجەکانی قژی دەگرت، دڵی بەحاڵی دەسوتا، لەماوەی ئەم ساڵەدا ئەمە یەکەمجار بوو کە بەمیهرەبانی قسەی لەگەڵ شەقایقدا دەکرد، شەقایق دڵی بەنیگای نیگەرانی مەنوچەر خۆشبوو، دەڵێی دوبارە لەدایکبووە، ئێستا نیگای مەنوچەر وەک ئەو کاتانەیە..

مەنوچەر بەسەرسامییەوە:

- بۆچی بەمجۆرە سەیرم دەکەی؟!

شەقایق سەری خستە سەر سینگیو ئارام وتی:

- دڵم بۆ ئەم نیگایە تەنگبووە.

مەنوچەر بەبینینی نێرگس سەری سوڕماو بەخێرایی بەرەو لای ڕۆیشت، ماوەیەکی زۆربوو دایکی نەبینیبوو، زۆربەی کات لەتەلەفۆن قسەیان بەیەکەوە دەکرد نێرگسیش خۆشحاڵبوو.

- تەنیای؟.. شەقایق لەکوێیە؟!

مەنوچەر وتی:

- لەماڵە، ئێستا دەڕۆین بۆ لای.

نێرگس وتی:

- باشە.

مەنوچەر سەری کردەخوارو وتی:

- نە، نەخۆشە!

نێرگس سەیرێکی سەرسامی کردو وتی:

- بۆچی؟ چی لێهاتووە؟!

- نازانم، سەری گێژدەخوات، تای هەیە، لاوازە، نازانم، هیلاکە.

نێرگس زەردەخەنەیەکی خستەسەر لێوی‌و وتی:

- لەوانەیە سکی هەبێت!

پاشان پێکەنی‌و لەگەڵ خۆیدا وتی:

- بۆچی نە؟.. ئینشائەڵڵا هەر ئەمەیە!

کاتێک نێرگس‌و مەنوچەر گەیشتنە ماڵ، شەقایق لەژوورەکە دانیشتبوو، شەقایق بەبینینی نێرگس غافڵگیربوو، بەشێوەی گلەیی ڕوو لەمەنوچەر وتی:

- بۆچی نەتوت ئامۆژن دێت؟

نێرگس لەکاتێکدا ئەوی دەگرتەباوەش وتی:

- ئێستا چی جیاوازییەکی هەیە، گیانم، حاڵت باشە؟

کاتی ماچکردنی شەقایق، ئاگاداری گەرمی دەموچاوی ئەو بوو، بەنیگەرانی وتی:

- بۆچی دەموچاوت ئەوەندە گەرمە؟!

شەقایق وتی:

- شتێک نییە.

نێرگس قسەکانی بڕی‌و وتی:

- ئەمڕۆ دەبێت بڕۆین بۆ لای پزیشک!

مەنوچەر وتی:

- دوای چێشتی نیوەڕۆ دەڕۆین بۆ لای پزیشک.

لەتیمارگەکە، پزیشک دوای سەیرکردنی ورد هەندێ ڕاسپاردەی پێکردنو ڕێگەیدان کەوا بڕۆن، شەقایق هەستاو لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوە، نێرگس دودڵبوو، پزیشکەکە بەسەرسامییەوە تەماشای دەکرد، پرسی:

- شتێک بووە؟!

نێرگس نەیدەزانی چۆن قسەکەی بکات، پزیشکەکە بەنیگەرانی ئەوی زانی، بەمیهرەبانی وتی:

- نیگەران مەبە خانم!.. زۆر زوو باش دەبنەوە.

نێرگس قسەی پزیشکەکەی بڕیو وتی:

- ڕاستیەکی من وامزانی بوکەکەم سکپڕە!

پزیشکەکە لەسەر کورسییەکە جوڵاو وتی:

- بەڕێکەوت شتێک هەیە کە دەمەویست پێت بڵێم، ڕاستییەکەی بەبڕوای من بوکەکەتان زۆر لاوازە، من وادەزانم دەبێت ئێوە خۆشحاڵبن بەوەی کەسکپڕ نییە، بوکەکەتان لەکاتێکدا نییە کە بتوانێت سکی بپڕبێتو ئەگەر ئەمە بەردەوام بێت، بوکەکەتان سکی پڕنابێت.. کێشەکەش لەبەر لاوازی جەستەیە، بەڵام بەکۆنترۆڵو چاودێری ورد حاڵی بێگومان باش دەبێتو سکیشی پڕدەبێت.

قسەکانی پزیشکەکە وەک چەکوشێکی ئاسنین لەسەری نێرگسی دا، ڕازیبون بەم مەسەلەیە دژواربوو بۆی، بەشێوەیەکی توڕە لەژوورەکەی پزیشکەکە هاتەدەرەوە، شەقایقو مەنوچەر لەهۆڵەکە چاوەڕێی بون، هەرکە لەدەرگاکە هاتەدەرەوە،

شەقایق هەستا، مەنوچەر وتی:

- شتێک بوو کە..؟..

نێرگس بەتوڕەیی قسەکەی بڕیو وتی:

- نەخێر! بڕۆن ئیتر.

نێرگسو مەنوچەر لەژوورەکە دانیشتبون، شەقایقیش لەچێشتخانەکە سەرقاڵی ئیشەکانی بوو، مەنوچەر هەندێکجار تەماشای نێرگسی دەکرد، کە بەماتی ئەبڵەقی خاڵێکی نادیاربوو، ئارام چووە پێشەوەو هێواش بەنێرگسی وت:

- چی بووە؟.. بۆچی لەو کاتەوەی لەلای پزیشکەکە هاتوینەتەوە، تۆ ئەوەندە خەمباری؟ نەوەک پزیشکەکە شتێکی وتبێ؟ شەقایق حاڵی خراپە؟

نێرگس سەیرێکی توڕەی کردو وتی:

- مەترسە! شازادەکەت نامرێ.

مەنوچەر ئەوەندە سەری سوڕما لەڕستەلێدەرەکەی بەشێوەی ڕەخنەگرانە وتی:

- چی دەڵێی دایکە؟!

نێرگس بەدەنگێکی هێواش تەواوی قسەکانی پزیشکەکەی دوبارەکردەوەو وتی:

- بەڵێ، کاکەی بێ خەیاڵ! پزیشک وتی ژنەکەت مناڵی نابێت.

مەنوچەر بێبایەخ وتی:

- دایکە چی دەڵێی شەقایق خۆ بێگانە نییە تۆ هەر دەڵێی ژنەکەت، ژنەکەت! ئێستا خۆ شتێک..

نێرگس بەتوڕەییەوە:

- چیت لێهاتووە مەنوچەر، یانی گرنگ نییە بۆت؟

مەنوچەر ئەمجارە بەکینەوە ئەبلەقی بوو وتی:

- دەڵێی چی بکەم؟.. باشە شتێکە کە بووە! تازە ئەم پزیشکە خۆ پسپۆڕ نییە، قسەیەکی کردووە.

نێرگس لەتورەیدا سورهەڵگەڕا، نەیدەزانی چۆن مەبەستەکەی تێبگەیەنێ بەهەمان تورەیی وتی:

- ئەی کوڕ بۆچی تێناگەی چی دەڵێم؟.. پزیشک خۆ لەخۆیەوە نەبووە بەپزیشک بێگومان شتێکی زانیوە.

مەنوچەر بەتوڕەیی هاواریکرد:

- دەڵێی چی بکەم؟.. دوای ئەو هەموو قسە کە لەدوامەوە دەریانکرد کە فلان بێزاربوو ئارامی نەگرتو چی دەزانم فلانی ئاگرەکەی توندبوو، ئێستا بڕۆم تەلاقی بدەم؟!

بەبیستنی وشەی تەلاق، شەقایق لەناکاو لەرزی، نەیدەزانی دەبێت چی بکات، بڕیاریدا بێبایەخ کارەکانی بکات، بەلام دەستەکانی دەلەرزی، لەناکاو هۆشی بەخۆیدا هات وتی:

- من خەریکم بەدبەخت دەبم.. .

## بەشی حەوتەم

"٣٨"

مەنوچەر هەڵسوکەوتی لەجاران توندتر بوو، لەدوای ڕاوێژکردن لەگەڵ نێرگسدا، شەقایق وردەوردە بەبابەتەکەی زانی، نێرگس شتێکی پێوو تبوو! بەڵام شەقایق باوەڕی بەمەنوچەر هەبوو دڵنیابوو کە ڕازینابێت بەتەڵاقدانی، خەیاڵی ئاسودەبوو، بەڵام لەلایەکەوە دڵنیابوو کە نێرگس بەبێکار دانانیشێت، دەیناسی ژنێکی بەسیاسەت بوو، لەو ژنانەبوو کە بەقسە کارەکانیان دەکرد، بەوتەی پێشینان بەلۆکە سەردەبڕێت.

ماڵیان وەک سەربازخانەی لێهاتبوو، ئێواران کە مەنوچەر دەهاتەوە شێوانیان دەخواردو دوای سەیرکردنی تەلەفزیۆن گڵۆپەکان دەکوژانەوەو دەخەوتن، شەقایق بەراستی لەگەڵ هەموو شتێکدا ڕاهاتبوو، تەنانەت بەکەم قسەیی مەنوچەریش!.. هەرچەندە بێزاردەبوو، بەڵام بەبێدەنگی هاواریدەکرد، کاتێک تورەدەبوو دەیەویست زەوی‌و زەمان تێکەڵی یەک بکات هیچ کەس ڕێگری نەبوو.

تازە ئۆتۆمبیلیان کڕیبوو، شەقایق وابیری دەکردەوە کە لەروی وشیاری‌و فێڵبازییەوە لەنێرگس دەچێت‌و، لەروی ڕاستگۆیی‌و میهرەبانی زۆرتر لەمامە پەیرەوی دەکرد، ئەفسوس ئەو ڕۆژە شیرینانە کە دوبارەنەدەبونەوە، ئەگینا شەقایق دڵنیابوو بەباشترین ژیان دەگات، هەرچیبوو شانازی

بەمەنوچەرەوە دەکرد، لەوەی کە دەیبینی بەپێچەوانەی ئەو قسانەی لەفەرهادو کیومەرس دەیبیست بێدەستو قاچو دڵناسکو ترسنۆک نەبوو، هەستێکی خۆشی هەبوو، شەقایق سەیری ڕۆژمێرەکەی کردو بەدەنگێکی هێواش وتی:

ئێستا ساڵێکو یازدە مانگە لەم ماڵەدا زیندانیم، جگە لەئەو ڕۆژەی کە لەگەڵ ئامۆژنو مەنوچەر ڕۆیشتین بۆ لای پزیشک، ڕۆژانیتر هەمووی لەم ماڵەدا بووم، ئەوەندە سەیری دەرگاو دیوارەکانم کردوە بەچاوی داخراوەوە دەتوانم بڵێم چی لەکوێیە، مەنوچەر لەحەوشەکە خەریکی ئۆتۆمبیلەکەی بوو، خۆی بەسەر ئۆتۆمبیلەکەدا لارکردبووە، دیارنەبوو لەمەکینەکەیدا بەدوای چیدا دەگەڕێت، شەقایق پیاڵەیەک چای تێکردو بەبیانوی بردنی چاکە چووە حەوشەکە.

بایەکی فێنک دەهات، مەنوچەر چاوی بەشەقایق کەوت.

- کێ وتی بێیتە حەوشەکە؟

شەقایق هەر لەوێدا وەستا، سینییە چاکەی خستە سەر قادرمەکەو بەرەو ژوورەکە گەڕایەوە، مەنوچەر هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو دوبارە بەهەمان ئاواز وتی:

- باشە، دەتوانیت بێیت "شەقایق بەخۆشحاڵی ڕووی تێکرد" بەڵام بڕۆ جلێکی گەرم لەبەربکە!

شەقایق جارێکیتر بەرەو لای حەوشەکە هات، با قژی گرتبووەدەستو شێتانە دەیجولاند، شەقایق چاوی بەباخچەکە کەوت، لەناکاو کەوتە بیری حاجی ژن، ئەو هەمیشە عاشقی گوڵو باخچە بوو، لەبەرئەمە بوو هەرکەس لەدەرگاکە دەهاتە ژوورەوە لەبۆنی خۆشی گوڵەکان مەست دەبوو، لەبینینی

باخچەکە چێژی دەبرد، دوبارە سەیری باخچەکەی کرد، باخچە خاڵیەکەی خۆیانی لەگەڵ باخچە پڕگوڵو گیاکەی حاجی ژندا بەراوردکرد، ئەم دوانە وەک بیابانو گوڵستان بوو، لای باخچەکە هەندێک گڵی گوڵدان هەبوو، بڕیاریدا گڵی گوڵدانەکان بگۆڕێت، مەنوچەر بێجیاوازی سەرقاڵی کارەکەی بوو، نیو کاتژمێر ڕایبورد، لەناکاو بەو بێدەنگییەی بڕیاردەرە هۆشی هاتەوە بەخۆیداو بەرەو شەقایق سوڕا، وەکو منداڵە وردبینەکان سەرقاڵبوو، ئەوەندە بەگەرمی ئیشی دەکرد کە ئاگای لەمەنوچەر نەبوو، مەنوچەر دەستی لەکارەکە هەڵگرتو ڕۆیشت بۆ لای، شەقایق هەستی بەبونی کرد.

- چییە، ئەم گوڵدانە ناشرینانە زۆر سەرقاڵیان کردوی؟

شەقایق لای ئەو لەلێواری باخچەکە دانیشتو وتی:

- ئەم گوڵدانە ناشرینانە لەو پارچە ئاسنە باشترە!

مەنوچەر بەئاوازێکی گاڵتەجاڕی وتی:

- ئا، مەگەر تۆ لەم بوارەدا "سەیرێکی ئۆتۆمبیلەکەی کردو بەردەوامبوو" پسپۆڕی.

شەقایق بەبیستنی دەنگی شادی ئەو خۆشحاڵ بوو، بەدەنگی بەرز پێکەنی، مەنوچەر هێواش وتی:

- چییە کچێ، ئەمڕۆ زۆر خۆشحاڵی؟

- هەروا!

بۆ ساتێک بێدەنگی بووە بڕیاردەر، شەقایق هەر بێدەنگبوو سەیری خاڵێکی نادیاری دەکرد دوای ساتێک بێئەوەی سەیری ئەو بکات وتی:

- ئەم ئۆتۆمبیلە هینی کێیە؟

مەنوچەر وتی:

- ئۆتۆمبیلی خۆمە، کریم!

شەقایق بەئەبڵەقی سەیری دەکردو وتی:

- چۆن؟

مەنوچەر زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوی‌و وتی:

- باشە پارەم دا، کریم.

شەقایق بەئاوازێکی منالانەوە:

- نارەحەتم مەکە! بیلێ چۆن کریت، لەکوێ پارەکەت هێنا؟

مەنوچەر وتی:

- ئێمە خۆ خەرجیمان نییە، خۆمان دوو کەسین، تۆش خۆ خەرجیت نییە، منیش هەرچی لەدەرامەتم زۆر بوایە پاشەکەوتم دەکرد.

شەقایق وتی:

- دەزانی ئەگەر منداڵمان بوایە چی دەبوو؟

مەنوچەر ئەبڵەقی خاڵێک بوو وتی:

- دیارە ئیترا هەمووی دەبوە خەرجی دەرمان‌و پزیشکی ئەو.

شەقایق کەمێک وەستاو پاشان وتی:

- ئەگەر منداڵکمان بوایە، حەزدەکەی ناوی منداڵەکەمان بنەین چی؟

مەنوچەر ئەبڵەقی بوو بەپێکەنینەوە وتی:

- لەهەردوو کاتەکەدا "شەقایق"!

شەقایق بەسەرسامییەوە:

- یانی ئەگەر کوریش بوو ناوی دەنەیت شەقایق؟!

- بەڵێ، وابزانم ئەگەر کوڕیش بێت ناوی بنێم شەقایق، چونکە دەمەوێ هەر ئەم ناوە بانگ بکەم.

خەمێکی گەورە لەچاوی شەقایق دەرکەوت، دەنگی یەکسەر شێوەی ماتەمی گرتە خۆی، بەدەنگێکی لەرزۆک وتی:

- مەنوچەر! ئامۆژن ڕاست دەکات؟

- چی؟

- ئەوەی کەمن منالّم نابێت.

مەنوچەر جولا بەئاوازێکی تورە وتی:

- هەستە، دەمەوێ بەکارەکانم بگەم.

شەقایق خێرا وتی:

- توخوا! ڕاستیەکە، بلێ، ڕاستە؟

مەنوچەر هەستاو بەتورەییەوە:

- بڕۆ ژوورەوە، ئیتر نامەوێت لەحەوشە بیت، بڕۆ ژوورەوە!

شەقایق هەستا، دودڵبوو بۆ ڕۆیشتن، بەدەنگێک کە ترس تێیدا شەپۆلی دەدا جارێکیتر جورئەتی دایە خۆی تاپرسی:

- بۆچی نایڵێی؟

مەنوچەر بەتورەییەوە ڕوی تێکرد، شەقایق بەچەند وشەیەکی پچڕپچڕ وتی:

- من.. من

مەنوچەر بەتورەییەوە شانەکانی گرتو لەکاتێکدا ڕاست سەیری چاوی کرد، وتی:

- تۆ چی.. ؟.. ها؟.. بۆچی لاڵبویت؟

شەقایق هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو بەبێباکی وتی:

- دەزانم ئامۆژن چی دەوت، دەزانم پزیشکەکە پێی وتبوو

كە من منداڵم نابێت، دەزانم ئەو دەیەوێت.. دەیەوێت تۆ تەڵاقم بدەی.

مەنوچەر هەنگاوێکی بەرەو دواوە ناو وتی:

- ئەوەش دەزانی کە من چیم دەوێ.

شەقایق بەگریانەوە بـەرەو ژوورەکـە ڕایکرد، مەنوچەر تـوڕەبوو، گڕی تـوڕەیی لەبونیدا پـەرەی دەسـەنـد، دەستی خستبووە ناو قژیەوە، چاوی بەدار گێلاسەکە کەوت، بێئامانج چڵێکی درێژی لەدارەکە کـردەوەو بـەرەو ژوورەکـە ڕۆشت، زۆری نەخایاند هاواری شەقایق گەیشتە ئاسمان.

نێرگس هاتبوو بۆ کـەرەج، بەپێچەوانەی چاوەڕوانییەوە مەنوچەر زۆر خۆشحاڵبوو بەتەواوی قسەی لەگەڵ شەقایقدا دەکرد، پێدەکەنی، بەڵام شەقایق دڵنیابوو ئەمە نەخشەیە، ئەو نێرگس لەمەنوچەر باشتر دەناسی، بەیانی، دوای ڕۆیشتنی مەنوچەر، نێرگس تازە لەخەو هەستا، شەقایق بەمیهرەبانی ئەبڵەقی بوو وتی:

- ئامۆژن نانی بەیانی دەخۆی؟

نێرگس بزەیەکی تاکو خەمباری خستەسەر لێوی‌و وتی:

- ڕاستیەکەی.. من، هاتوم لەگەڵ تۆدا قسەبکەم.

شەقایق هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو وتی:

- دەزانم دەتەوێت چی بڵێیت.

نێرگس هەنگاوێکی بۆ پێشەوە ناو بەسەرسامی وتی:

- دەزانیت؟!

بەڵێ، دەزانم پزیشکەکە چی وت: دەزانم تۆش چیت دەوێت.

نێرگس ئاهێکی درێـژی هەڵکێشاو بێدەنگ بـوو، شەقایق

بێدەنگیەکەی شکاند وتی:

- بەڵام ئەوەی دەبێت بەتەلاقی من ڕازی بێت، من نیم، ئەوە مەنوچەر..

نێرگس خێرا وتی:

- یانی تۆ قسەیەکت نییە؟!

شەقایق سەری کردەخوار، بیری کردەوەو پاشان فەرماندەرانە وتی:

- نەخێر!

نێرگس بەبێدەسەلاتی وتی:

- من.. من نامەوێت نارەحەتت بکەم، بەڵام ئەگەر مەنوچەر ڕازیبێت ئامادەم پارێزگاریت لێبکەم، خۆم تەنیا، من خۆم مەنوچەر ڕازیدەکەم، "پاشان بەئاوازێکی کیناوی وتی:" بەخودا نامەوێ بەدبەختت بکەم، بەڵام مەگەر چەند منالّم هەیە؟.. مەنوچەر تەنیا منداڵی منە، حەزدەکەم تا زیندوم کوڕەزاکەم ببینم.. بەڵام "ئەمجارە بەلەخۆباییبونەوە وتی:" بەڵام دەزانم کە تۆش نارەزا نیت، باش دەزانم کە هێشتا..

شەقایق بەشێوەیەکی بزێو وتی:

- نە، ئامۆژن!.. بەو شێوەیە نییە کە بیری لێدەکەیتەوە من..

گریان نەیهێڵا ئەو قسەکەی بکات، بەخێرای بەرەو ژوورەکەی ڕۆیشت.

خۆرئاوا مەنوچەر بەخۆشحاڵی هاتەوە بۆ ماڵ، میوەو شیرینی کڕیبوو، بەڵام کاتێک هاتەماڵەوە، شەقایق لەماڵ نەبوو، نێرگسیش بەتەنیا لەژوورەکە دانیشتبوو، مەنوچەر وتی:

- ئا، بۆچی تەنیا دانیشتوی دایە؟.. شەقایق لەکوێیە؟

پاشـان بەدەنگێکی بـەرز بانگی کـرد، نێرگس هەستاو بەئاوازێکی فەرماندەرانە وتی:

- لەژوورەکەی خۆیەتی.

مەنوچەر سەرسامانە وتی:

- بۆچی لەوێ؟!

نێرگس لەکاتێکدا بەرەو چێشتخانەکە دەڕۆیشت وتی:

- وابڕیارە ئەمشەو لەگەڵ مندا بێت بۆ تاران!

مەنوچەر لای دەرگاکە وەستا، سەرسامانە پرسی:

- تاران بۆچی؟!

نێرگس ڕوی تێکردو بەلەخۆباییبونەوە سـەیری چـاوە سەرسامەکانی کردو وتی:

- بۆچی درۆت لەگەڵم کرد؟.. تۆ بەمنت وت شەقایق بەهیچ جۆرێک ناچێتە ژێر باری تەڵاقەوە، بەڵام ئەو ڕازییە، تەنیا لەبەر تۆ!

کیسە میوەکان لـەدەستـی مـەنـوچـەر کـەوتـە خـوارەوە، پرتەقاڵەکان بەسەر زەویدا دەسوڕانەوە، مەنوچەر پرسی:

- تۆ هەموو شتێکت پێوت؟

نێرگس وتی:

- خۆی هەموو شتێکی دەزانی، "پاشان سەیری دەرەوەی کردو بەدەنگێکی هێواش وتی:" چیتە مەنوچەر ها؟.. ئەم یارییە شەیتانانە چییە؟.. دوای ئەم هەموو ماوەیە، هێشتا وەک منداڵ بیردەکەیتەوە؟.. هێشتا بەدوای خەیاڵەکانتەوەی؟.. جگە لەوەی هەمیشە بەترس‌و لەرزەوە لەماڵ دەردەچیت، لەوە دەترسیت کە بگەڕێیتەوەو ئەو لەماڵ نەبێت، ئەمە ژیانە، تۆ دوای دوو

ساڵ هێشتا دەرگاکانی لێ قوفڵدەکەیت! ئەگەر بەڕاستی خۆشت ویستبا وات لێنەدەکرد، تۆ خۆشت ناوێت، تۆ لەبەرئەوەی پشتە ملەپێت نەڵێن فلان هەوەسبازبوو دوای دوو ساڵ ژنەکەی تەلاقدا، ڕازی نابێت، بەڵام گیانەکەم ئەم کچە نەنگی هەیە، ناتوانێت منالی ببێت، ناتوانێت!

مەنوچەر بەماتی گوێی لەقسەکانی نێرگس گرتبوو لەناکاو هاواریکرد:

- درۆیە، هەموو ئەم قسانە درۆیە، من هێشتا خۆشم دەوێت! هێشتاشا خۆشم دەوێت!.. بەڵام ئەو منی خۆش ناوێت، دایکە منی ناوێت.

نێرگس تورەبو، دەستی بەرز کردەوەو زلەیەکی توندی لێداو پاشان بەتورەیی وتی:

- باشە نیەوێت! مەگەر ئاسەوارە، کوڕەکەم! تۆ بۆچی ئەوەندە گێلی؟.. تۆ خەریکی لەبەر ئەو خۆت دەکەیتە قوربانی، بۆچی دەتەوێت بیتە قوربانی؟..

مەنوچەر بەتورەیی قسەکانی نێرگسی بڕیو وتی:

- دایکە بەداخەوەم!.. من وەک تۆ بیرناکەمەوە، ئەگەر بەبڕوای تۆ من خەریکم فیدادەبم، دەی بهێڵە بڵێم من ئامادەم فیدابم، بەڵام ژنەکەم تەلاق نادەم، من ئەوم خۆشدەوێت، دەمەوێت لەگەڵیدا بژیم، تەنانەت بەبێ منالیش.

نێرگس بەتورەییەوە چاویبڕییە چاوی مەنوچەرو وتی:

- زۆرباشە، دەی ئیتر هیچکات لانابینی، تۆ.. تۆ.. "لەکاتێکدا هاواریدەکرد وتی:" تۆ ئیتر کوڕی من نیت!

مەنوچەر هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، ساتێکی لەبێدەنگیدا

ڕابوارد، بەدەنگی داخرانی دەرگاکە هۆشی بەخۆیدا هاتەوە، شەقایق بەچاوی پڕفرمێسکەوە لەژوورەکە هاتەدەر، مەنوچەر بەتوڕەییەوە هاواریکرد:

- ونبە، لەژوورەکەت!

پاشان بەدوای نێرگسدا لەماڵ دەرچوو.

نیوەی شەو، شەقایق بەدەنگی کرانەوەی قفڵەکە چاویکردەوە، چـاوی بـەرومـەتـی هـیـلاکـو خـەواڵـوی مـەنـوچـەر کـەوت، بێدەنگیەکی کوشندە بڕیاردەربوو، مەنوچەر بێدەنگییەکەی شکاند، بەتوڕەیی وتی:

- تۆ بویت دایکمت پڕکرد، بەڵێ؟

شەقایق کەمێک وەستاو وتی:

- بەڵێ!

مەنوچەر بەکینەوە ئەبڵەقی بوو، چەند جار لەژوورەکە سوڕایەوەو پاشان بەئاوازێکی فەرماندەرانە وتی:

- بۆچی؟

شەقایق بەمینگە مینگ وتی:

- چونکە.. چونکە تۆ.. تۆ گێلی! دایکت ڕاستدەکات.

مەنوچەر بەرامبەری لەسەر ئەژنۆ دانیشت، پێکەنینێکی توڕەو درێژی دەستپێکردو وتی:

- بەڵێ، گێلم، چونکە وابیرمدەکردەوە لەبەر من تەلاقت دەوێت، بەلام تۆ، تۆی نارەسەنو پیس دوای دوو ساڵ هێشتا لەبیری ئەو کوڕە گێلەدای، ڕقم لێتە، ڕقم لەم چاوە ناپاکو هەوەسبازانەیە ڕقم لەتۆیە، ڕق، تێدەگەی؟

شەقایق بەبێ ئەوەی سەیری بکات بەئاوازێکی ڕاستی وتی:

- منیش ڕقم لەتۆیە.. چونکە..

شەقایق بێئامانج دەستی بەگریان کردو مەنوچەریش گریانی دەستپێکرد، دوای چەند ساتێک مەنوچەر بەدەم گریانەوە پێکەنیو وتی:

- دەتپەرستم شەقایق.. هەموو قسەکانم درۆ بوو.

شەقایق خەمبارانە ئەبڵەقی چاوە فرمێسکاویەکانی مەنوچەر بوو، مەنوچەر بەردەوامبوو:

- من بەبێ ئەم دوو چاوە دەمرم.

ژیان تازە شێوەی ئاسایی خۆی دۆزیبووە، تازە هەردوکیان خەریکبون ڕادەهاتن بەهەموو شتێک، بەڵام لەناکاو هەموو شتێک گۆڕا.

شەوبوو، مەنوچەر لەژوورەکە دانیشتبوو سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد، شەقایق قاپەکانی شوشتبوو دەیویست میوە بشواتەوە کاتێک لەدەرگا درا، سەری لەچێشتخانەکەوە دەرکرد، چاوی بەدەموچاوی سەرسامی مەنوچەر کەوت.

- یانی کێیە؟!

شەقایق شانی بەرزکردەوەو وتی:

- بڕۆ بزانە!

زۆری نەخایاند مەنوچەر گەڕایەوە.

- کێ بوو مەنوچەر؟

لەکوێی شەقایق!

دەنگی ئاشنای پەروێز شەقایقی خۆشحاڵکرد، بەخۆشحاڵی لەچێشتخانەکە هاتەدەرەوە.

- سڵاو هەواڵپرسییەکی درێژ لەنێوانیاندا کرا، شەقایق

هێواش وتی:

- کەواتە ئامۆژن لەکوێیە؟

پەروێز سەرێکی بەداخەوە سورڕداو وتی:

- چی بڵێم..

مەنوچەر قسەی هێنایە ناو قسەوە جڵەوی قسەکردنی گرتەدەست.

شەقایق جێگەی ئەو دوانەی لەهۆڵە داخستو خۆی بەرەو ژوورەکەی تر ڕۆیشت، مەنوچەر هێواش وتی:

- بۆچی دایکم نەهات؟.

پەروێز ئارامتر لەو وتی:

- تورەیە لێت.. .ڕاستییەکەت دەویێ دەڵێت نایەوێ بتبینێ.

مەنوچەر ئاهێکی درێژی هەڵکێشاو وتی:

- دایکم دەڵێت شەقایق تەلاق بدەم، چونکە منداڵی نابێت، دەڵێتو بەڵێ! مەگەر دەبێت؟

پەروێز وتی:

- من نازانم ، بەلام دایکت خەریکە دڵی دەوەستێ.

مەنوچەر سەری خستەسەر ئەژنۆیو بێدەنگبوو، پەروێز وتی:

- چۆنە سبەینێ بەیەکەوە بڕۆین بۆ تـاران؟.. دەتوانیت مۆڵەت وەربگریت؟

مەنوچەر سەری بەرزکردەوەو وتی:

- بەڵێ، دەتوانم.

بەیانی ڕۆژی دواتر هەردوکیان لەماڵ دەرچـون، شـەقایق بەڕۆیشتنی پەروێز دڵنیابوو کە بۆ تاران دەڕۆن.

کاتێک مەنوچەرو پەروێز چونەماڵەوە، نێرگس لەحەوشەکە بوو، خەریکی گسکدان بوو، سەری بەرزکردەوەو مەنوچەری بینی، بەتوڕەیی بەپەروێزی وت:

- مەگەر نەموتبوو چیتر نامەوێ ببینم؟!

مەنوچەر بزەیەکی کردو ئەبڵەقی پەروێز بوو، پەروێز بەهێماو نیشانە مەنوچەری تێگەیاند کە هێشتا توڕەییە، مەنوچەر بەهێواشی وتی:

- دایکە، سڵاوت لەبیرچوە، ها!

نێرگس بەتوڕەیی ئەبڵەقی بوو، وتی:

- چۆن ڕوتهات بێیت بۆ ئێرە؟.. چۆن توانیت دڵ لەشازادەکەت وەربگریتەوە، بێی بۆ بینینی دایکت؟.. خۆ من دایکتم، منێکت وێڵکرد کە لەگەڵتدا سوتام، لکای بەوەوە..

مەنوچەر هەنگاوێکی بۆ پێشەوە ناو بەئاوازێکی دڵسۆزانە وتی:

- دایکە من کەی تۆم وێڵکرد، مەگەر دەبێت لەبیرتبکەم؟

نێرگس بەگاڵتەوە وتی:

- باوکت نەهاتبایە، تۆ لەم دەوروبەرە دەرنەدەکەوتی.

مەنوچەر سەیرێکی بێتاوانەی کردو وتی:

- دایکە، بەخودا هەموو ڕۆژێک دڵم لێرەبوو، بەڵام دەترسام ڕێگریم لێ بکەیت خۆ تۆ ناتەوێت دڵم بشکێنی؟

نێرگس بەدەم فرمێسکڕشتنەوە وتی:

- مەگەر تۆ دڵت نەشکاند، مەگەر تۆ منت نەتۆراند؟

مەنوچەر هاتە پێشەوەو بەدڵسۆزی وتی:

- بەخودا، نە! خوا من بکوژێت، ئەگەر ویستبێتم دڵت

بڕەنجێنم، بەڵام دایکە کەمێک بیربکەرەوە، بیربکەرەوە چیت بەمن وت، ئەو قسەیەی دەیکەیت نابێت، من ناتوانم.

نێرگس قسەی بڕی‌و لەکاتێکدا بەرەو ڕوی دەچوەپێشەوە وتی:

- تۆ دەزانی من چی دەکێشم؟ یەکەمجار وتم 'باشە، شتێکە بووە، هیچ نییە، بەڵام هەموو ڕۆژێک ئەم دێت ئەو دەڕوات بەتانەو توانج پێم دەڵێن نێرگس بوکەکەت منالی نەبوو؟.. من چی بڵێم، بڵێم تاکە کوڕەکەم دەیەوێت تائەبەد لەگەڵ ژنەکەیدا بسوتێ!

مەنوچەر وتی:

- ئاخر من نەمدەتوانی.. یانی ئەگەر نەنگییە لەمن بوایە ئەوکاتە چی؟.. ئەوکات، تۆ چیت دەوت؟!

نێرگس وتی:

- ئەوکاتە مافم دەدایە شەقایق کە هەر بڕیارێک دەدات بیدات.

مەنوچەر بەداماوی وتی:

- دایکە.. بۆچی ئەم قسانە دەکەیت؟.. بۆچی ئازارم دەدەیت؟ ئاخر من چۆن تەنیا یادگاری ئامۆژن تەڵاقبدەم؟ ئامۆژن لەو دونیا دەستم لێهەڵناگرێت، چۆن وەڵامی بدەمەوە؟

نێرگس وتی:

- باشە، تەڵاقی مەدە.

مەنوچەر قاقا پێکەنی‌و وتی:

- ئەم هەموو باسە بۆ چییە؟ خۆ منیش هەر ئەمە دەڵێم!

نێرگس ڕاستەوخۆ سەیری چاوانی مەنوچەری کرد وتی:

- بڕۆ ژنێکی تر بهێنە! ژنێک بتوانێت منالّی ببێت، شەقایقیش تەلاق مەدە بالات بمێنێتەوە، بەمجۆرە خەڵکیش ناتوانن بڵێن ژنەکەی وێڵکردوە.

پێکەنین لەسەر لێوانی مەنوچەر وشکبویەوە، بەسەرسامی وتی؟

- بڕۆم چی بکەم؟

- بڕۆ ژن بهێنە؟ هەر ئەمە.

مەنوچەر تورەبوبوو، لەکاتێکدا لەحەوشەکە دەسوڕایەوە وتی:

- دایکە تۆ بۆچی تێناگەی، من ناتوانم، نامەوێ.

نێرگس وتی:

- ئەگەر بەو جۆرەی کە تۆ ئەوت خۆش دەوێت، ئەویش تۆی بۆی دەبێت ڕازی بێت! دەبێت لەبەر تۆ فیداکاری بکات، جگە لەمە ژنێکی خۆپەرستە، چونکە هێشتاش خەیاڵی لەشوێنی ترە.

مەنوچەر گەیشتەوە کەرەج، مێشکی پڕبوو لەقسەکانی نێرگس، دڵتەنگبوو، نەیدەزانی لەبەرامبەرو ویستەکانی دایکیدا چی بکات، ئەگەر ڕازینەدەبوو ئازاری دەدا، ئەگەر ڕازیش دەبوو دڵی شەقایق دەشکاند.

ئاە، خودایە شەقایق ئەو.. بەلاّم دایکم ڕاستی دەوت خۆ ئەو منی خۆش ناوێت، لەوانەیە خۆشیشی بوێم؟.. باتاقی بکەمەوە، بزانم چی دەڵێت، ئەگەر بڵێت ڕازیم، بەلاّم بەمەرجی تەلاق ئەو کاتە درا، هەموو قسەکانی درۆ بووە، چونکە هێشتا خەیاڵی سادق لەمێشکیدایە.. لەوانەیە دوای تەلاقیش دەڕوات بۆ لای

ئەو.. .بەڵام ئەگەر بڵێت باشە لەگەڵتدا ڕێک دەکەومو دەسوتێم ئەوکات منیش.. بەڕێبەی عەلی پەیوەندی لەدایکم دەبڕم، پەیوەندی لەهەموو شتێک دەبڕم.

لەوکاتـەوەی مەنوچەر هاتبووە، بەبێدەنگی لەبەردەمی تەلەفزیۆنەکە دانیشتبوو، شەقایق دەیزانی کە ئەو قسەی زۆری پێیە، دایزانی بڕیارە قسەی تازە ببیستێ، بەڵام مەنوچەر بێدەنگبوبوو، شەقایق لەگەڵ خۆیدا وتی:

- دەی بۆچی شتێک ناڵێت؟ خۆ من ئامۆژن دەناسم، بەبێ هۆ مامە پەروێزی نەناردوە بۆ ئێرە، بێگومان مەبەستو ئامانجی هەبوو، خودایە تاقەتم نەما، دەی بۆچی نایڵێت؟ نە، بەمجۆرە نابێت، دەبێت خۆم دەست پێبکەم، دەبێت خۆم داوای لێبکەم بیڵێت، لەوانەیە لەروی نەیەت.

شەقایق بەسینیە چـاوە ڕۆشـتـە ژوورەکــەوە، لەکاتێکدا دادەنیشت وتی:

- مامە پەروێزت گەیاندە تاران؟

مەنوچەر هۆشی لای خۆی نەبوو، بەدەستەپاچەیی وتی:

- چیت وت؟.. گوێم لێنەبوو!

شەقایق بەدڵنیایی وتی:

- دەڵێم مامە پەروێزت گەیاندەوە تاران؟

مەنوچەر سەری کردەخوارو وتی:

- بەڵێ!

شەقایق هێواشتر لەو پرسی؟

- ئامۆژن چی دەوت؟

مەنوچەر سەیرێکی کردو بەگاڵتەوە وتی:

- وەنەوزو ورێنە.

شەقایق وتی:

- مەنوچەر مەیخەرە پشتگوێ، چی وت؟

مەنوچەر ئاهێکی درێژی هەڵکێشاو وتی:

- دەڵێت تەڵاقت بدەم.. کەمێک وەستاو بەپەلە بەردەوامبوو: بەڵام من تەڵاقت نادەم من..

شەقایق بەپێکەنینەوە وتی:

- تەنیا ئەمە.. ؟

مەنوچەر بەچەند وشەیەکی پچڕپچڕ وتی:

- دەیەوێت.. دەیەوێت بڕۆم، بڕۆم ژن بهێنم.

تورەیی تەواوی بونی شەقایقی گرتەبەر، بەڵام ساتێک دوای ئەوە کاتی هەستان بەدەنگێکی فەرماندەرانە وتی:

- باشە برۆ ژن بهێنە، بەڵام..

مەنوچەر سەیرێکی پرسیاراوی دەموچاوی کرد شەقایق بەهەمان ئاواز بەردەوامبوو:

- بەڵام دەبێت، تەڵاقم بدەیت!

مەنوچەر پێکەنینێکی گاڵتەجاڕی خستەسەر لێویو وتی:

- دەمزانی ئەمە دەڵێیت.

شەقایق لەتورەیدا سورهەڵگەڕاو بێخواست بانگی کرد:

- واتزانی پێت دەڵێم لەبەر تۆ ئامادەم ڕازی بم هەوێ؟ ئەها، بەهەڵەتێگەشتی کاکی خۆپەرست! بهێڵە شتێکت پێ بڵێم، ڕێزی نێوان منوتۆ لەزوەوە شکاوە، من ئیتر نامەوێ لەگەڵتدا بژیم ئیتر لەم چاوشارکێیە هیلاکبوم، شەوێک لەیلو مەجنونین،

شەوێک چەقۆو پەنیر، شەوێکیش زیندانیو پاسەوان! نە، چیتر من نیم، تاقەتی ئەم ژیانەم نییە "لەکاتێکدا دەگریا بەگاڵتەوە بەردەوامبوو:"

- ژیان، ها، ژیان وشەیەکی چەند نامۆیە منو تۆ ناژین، تەنیا خەریکین شانۆی ژنو مێردەکان پیشان دەدەین.

مەنوچەر بەشێوەیەکی تورە وتی:

- باش قسە دەکەیت!

شەقایق بەتورەیی ئەبڵەقی بوو، هاواریکرد:

- ئەگەر دەتەوێت بمکوژیت، بمکوژە، ئیتر لەهەرەشەکانو بێ کاتەکانت هیلاک بوم، من.. من ئیتر شتێکم نییە بۆ دۆڕان، بەڵام ئەمە بزانە ئامادە نیم لەبەر تۆ.. ڕازی بم.

مەنوچەر هەستا، بەرامبەری وەستا بەخوێنساردییەوە ئەبڵەقی ڕومەتی سەرهەڵگەڕاوی شەقایق بوو، ئینجا فەرماندەرانە وتی:

- زۆرباشە، قسەکانی خۆت کرد، ئێستا باش گرێکانت بکەرەوە! جارێک دەیڵێم ئیتر دوبارەشی ناکەمەوە من ژن دەهێنم بەبێ ئەوەی تۆ تەلاق بدەم، "پاشان بەگاڵتەوە وتی:" ئەگەر تۆ دڵت بەقیژەو هەراوهوریا بەستووە من بەزۆر واتلێدەکەم خۆت بدەیت بەدەستەوە.

شەقایق ویستی قسەیەک بکات، بەڵام مەنوچەر نەیهێشتو بەهەمان ئاواز بەردەوامبوو:

- پێشتر دەمویست واز لەهەموو کەس بهێنمو پتەوو بەتین بەتووە بلکێم، بەڵام ئێستا دەیبینی هۆیەک نییە بەمکارە تۆ دەهێڵمەوە.

شەقایق بەداماوی هاواریکرد:

- بۆچی نایەڵیت من بڕۆم بەدوای ژیانی خۆمدا؟.. من نازانم سور بونی تۆ بۆ چییە؟.. تۆ دەتوانیت، تۆ دەتوانیت ئاسودە لای ژنەکەت بژیت، بۆچی دەتەوێت بمهێڵیتەوە؟

مەنوچەر ئەبڵەقی چاوانی بوو، دەستی لەسەر گۆنای داناو بەگاڵتەجاڕییەوە:

- من بەبێ ئەم چاوانە دەمرم.

شەقایق بەتوڕەیی دەستی ئەوی خستە لاوەو بەلایدا تێپەڕی.

شەقایق لەلای پەنجەرەکە دانیشتبوو سەیری مانگی دەکرد، شنەبایەکی فێنک لەدرزی پەنجەرەکە دەهاتەژوورەوەو لەگەڵ خۆیدا بۆنی خۆشی گوڵە یاسەمینەکانی دەهێنایەژوورەوە، مانگەشەوێکی زێڕین لەنیگای سەوزی شەقایقدا قەتیسبوو، بەڵام خۆی دیلی خەیاڵاتێک، دڵی دۆڕاندبوو بەشەو، لەگەڵ خۆیدا دەیوت:

کاتێک لەمەنوچەر جیابومەوە دەستبەجێ دەچم بۆ تاران بۆ لای پورم، دەزانم، باش دەزانم کە سادق لای پورم نییە، بست بەبستی شار دەگەڕێم تابیدۆزمەوە، دڵم پێم دەڵێت هێشتا چاوەڕێی منە.. هێشتا ژنی نەهێناوە، باش دەزانم کە سادق وەک ناوەکەی ڕاستگۆبوو، درۆی لەگەڵم نەدەکرد، کاتێک دەیوت وەفاداردەبێت لەگەڵمدا فشەی نەدەکرد، ڕاستی دەوت ، ئیتر ڕۆژانی دانیشتن تەواوبوو، ئێستا لەدەستی ئەم دێوە بێویژدانە ڕزگارم دەبێت، ڕاستیان وتوە کە شتێ نوێ هاتە بازاڕ، شتی کۆن دڵی ئازار دەدرێ، منیش وەک دەستەسڕێکی

پیس دەخـەنـەدورەوە، بـەڵام شتێک نییە، دڵم گەرمە، هیوام دوبارە زیندوییووە، هەموو شتێک بەزویی باش دەبێت.

هەموو خێزانەکە بەمەسەلەکەیان زانیبوو، ئەوەندە بازاڕی پڕوپاگەندە گەرمبوو کە لەکۆتایدا نێرگس، بەڕازیبونی مەنوچەر، دەستبەکاربوو، پەروێز ڕازینەبوو، بەردەوام بەنێرگسی دەوت دوایی پەشیماندەبیتەوە، بەڵام نێرگس گوێی لەم قسانەنەدەگرت، بەتایبەتی ئەوەی کە بڕیاریدابوو، ئەمجارە زەماوەندێکی گەورە بۆ مەنوچەر بسازێنێت، دەیویست هەموو ئارەزوەکانی ڕەنگی ئیشپێکردن بگرنەخۆیان.

ئێستا دوو مانگ لەبەسەرهاتی شەڕی مەنوچەرو شەقایق تێپەڕبوو، ماڵەکە شێوەیەکی ساردی گرتبووە خۆی، شەقایق بێهەواڵ لەهەموو شوێنێک وایدەزانی ژیان هەر بەشێوەیەیی خۆی تێپەڕدەبێت، تاوەکو نێرگس دەرکەوت.

بەڵام مەنوچەر، ئاگاداری بابەتەکە بوو، دەیزانی دایکی لەم ماوەیەدا بۆ داواکاری ژن ڕۆیشتووە بۆ زۆر شوێن، چاوەڕێی وەڵامبوو، لەناخی دڵەوە ڕازینەبوو، بەڵام کاتێک ڕەفتاری ساردی شەقایقی دەبینی، بێبایەخ لەگەڵ خۆیدا دەیوت:

- مافی خۆمە، ئەو دوو ساڵەش بێخود لەگەڵ شەقایقدا مامەوە، بەڵام ئێستا نەخشەی باشم هەیە بۆی.

شەقایق وایدەزانی نێرگس بۆ ئاشتی هاتووە، ئاخر گوڵو شیرینی هێنابوو، پێدەکەنیو دەبوە قوربانی شەقایق.

- تۆ خانمی! یاخوا دایکە لەژیان خێر ببینێت، دڵی منت نەشکاندو لەم کۆتایی تەمەنەدا شادتکردم.

شەقایق بەسەرسامییەوە وتی:

- ئامۆژن، مەگەر من چیم بۆ کردوی، تۆ خۆت باشی.. ؟!

نێرگس بەخۆشحاڵییەوە:

- ڕاستییەکەی بیری نەدەکردەوە ڕازی بێت، بەڵام پەرویز ڕاستی دەکرد من هێشتا تۆم نەناسیوە، تۆ دڵێکی میهرەبانت هەیە، وەکو خوالێخۆشبوی دایکت، مونیرەش زۆر بەڕێزو گەورەبوو، ڕاستییەکەی جەمیلەخانی دراوسێمان کچێکی پێناساندین، منو ژنی مامەئیسماعیل ڕۆیشتین بینیمان، کچێکی باشە! بڕوام وایە مەنوچەر پەسەندی بکات، کچی بێچارە بەختێکی خراپی هێناوە، منداڵی نەبووە، کەسی ژیانیش نەبووە، بەڵام کچەکە، مانگ! دەیوت ئامادەبووم لەگەڵ ئەم نەنگییەشیدا ژیان بەرمەسەرو ژیانم بپارێزم، بەڵام مێردەکەی باش نەبوو دەکەوتە دوای هاوڕێ..

شەقایق تازە لەمەبەستەکەی نێرگسی زانی، لەکاتێکدا هەڵدەستا وتی:

- ئامۆژن من بەمەنوچەرم وت، ڕازیم بەڵام دەبێت، دەبێت من تەڵاق بدات ئەگینا..

مەنوچەر لەحەوشەکە دانیشتبوو، حەزی نەدەکرد لەژوورەکە بێت کاتێک دایکی بەسەرهاتەکە بەشەقایق دەڵێت، لەنیگای شەقایق دەترسا، لەناکاو دەنگەدەنگ بەرزبووە، بەترسەوە بەرەو ژوورەکە ڕۆیشت.

شەقایق وتی:

- من ناتوانم ئامۆژن، بۆچی هیچ کەس تێناگات، ئەمە زوڵمە مەگەر من چی گوناهێکم کردوە کە سەرەتای تەمەنم بکەومە ژێر دەستی هەوێ، ئامۆژن من قسەیەکم نییە، دەڵێم مافی

مەنوچەرە!.. ئاخر ئەو گەنجە، حەیفە دەبێت پشتی هەبێت منی بۆ چییە ئامۆژن دەبێت من تەلاق بدات..

نێرگس وتی:

- مەگەر خراپە کە دەیەوێت بتهێڵێتەوە، ئاخر تۆ کێت هەیە؟ واتزانی تەلاقت وەرگرت ژیانت ئاوەدان دەبێت؟.. دەڕۆیتە ژێر دەستی ئامۆژنەکان! ناتبەن کە بژیت دەبێت ببیتە خزمەتکاریان.

شەقایق قسەکانی نێرگسی بڕیو وتی:

- دەمەوێت ئەم ژیانە نەبێت! دەمەوێت ئەم ژیانە وێران بێت، من دەمەوێت خزمەتکاری ئامۆژنەکان بکەم، بەلام ناتوانم ئـامـۆژن، ناتوانم لەژێر دەستی هەوێدا بمێنمەوە، "شەقایق بەچاوی فرمێسکاوییەوە ڕویکردە مەنوچەر، بەلام زۆر زوو چاوی لەسەر لابرد بەئاوازێکی فەرماندەرانە بەردەوام بوو" من ئیتر نامەوێت لەم خانووە ژیان..

مەنوچەر نەیهێشت قسەکەی بگاتە کۆتایی، هاتەپێشەوە چەند زلەیەکی توندی لێداو، پاشان لەکاتێکدا قژی ئەوی لەدەستیدا دەسوڕاند هاواریکرد:

- سەرکێشی بێ هەست! خۆ من دەزانم! خۆ من دەزانم لەخەیاڵتدا چی تێپەڕدەبێت، بەلام هەڵە تێگەشتوی.. مەگەر خەوەکەی ببینیت.

نێرگس لەپشتەوە وەستابوو، لەژێر لێوەوە پێدەکەنیو لەگەڵ خۆیدا وتی:

- کچێکی چەند ملهوڕە، من بڵێ وامزانی سوپاسمان دەکات، بەڵێ خانم دڵی لەشوێنێکی ترە.. ڕاستدەکات مەنوچەر، ئەم لەبەر هەوێ واناکات، هێشتا سەری بەدوای ئەو کوڕەوەیە.

نێرگس لەکەرەج مابووە، دەیویست سەرەتا ئیشەکان بکات، ژوورەکانی چۆڵکردبوو، هەموو شتەکانی بردبووە ژوورەکانی ئەوبەری حەوشەکە، وابڕیاربوو ژنەکەی مەنوچەر پێداویستی ناوماڵ بهێنێت، ژنە تازەکەی مەنوچەر هەموو شتێکی لەبارەی شەقایقەوە دەزانی، ڕازیبوو لەگەڵ شەقایقدا ڕێکبکەوێت.

رومـەتو لەشی شەقایق پارچەیەک شین، مەنوچەر وەک تاوانبار ئـەوی لەژوورەکانی ئەوبەری حەوشەکە، زیندانی کردبوو، نێرگس بەتەنیا ڕۆیشتەوە بۆ تاران، بڕیاربوو ڕۆژی دواتر مەنوچەر بۆ داواکاری بەرەو تاران بچێت، لەبەرخۆیەوە بیریدەکردەوە:

- ئەمە لەوانەیە دوا شەو بێ لای شەقایق دەمێنمەوە دوای ئەمە دەبێت لەگەڵ یەکێکی تردا سەر بخەمە زەوی.

چاوی بەشەقایق کەوت، تەنیاو خەمبار لەگۆشەی ژوورەکەدا بەکزی دانیشتبوو، مەنوچەر لەخۆباییانە چاکەتەکەی خستە بەردەمیو بەدەنگێکی پڕ لەتوندی وتی:

- چاکەتەکەم بدورەوە! سبەینێ بەم چاکەتەوە دەڕۆم بۆ داوای ژن.

شەقایق بەدەستێکی لەرزۆک چاکەتەکەی لەپێش قاچی لابرد، ویستی بڕوات بۆ ژوورەکەیتر،، دەنگی مەنوچەر وەستاندی.

هەر لـەوێ دابنیشە! "پاشان بەگاڵتەکردنەوە وتـی:" لەمە بەدواوە منەتی تۆش ناکێشم، ژنەکەم هەموو شتێکم بۆ دەکات، باوەڕناکەم ئیتر ڕێگەم بکەوێتە ئێرە، بەڕاستی دەتخەمە لاوە..

قسەکانی مەنوچەر وەک خەنجەرێک بەلەشی بریندارى شەقایقدا دەڕۆشتنەخوارەوە، کاتی دورینی قۆپچەکە لەناکاو

دەنگی مونیرە لەمێشکیدا دەنگی دایەوە.

دایکەگیان! ئێستاکە دڵتداوە بەسادق، دەمەوێت شتێکت بۆ ڕونبکەمەوە، لەوانەیە سادق ئێستا بەڕاستی عاشقت بێت، بەڵام سبەینێ هیچ دیارنییە، بەڵام.. بەڵام مەنوچەر لەناخی دڵەوە تۆی دەوێت، دەبێت هەمیشە لەو دڵنیابیت، بێخود مەبە دیلی دڵت، باش بیربکەرەوە! دڵت بدەرە دەست عەقڵت.. ئەو دەزانێ چی باشەو چی خراپ.

بەڵام دوبارە دەڵێم قسەی کۆتایی قسەی خۆتە، ئەمە تۆی کە دەبێت تەمەنێک بژیت.. نەمن!

دەنگی ئەستوری مەنوچەر زنجیرەی خەیاڵەکانی جیاکردەوە.

– هۆشت لەکوێیە؟ بۆچی بەدەزوو سپی دەیدوریتەوە؟

هەفتەیەک لەڕۆیشتنی مەنوچەر بۆ تاران تێپەڕبوو، شەقایق وەک دەست لێوەشێنراوەکان ئەبڵەقی گۆشەیەک دەبوو، ئیتر تەنانەت لەگەڵ خۆشیدا قسەی نەدەکرد، خەمبارتر لەجاران چاوی لەئایندەی ڕەشی خۆی بوو، هەموو خەیاڵەکانی کەوتبونە سەر ئاو، مەنوچەر لەخۆیەوە نەیدەوت، لەو کاتەوەی کە باسی تەڵاق هاتوەتە پێشەوە، ئەو دڵی لای سادقە، ئێستاکە باش بیری دەکردەوە دەیبینی لەم دوو ساڵەدا هیچ پەیوەندیەکی بەمەنوچەرەوە نەبووە، تەنیا لەبەر تەنیاییەکەی پەنای دەبرد بۆی.

لەکۆتایدا ڕۆژی هەشتەم مەنوچەر هاتەوە، سەیرکردنی ساردو بێ ڕوناکی بوو، شەقایق ئیتر حەزی نەدەکرد بیبینێت، بەڵام حەزیدەکرد بزانێت لەماوەی ئەم هەفتەیەدا چی بووە.

مەنوچەر دەرگای ژوورەکەی ئەوی کردەوەو هاتەژوورەوە،

ئەو ڕووناکیەی کە لەدەرەوە هاتبووەژوورەوە تەنیا ڕۆشنایی بوو، شەقایق پشت لەو ڕوو لەپەنجەرەکە دانیشتبوو، دەنگی گیراوی مەنوچەر ئارامی ژوورەکەی تێکدا.

من سبەینێ دوبارە دەڕۆم بۆ تاران، وابڕیارە زەماوەندەکەم ئەم هەفتەیە بکرێت، "کەمێک وەستاو پاشان بەدەنگێکی وەک چپە وتی:" ناوی عەهدیەیە! دەمەوێ کاتێک هات بۆ ئێرە باش ڕەفتاری لەگەڵدا بکەیت.

شەقایق هەستا بەرەو کۆمەدەکەی ڕۆیشت، پاکەتی ئاڵتونەکانی بەتوڕەیی کێشایەدەرەوەو خستییە بەردەمی مەنوچەر، وەک مەنوچەر ئەمیش بەدەنگێکی فەرماندەرانە وتی:

- وەرە.. وەرە! بیگرە بیدە بەژنەکەت،"پاشان ڕاستەوخۆ تەماشای چاوانی مەنوچەری کردو وتی" هیچکات وامەزانە ئیرەیی بەژن هێنانەکەت دەبەم، چونکە کاتێک بیردەکەمەوە سەیردەکەم هیچ پەیوەندیەکم بەتۆوە نییە تاکارەکانت گرنگ بن بۆم، بڕۆ هەر هەڵەیەک دەتەوێ بیکە، بەڵام.. " بێدەنگییەکی قورس ژوورەکەی پڕکرد، ئەمجارە بەدەنگێکی لەرزۆک بەردەوام بوو"، بەڵام هیچکات ناتبەخشم.. هیچکات!

مەنوچەر بەبێ ئەوەی پاکەتەکە ببات، ژوورەکەی جێهێشت، بەدوایدا دەنگی پێوەدانی دەرگای حەوشەکە هات.

زەماوەندەکەی مەنوچەر کرا، نێرگس‌و خوشکەکانی پێشتر هاتبون بۆ کەرەج‌و شتومەکی عەهدیەیان لەژوورەکاندا ڕێکخست، شەقایق لەپشت پەنجەرەکە سەیری حەوشەکەی دەکرد، ئیتر فرمێسکیشی نەدەڕشت، بەچاوانی خۆی دەیبینی کە سێبەری شومی بەدبەختی چۆن ژیانی وێران دەکات،

ئاسمانی ژیانی لەهەمیشە تاریکترو خەمبارتربووە، دەنگی گریانی شەقایق لەنێوان هەڵهەڵەو هەڵپەرکێی هاوڕێیانی بوکو زاوا وندەبوو، ئەو لەبەر ڕوناکیو شادیدا دەدرەوشایەوەو ئەمبەر لەخەرمانی تاریکیو لەڕەشیو نائومێدیدا نوقمبوبوو، ئەوێ ڕۆژ بوو ئێرە شەو..

ژیـان ئاسایی بـووە، عەهدییە خۆشحاڵبوو بەئومێدەوە چاوبڕیبووە ژیانـە تـازەکـەی، هێشتا هـاوسـەری یەکەمی مـەنـوچـەری نەبینیبوو، بـەڵام حـەزیـدەکـرد هـەرچـی زوتـرە ببینێتو دەیویست بەراوردی بکات لەگەڵ خۆیدا، بەڵام بەژنێکی حەسودو خراپ دەهاتە پێشچاوی، نێرگس، دایکی مێردەکەی، پێیوتبوو کە شەقایق ڕازییە مەنوچەر ژن بهێنێت، بەڵام ئەگەر ڕازیبووە بۆچی لەهیچ مەراسیمێکدا بەشداری نەکردوە.

بەیانی پێش ڕۆیشتن مەنوچەر بەعەهدیەی وت:

- دەمەوێت بڵێم بابێت بۆ بینینت، خۆ ناڕەحەت نابیت؟

عەهدیە هەستاو لەکاتێکدا چاکەتەکەی مەنوچەری دەدایە دەستی وتی:

- نە! بەڕێکەوت زۆر حەزم دەکەم بیبینم، "پاشان بەگاڵتەوە وتی" حەیف کە شانازیان پێ نەدایت تا لەمەڕاسیمی زەماوەندا بەشداری بکات.

مەنوچەر زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- کەواتە پێی دەڵێم ئەمڕۆ نیوەڕۆکەی بێت بۆ ئێرە..

هـەرچـەنـد عەهدیە شەقایقی نەبینیبوو، بـەڵام شـەقایق لەماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا هەموو ڕۆژێک عەهدیە دەبینێ کاتی ڕەوانەکردنی مەنوچەر، دەموچاوی خۆشەویست بوو،

کورتەبالاو کەمێک قەڵەوبوو، شەقایق لەبەرخۆیەوە وتی:

- کاتێک یەکەم منالی دەبێت، بێگومان لەمە قەڵەوتریش دەبێت.

لەکۆتایدا چاوەڕوانی عەهدیە تەواوبوو، هەوڵیدا خۆی بەکارێکەوە سەرقاڵبکات، شەقایق چۆن بێت لەگەڵیدا، بەڵام کەمێک بیریدەکردەوە دەیبینی عەهدیە هیچ تاوانبار نییە.

عەهدیە بەبینینی شەقایق ئەوەندە سەرسامبوو کە تەنانەت شەقایقیش هەستی بەسەرسامییەکەی کرد، تەنانەت عەهدیەش لەدڵەوە جوانی ئەوی دەبینی، ئەو چاوە سەوزو بادەمییانە لەگەڵ برژانگی درێژوگەڕاوە، چەند دڵگیروجوان بوو، دەموچاوی شەقایق بەشێوەیەک جوانبوو کە عەهدیە ساتێک لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە:

- منیش ئەگەر لەجێگەی مەنوچەر بوایەم ئەم ژنەم وێڵنەدەکرد.

شەقایق بێدەنگییەکەی شکاند:

- من هیچکات لەبەر شێوەی ڕوخسارم لەخۆبایی نەبووم، بەڵام ئەگەر لەخۆبایی بومایە لەوانەیە ئێستا ژیانێکی باشترم هەبوایە.

عەهدیە خۆی کۆکردەوەو بەتانەوە وتی:

- جوانیش سەردەمێکی هەیە! بەڵام بمبەخشە بەو شێوەیەی من تێگەیشتوم تۆ کێشەی ترت هەیە.

شەقایق بەقسە بێ شەرمەکانی عەهدیە ڕاچڵەکی، عەهدیە بێخواست بەردەوامبوو:

- وابزانم بۆ هەردوکمان باشترە کە دەست وەر نەدەینە ئیشوکاری یەکترەوە، دڵنیام مەنوچەریش بەلەدایکبونی منداڵی من بەڕاستی دەست لەتۆ دەکێشێتەوە!

پاشـان زەردەخـەنـەیـەکی مـانـادار دەمـوچـاوی عەهدیەی پڕکردەوە.

شەقایق بـەبێ درەنـگکـردن لـەژوورەکـە چـــووەدەرەوە، قسەکانی عەهدیە تا سنوری شێتی توڕەیکردبوو، بەڵام هەرچی بوو عەهدیە ڕاستی دەکرد، مەنوچەر لەبەر منالّ ژنی هێنابوو.

**پێنج مانگ ڕایبورد..**

مەنوچەر زۆر کەم دەڕۆیشت بۆ بینینی شەقایق، مەگەر ئـەوەی کە شـەقایق شتێکی پێویست بێت لـەو کاتـەوەی کە عەهدیە شەقایقی بینیبوو، بەرامبەر مەنوچەر هەستیارتر بوو، مەنوچەر بەتەواوی بەئەم بابەتەی زانیبووو هەوڵیدەدا سەرنجبدات، کەمتر دەڕۆیشت بۆ لای شەقایق، مەگەر لەکاتی پێویستیدا.

چەند ڕۆژێک بوو کە عەهدیەو مەنوچەر سەرقاڵی هاتوچون بوون، شەقایق وردبین بوو، بەڵام زۆری نەخایاند کە وەڵامی پرسیارە نادیارەکەی دەست کەوت.

نزیکی خۆرئاوا بوو، ئێستا تەنیا سەرقاڵی تەلەفزیۆن بوو، دەنگی سوڕانی کلیلەکە لەناو قفڵەکەی ترساندی، چاوی کەوت بەمەنوچەر، ئارامییەک تەواوی لەشی گرتبووە، بەڵام زۆر زوو ڕوی لێوەرگێڕا، مەنوچەر لای پەنجەرەکە دانیشتو بەدەنگێکی فەرماندەرانە وتی:

- عەهدیە.. .. نەخۆشە!

شەقایق بەخوێنساردی:

- باشە بەمن چی؟

مەنوچەر بەگاڵتەوە سەیری کردو وتی:

- خەریکە دەبیتە خاوەن منداڵ.

شەقایق غافڵگیربوو، بەڵام خێرا خۆی کۆکردەوەو وتی:

- دایکت چاوەڕێی ئەم ساتە بوو، نەک من..! داوای لێبکە بێتو چاوی لەبوکەکەی بێت.

مەنوچەر بەتوڕەیی لای پەنجەرەکە هەستا، ویستی شتێک بڵێت، بەڵام بێبایەخ لەژوورەکە ڕۆشتەدەرەوە.

عەهدیە بێزوەکەی خراپ بوو، هیچی نەدەخوارد، جگە لەبرنجی سادەو ماست، مەنوچەر بێزاربوو، نێرگس قاچێکی لەتاران بوو، قاچێکی لەکەرەج، پەروێز مافی دەدا بەشەقایق، بەڵام نێرگس بەتوڕەیی دەیوت:

- کچی ڕودار! کەمێکیش یارمەتی نادات، منی بێچارە دەبێت هەموو ڕۆژێک بڕۆم بۆ کەرەج، چۆن گرفتار بوین.

مەنوچەر قسەیەکی نەدەکرد، بەڵام هاوبیرو ڕای پەروێز بوو.

لەکۆتایدا ڕۆژی دیاریکراو گەیشت، نێرگس هیوادار بوو، عەهدیە لەپاڵ مەنوچەردا دەگریا، ژانەکەی نارێکو کورت بون، بەڵام کاتێک دەستی پێدەکرد هاواری عەهدیە دەگەیشتە ئاسمان، پەروێز هاتبوو بۆ کەرەج، بەڵام بڕیاریدا لەلای شەقایق بمێنێتەوە.

شەقایق بەگەرمی پێشوازی لێکرد، پەروێز جگە لەمە چاوەڕوانی هیچی تری لێنەدەکرد، تاشەو کە مەنوچەر

گەڕایەوە بۆ ماڵ، شەقایقو پەروێز لەژوورەکە قسەیان دەکرد، مەنوچەر دەستبەجێ بـەرەو ژوورەکـەی شەقایق ڕۆیشتو کاتێک چووەژوورەوە، پەروێز بەگاڵتەوە پێی وت:

- لەکۆتایدا کوڕی گوڵی دایکت هاتە دنیاوە؟ "پاشان بەهەمان ئاواز وتی:" کاک مەسعود!

مەنوچەر بزەیەکی خستەسەر لێوی‌و وتی:

- نە، کچێکە، بەڵام باوکە خۆمانین، زۆر ناشرین بوو، سەرم سوڕدەمێنێ عەهدیە ئەم هەموو ماستو برنجەی خوارد، دەی بۆچی مناڵەکە وەکو قەلەرەشە؟

پەروێز پێکەنینێکی بەرزی کردو وتی:

- لەوانەیە لەجیاتی برنج بنی مەنجەڵی سوتاوی خواردوە!

دەنگی قاقای پەروێزو مەنوچەر دەگەیشتە ئاسمان، پەروێز لەبەر پێکەنین فرمێسک بەچاویدا زنجیرەی بەست، بەدەنگێکی بەرز وتی:

- دایکت چی دەکرد؟.. بەتەواوی توڕەبوو، نە؟.. چاوەڕێی کوڕی گوڵ بوو.

مەنوچەر هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو وتی:

- دەبوایە قسەکانیت ببیستایە! بەتانەوە وتی ناوی بنێ لەیلا کاتێک وتی لەیلا دەڵێی ناوی ئیزرائیلی هێنابوو!

پەروێز بەخەیاڵدا ڕۆیشتە خوارەوە، یادگاریەکانی ڕابردوو لەمێشکیدا گیانی گرتەوەبەر.

لـەم مانگەدا عەهدیە منـاڵی بـووە، مەنوچەر لـەم ڕووەوە کەوتوەتە ئەو ڕوو، ئیتر هەر نایە بۆ لام، دەڵێی لەبیری چووە من هەم، عەهدیەش پێی ناخۆش نییە، بەیانیان کاتێک دەڕوات

بۆ ئیش دەنگی دەبیستم دەڵێت ئاگات لەخۆت بێت، مناڵەکە مەهێنە دەرەوە! نازانم لەوانەیە لەترسی عەهدیەدا بێت کە بەلامدا نایەت، مەگەر هەر ڕۆژی یەکەم نەیوت، نایەوێت ببێتە مێردم، مەگەر نەیوت زیندانیمو خۆشی پاسەوان؟.. ئەو کاتە وامزانی گاڵتەدەکات، بەڵام ئێستا خەریکم دەبینم دەیبیستم کە ڕاستی دەوت، ئێستا گەیشتم بەقسەی دایکی خوالێخۆشبوم، هەمیشە دەیوت:

– هەرچی بکەیت بەپیاوەکان، ڕەگەزی خراپی خۆیان هەیە، بیبەیتە سەرەو بیبەیتە خوارەوە خراپن.

پێمدەوت دایکە مەگەر باوکم خراپ بوو؟.. دەیوت ئەو خوالێخۆشبووە زوو ڕۆیشت ئەگینا ئەگەر زیندوبوایە، لەوانەیە ئەویش بەجۆرێک خۆی پیشانی من بدایە، پیاوەکان کە پانتۆڵەکەیان بوو بەدوان، فیلەکەیان بیری هندستان دەکاتەوە!..

بەڵام منی دڵسادە، بەخۆمم دەوت هیچکات مەنوچەر بەمجۆرە نابێت، ئیشێکم بەخۆمەوە نەبوو، هەمیشە دەموت هەر کچێک ببێتە ژنی مەنوچەر خۆش بەختدەبێت، ڕەوشتی باشی نییە، کە هەیەتی، جوان نییە، کە جوانە، سەر بەڕێ نییە، کە هەیە، "شەقایق ئاهێکی هەڵکێشاو وتی:" لەهەموو کاتێکدا ئێستا مێردێکی خراپ نییە بۆ عەهدیە، خودا بکات لای ئەو بمێنێتەوە، خۆ من سەرەتای تەمەن بەخترەشەی ڕۆژگارم.

کوڕی مامم کە نیوەی تەمەنم لەگەڵیدا بووم، بەیەکەوە گەورەبوین منی وێڵکردوەو لکاوە بەو ژنەوە!.. وای، چەند لەخۆباییم لەبیرمکرد کە وەجاغم کوێرە، بێ هونەرم! چی سودێکم هەیە بۆی، مەنوچەر هەر ئەو کاتەی منی هێنا بۆ

کەرەج زنجیرەی خۆشەویستی بڕیبوو، ئیتر تەنانەت عاشقی دەموچاویشم نەبوو، ئەو یارییە کاتو بێکاتەش هیچ نەبوو، دڵخۆشکەربوم، وەک سەر گەرمییەک.

بەڵام سادق چی، یانی ئەویش وادەبوو؟.. بەڵام ئەو خۆی پێی وتبوم من ڕقم لەمنداڵە، وتی دەیەوێت تا کۆتایی تەمەن دوو کەس بین، یادی بەخێر دەیوت تۆ وەکو منداڵی خۆمی! دەگریت، بیانوگریشی، جوانیشی، ئیتر منداڵم بۆ چییە؟

بەڵام لەوانەیە ئەویش وەک مەنوچەر بێئەمەک بوایە، لەوانەیە ئەویش ڕەنگی بگۆڕایە، منی لەبیردەکردو تازە لەوانەیە ئەگەر بیزانیایە کە منداڵم نابێت، بیانوی منداڵی دەگرتو دەیوت تۆ بێهونەری، وەجاغتکوێرە، من تۆم بۆ چییە؟.. منداڵێکم دەوێت کە ببێت بەگۆچانی دەستم! بەڵێ لەوانەیە ئەویش هەموو پەیمانەکانی لەبیربکردایە، بەقسەی دایکی خوالێخۆشبوم پیاوەکان هەموویان خراپن، نابێت دڵنیابیت لەهیچ کامیان.

شەقایق هەستاو بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشت، ئاسمان گیراو هەوربوو، زۆری نەمابوو بۆ سەرەتای پایز، بێخواست، خەمێکی قورس دڵی گرت، دووبارە ڕابردوو لەمێشکیدا زیندوبووە.

دەنـگـی ئـەو قـەلـەرەشـانـەی کـە لـەسـەر دارتـوی ماڵی دراوسێکەیان دەستیانکرد بەهاوار کردبوو خەمەکەیان زیادکرد، کەوتەبیری ئەو ڕۆژەی کە لەپارکەکە لەگەڵ سادقدا پیاسەی دەکرد، هـەردوو بێدەنگ بون، دونیا وەک ئێستابوو، گیراوو خەماوی، ساردو وشک، تەنیا دەنگی خشەخشی گەڵاکان بوو کە لەژێر قاچیاندا هاواریاندەکرد، ئەو ڕۆژە لەکۆتایدا سادق بێدەنگییەکەی شکاندو وتی:

- شەقایق دێیت بڕیارێک بدەین؟

- چ بڕیارێک؟

سادق دەستی بۆ کورسی ناو پارکەکە ڕاکێشاو وتی:

- سەیری ئەو کورسییە بکە! وەرە لەمەودوا هەرکات دڵتەنگ بوین، بێین بۆ ئەم پارکەوە لەسەر ئەو کورسییە دابنیشین، بۆ ئەوەی هیچکات ئەم بڕیارەمان لەبیرنەچێت، ڕۆژی بیستو شەشی مانگی میهر کە ڕۆژی لەدایکبونتە دێین بۆ ئێرە! هەر ئەو ڕۆژە جەژنێکی لەدایکبونی بچوک دەکەین بۆت.

پەیمانبدە ئەگەر لەئاسمان بەردیش بباریت بڕیارەکەمان لەبیرنەکەی.

شەقایق لەکاتێکدا قسەکانی سادقی بەمێشکدا تێدەپەڕاندو بەگریانو بەدەنگێکی لەرزۆک وتی:

- یانی دوای ئەم هەموو ماوەیە، دوای ئەم سێ ساڵە، تۆ هیچ لەبیرمدا بوی؟ چاوەڕوانم مایتەوە؟.. دەزانم، زۆر خۆپەرستییە! من زەماوەندم کرد، لەوانەیە تۆش زەماوەندت کردبێ؟.. بەڵام بەخودا، هیچ کات چێژم نەبردووە لەم ژیانە، تەنانەت شەوێکیش نییە کە بیرت نەکەمەوە، بیری قسەکانت! تۆ ڕاستت وت هەردوکمان لەڕەگەزی یەکترین، تەنیای تەنیا! هیچ کەس لەبیری ئێمەدا نییە، تەنانەت خوداش، لەوانەیە من یان تۆ خەریکین سزاوەردەگرینەوە، بەڵام سزای چی؟.. لەوانەیە دوای ئەم هەموو سەختییە ڕۆژێک بەیەک بگەین، بەڵام کەی؟.. لەوانەیە تا ئەو ڕۆژە من یان تۆ ئیتر نەبین.

دڵم تەنگ بووە بۆت سادق، دڵم تەنگ بووە!

شەقایق لەژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە، بەتەواوی دڵتەنگبوو، چەند هەنگاوێکی لەناو حەوشەکە ناو ڕۆیشتە ژێر دار گێلاسەکە وەستا، قەڵەرەشەکان سەرداری دراوسێکەیان، بەبینینی زۆر خۆش حاڵنەبوون، باڵیان گرتەوەو ڕۆیشتن، عەهدیە دەڵێی میوانی هەبوو، دەنگی پێبکەنە بەرزبوو، سەعیدە خوشکی عەهدیە لای پەنجەرەکە وەستاو بەئاوازێکی وەک تانە وتی:

- هەوێکەت خەریکە پیاسە دەکات!

عەهدیە سەیرێکی دەرەوەی کردو بەتوڕەییەوە وتی:

- یاخوا بمرێت..

سەعیدە پرسی:

- مەنوچەر شەوان دەچێت بۆلای ئەو؟

عەهدیە بەهەمان ئاواز وتی:

- هەڵە دەکات دەڕوات بۆلای! پێموت ئەگەر دەیەوێت تەلاقی نەدا، مافی نییە قاچ بخاتە ژوورەکەیەوە!.. مەنوچەر ڕێزی سەگیشی بۆ دانانێت.

سەعیدە ڕوی تێکردو وتی:

- کەواتە بۆچی تەلاقی نادات، هەم تۆ ڕزگارت دەبێتو، هەم سبەینێ کە مناڵەکەت گەورەبوو ناپرسێت ئەم ژنە کێیە؟

عەهدیە وتی:

- وای.. من لەخوام دەوێت، بەڵام مەنوچەر دەڵێت کەسی نییە، نەدایکی هەیە، نەخێزانو نەبنەماڵە.

سەعیدە وتی:

- خۆ دایکی مێردەکەت هەیە؟.. نێرگس خانم دەڵێم، بڕوات بۆ لای ئەو ئامۆژنییەتی هەر ئەوەی کە.. عەهدیە وتی:

- نە بەوجۆرە خراپترە!.. ئەگەر ڕۆژێک، تەڵاقی بداتو بینێرێت بۆلای دایکی مێردەکەم، لەکۆتایدا چاویان بەیەکدەکەوێت، حەزناکەم ببمە هۆی دەردەسەری، خۆت باش دەزانی پیاوەکان هەموویان حەرامزادەن!

سەعیدە وتی:

- لەهەموو کاتێکدا، بەجۆرێک بیخەرە ژێر ئاوکە بەباشی لەبەرچاوی مەنوچەر بکەوێت.

عەهدیە خێرا وتی:

- من ناتوانم، تۆ ئەگەر دەتوانی بەجۆرێک یارمەتیم بدە!

سەعیدە بەرامبەری دانیشتو وتی:

- مەنوچەر زۆر ڕقی لەچییە؟ یانی تۆچی بکەیت ئەو تورەدەبێت؟

عەهدیە کەمێک وەستاو دوای ماوەیەک بیرکردنەوە وتی:

- مەنوچەر پیاوێکی تێگەشتووە، سەخت گیر نییە، بەڵام باش، وەک هەموو پیاوەکان بەغیرەتە .

چاوانێکی سەعیدە تیشکێکی داو وتی:

- ئەمە ڕاستە، دەستبخەرەسەر ئەم خاڵە لاوازەی، بۆ ئەم ژنەش پێلاوێکی فێڵبازانە دروستبکە،، عەهدیە وتی:

- ئاخر.. چی بڵێم؟

سەعیدە وتی:

- چوزانم، بڵێ بەبێ مۆڵەت لەماڵ ڕۆیشتوەتە دەرەوە!

عەهدیە ببێزارییەوە وتی:

- ئەو لەماڵ دەرناچێت؟!

سەعیدە بەبێزارییەوە:

- ئاخ تۆ چەند گێلی؟!.. دەباشە درۆبکە! لەخۆتەوە بڵێ ڕۆیشتوەتە دەرەوە.

عەهدیە کەمێک بیری کردەوەو وتی:

- بەڵێ، بیرێکی باشە!

سەعیدە هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو وتی:

بەڵام خوشکە پێت ناخۆش نەبێت، تۆ زۆر بێدەسەڵاتی، من لەجێگەی تۆ بوایەم، هەرشەوی یەکەم شوێنپێی خۆم قایمدەکردو ڕیشەی ئەم ژنەم لەماڵەکەدا دەبڕی، ژنیش دەبێت ڕێزی هەبێت!

عەهدیە بەشەرمەزاری وتی:

- چی بکەم خوشکە، دڵم بۆی دەسوتێ، بەڵام ڕاستدەکەی، من زۆر شلبوم.

سەعیدە وتی:

- خۆ سەکینە خانمت لەبیرە؟.. ئەویش وەک تۆ هەوێی هەبوو، تازە مێردەکەی عاشقی ژنی یەکەمی بوو، بەڵام ژنەکە وەجاغی کوێربوو، وەک ئەم! تۆ نازانیت، ئەم سەکینە خانمە کارێکی کرد کە تەڵاقی ژنی یەکەم نەگەیشتە هەفتەیەک، مێردەکەی دەستی ژنی یەکەمی گرتو لەماڵ کردیەدەرەوەو ئێستا سەکینە لەماڵی مێردەکەیدا سەرۆکی دەکات، بووە بەژنی ماڵ! مێردەکەی ناوێرێت قسەبکات، وەکو مشک وایە، سەکینە خانم ڕۆژی هەزارجار دەمی دەگرێت لەماڵەکە دەیکاتەدەرەوە،، شەو عەهدیە بەپێچەوانەی شەوانی پێشوو کە بیانووی منداڵەکەی دەگرت، شێوانێکی باش دروستکردبوو، لای منداڵەکەدا دانیشتبوو، بۆدییەکی سوری توندی لەبەرکردبوو،

مەنوچەر منالەکەی گرتەباوەش‌و وتی:

- چییە، ئەمشەو باش بەخۆتدا گەشتویی، شتێک هەیە؟!

- هیچ، ئەمڕۆ ئیشم سوکبوو وتم کەمێک بەحاڵی ماڵدا بگەم.

مەنوچەر بەگاڵتەوە وتی:

- بەماڵەکە بگەیت یان بەخۆت؟!

عەهدیە لەدڵەوە وتی:

- بەقسەی سەعیدە هەموو کارێک دەبێت ڕێکوچاک ئەنجام بدرێت! ئەمشەو بیگرە، شەوێکیتر کە ڕاهات دەست پێ بکە!

مەنوچەر بەبیری شەوی ڕابردووەوە خۆشحاڵ‌و تامەزرۆ ڕۆشتەوە بۆ ماڵ، میوەی کڕیبوو تابەدەست بەتاڵی نەڕواتەوە بۆ ماڵ، لەگەڵ خۆیدا وتی:

- دەبێت هەلیش بدەیتە عەهدیە، ئەگەر بێتەوە بەخۆیدا ژنێکی بەهونەرو وشیارە!

منداڵەکە خەوتبوو، عەهدیەش بەمۆنی هاتەژوورەوە، مەنوچەر زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- چییە بۆچی مۆنەت کردووە؟ "پاشان بێبایەخ بەردەوام بوو:" ئاە، خۆ ئەم منداڵە هەمیشە خەوتوە!.. کەواتە کەی چاوانی دەکاتەوە؟

عەهدیە بێبایەخ وتی:

- مەنوچەر بەخوا هیلاکم، خەریکم لەم ماڵەدا دەمرم، هەزار جۆر ئیشم هەیە، ئەو ژنەشت کە ئیتر هیچ، ئیتر بەرامبەری نیم.

مەنوچەر پرسیار گەرانە وتی:

- مەگەر چی بووە؟!

عەهدیە هەستاو بەرەو پەنجەرەکە ڕۆشت‌و وتی:

- وای.. ئیتر نازانم چی بکەم، چاوم بەمناڵەکەوە بێت یان ببمە ئێشککگری خانم.

مەنوچەر بەبێزارییەوە وتی:

- دەڵێی چی بووە یان نە؟.. نزیک نیوەڕۆ خەریکبوم منداڵەکەم بشۆم، دەبینم دەنگی دەرگاکە بەرزبووە، ڕۆیشتم بزانم کێیە، سەیردەکەم خانم دەرگاکەی کردوەتەوەو سەیری دەرەوە دەکات، پێموت کەسێک لەدەرگای دا، وتی: نە، دڵم گیرابوو خەریکبوم سەیری دەرەوەم دەکرد، وتم یانی چی؟.. دڵت گیراوە برۆ لەژوورەکەت دابنیشە یان لەحەوشەکە پیاسەبکە، بۆچی هەر سەر دەکێشیتە دەرەوە بۆ کۆلان، بەتەواوی ڕوداری وتی، پەیوەندی بەتۆوە چییە؟! منیش تورەبوم پێموت چییە سەیری دەرەوە دەکەیت کە مێردێک پەیدا بکەی بۆ خۆت؟.. بەتەواوی بێشەرمی وتی: بەڵێ! چییە ئیرەیی دەبەیت؟

مەنوچەر بەتورەیی وتی:

- شەقایق؟!.

عەهدیە وتی؟!

- بەڵێ!.. "پاشان بەگاڵتەوە وتی:" مێردی دەوێ، بۆچی نایدەی بەشوو ڕاستیش دەکات.

مەنوچەر هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو لەژێر لێوەوە قسەیەکی کردو لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوە قسەکانی عەهدیە کاری خۆیانکرد، بەتەواوی تورەبوو، بەبێئەوەی لەدەرگاکە بدات ڕۆیشتەژوورەوە، شەقایق لەچێشتخانەکە خەریکی شتنی قاپەکان بوو، بەبینینی مەنوچەر وتی:

- سلاو شتێک بووە؟!

مەنوچەر بەتوڕەیی وتی:

- ئەمڕۆ بۆچی ڕۆشتبوویتە دەرەوە؟

شەقایق بەسەرسامییەوە وتی:

- من؟! من ئەمڕۆ نەڕۆشتوومەتە دەرەوە.

مەنوچەر لەکاتێکدا بەدوای شتێکدا دەگەڕا کە لەشەقایق، هاواریکرد:

- تۆ هەڵەت کرد.. ئیتر بەدوای مێرددا دەگەڕێیت؟!

شەقایق بەترسەوە بەرەو ژوورەکە ڕۆیشت، مەنوچەر سۆندەی ئاوەکەی لێکردەوەو پەلاماریدا، شەقایق هاواریکرد:

- بەخودا نەرۆیشتوم بۆ شوێنێک، برۆ لەعەهدیە بپرسە!من..

بەلام مەنوچەر بێبایەخ لێدانێکی باشی کردو پاشان لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوە، بەتەواوی توڕەبوو، سۆندەکە هێشتا بەدەستیەوە بوو، کاتێک ڕۆشتە ژوورەوە بەرەو ڕووی عەهدیە فرێی داو بەبێ وتنی قسەیەک بەرەو ژوورەکە ڕۆشت، شەقایق تابەیانی بەئازارەوە گریا، زیاتر لەمەنوچەر، لەدەستی عەهدیە توڕەبوو، بۆچی نەهاتبوو بۆ پشتیوانی کردنی؟!

بەیانی پێش ئەوەی مەنوچەر بچێت بۆ سەر ئیشەکەی، دەرگاکەی ژوورەکەی شەقایقی قوفڵکرد، عەهدیە لەبەرخۆیەوە وتی:

بەمجۆرە سودی نییە، جگە لەوەی کە کچە کەمئەندام دەبێتو منی بەدبەخت دەبێت چاودێری ئەویش بکەم، نەدەبێت بیرێکی بنچینەیی بکەمەوە.

دڵۆپە گەورەکانی باران بەتوندی لەپەنجەرەکەیان دەداو پاشان ئارام ئارام دەخزانو دەکەوتنەخوارەوە، سادق لەپشت

پەنجەرەکەوە وەستابوو، سەیری حەوشەی دەکرد، سەیری بارانەکەی دەکرد، بەلام هۆش‌و بیری لەجێگەیەکیتر بوو، هێشتاش دوای چوار ساڵ هەموو ڕۆژێک دەڕوات بۆ ئەو پارکە، هێشتاش ئەو نیگا سەوزە لەمێشکیدایە، لەبیریدابوو، بەلام چی سودێکی هەیە کە زەمانە لەیەکی جیاکردونەتەوە، تەنیا ئاه بوو کە هەندێکجار لەرەفتاردا دەردەکەوت‌و نیشاندەری ئەو عەشقەبوو، عەشق تەنیا هاوسەفەرێک بوو کە بۆی مابووەو جگە لەو تەنیایی‌و خەفەتبوو! یادی ئەو ڕۆژە خۆشانە وەک مۆسیقایەکی خەمهێنەر ئەوی لەشەپۆلێکی دوردا دەخستە بێهۆشییەوە، چیتر ئەو گەنجە ورياو چالاکە نەبوو، سەرکەوتن‌و بردنەوە مانایەکی نەبوو بۆی، دۆڕاو بوو، بەلام ترسی لەدۆڕاندن نەبوو، چونکە هەموو دراو نەداری لەدەست دابوو، لاواز، چاوەکانی هێشتا بێتاوان‌و دڵگیربوو، بەلام ڕوناکی ڕابردوی تێدا نەدەبینرا، خۆی دابووە دەست چارەنوسەوە.

- چی بارانێک دەبارێت کاکە سادق!

سادق بێگرنگیدانە جەواد سەیری ئاسمانی دەکرد، جەواد لەلای مێزی سەماوەرەکە دانیشت‌و بەدەستەسڕە یەزدییەکەی دەوری ملی قۆریەکەی خستە سەر زەوی‌و پیاڵەیەک چای بۆ خۆی تێکرد، بەپشتە دەستی لوتی خوراندو لەپاکەتی شقارتەدا کەمێک تلیاکی دەرهێناو لەگەڵ چاکەدا خواردی.

- چییە کاکە نەخۆش! دوبارە خەمباری؟

سادق لەسەر لێواری پەنجەرەکە دانیشتبوو، بێدەنگ، تاقەتی قسەکردنی نەبوو، کاتێک جەواد خۆشحاڵبوو زۆر قسەی دەکرد نازانم ڕاهاتن لەسەر ئەم ماددانە چی نەخۆشییەکە کە

مرۆڤ توشی فرەویژی دەکات، بەلام خەلوەتەکەی سوکی‌و بێ خەیالییە، دەلێی مرۆڤ لەحەوت دەولەت ئازاد دەبێت، جەواد وتی:

- ویلیکە، سادق چوار ساڵ تێپەڕیوە هێشتا لەبیریدای؟..ها..، ئەو سێبەر بەسێبەر لەگەڵ ژنەکەیدا ڕێدەکات، ئەم کچە ئێستا چوار ساڵە ونبووە، وەرە...وەرە جگەرەیەکت بۆ دروستبکەم پڕ لەدڵ حەزی لێبکەیت!

بەلام سادق لەجیهانی خۆیدا بەتەواوی لەبیرو خەیاڵدا بوو، جەواد بەبێزارییەکەوە وتی:

- خەریکم قسەت لەگەڵدا دەکەم، وەرە بابە لەبیریکە، ئەو ئێستە بەڕیشی تۆ پێدەکەنێت.

- سادق ئەبلەقی جەواد بوو، بەئارامی وتی:

**لەنێوان خەلوەتی شەواندا، کەسێک بێ هودە دەپرسێت.**
**شەقایقیش بۆ تۆ هەروا بێ تواناو سەرسامە.**
**لەوکاتی دوو دلیەدا کەسێک لەسنگیدا دەلێت.**
**ئەگەر شکت لەعەشق هەیە، چۆن عاشقێکی؟!**

جەواد بەپێکەنینەوە بەرەو لای ڕۆیشتو لەلایدا دانیشت، لەلای پەنجەرەکە، بێدەنگی سادق ئەویشی بێدەنگکرد، دەلێی ئەویش سوک کەمکێش بوو، ئێستا دەلێی درکی بەهەستی سادق کردبوو، ئێستا دەلێی ئاسمان‌و بارانیش بەرزبوون، ساتێک تێپەڕی، جەواد وتی:

- ئەمڕۆش دووبارە دەتەوێ بڕۆیت؟

سادق هێواش وتی:

- چارەیەکم نییە، جگە لەمکارە چارەیەکی ترم نییە، من هەموو شتێکم دۆڕانــدوە، لەسەر ئـەم عەشقە، لەسەر ئەو ونبووە!

جەواد بەئارامی وتی:

- حەزم دەکرد وەک تۆ بومایە، زیرەک، لۆتی.. عاشق! بەڵام ژنەکەم وێڵکردو کەوتمە هێڵی ئەم شتە پیسە!

سادق بزەیەکی کردو وتی:

- ئـەو شتـەی کە لـەلای تۆ پیسە بۆ من دەرمـانـە، وەکو ئارامبەخشێک! من ئەگەر تلیاک نەبێت وەک شێتەکانم لێدێت، نازانم چی بەڵایەک بەسەر خۆمدا دێنم، بەڵام ئەوە باشتر کە بێهۆش بم، کاتێک ئەم تلیاکە ناکێشم دەڵێی هەموو ئەو ڕۆژانە دێنەوە پێش چاوم..

جەواد سودی لەوەستانەکەی سادق وەرگرتو جگەرەکەی دا بـەئـەو، دەیـزانـی کاتێک حاڵی سـادق خـراپ بێت، تـاوەک شەو لەهەموو کەس دەوەڕێـت وەک سـەگ، جـەواد هـەمیشـە دەیویست شەقایق ببینێت هەر ئەو کچەی کە سـادق لەبەر خاتری دەستی لەگەنجیو تەمەنی خۆی هەڵگرتو هەموو شتێکی خستەسەری، هەموو بونی! حەزیدەکرد بزانێت کە ئایا ئەم کچە بەوەفاداری ماوەتەوە بەرامبەر سادق؟.. ئایا هێشتا باوەڕی بەبڕیارو پەیمانەکانی هەیە؟.. سادق بەتێپەڕبونی چوار ساڵ هێشتا وەک ڕۆژی یەکەمە کە جەواد بینیبوی، هێشتا بۆ عەشقەکەیو پەیمانەکەی وەک ناوەکەی خۆی ڕاستگۆ بووە.

بارانەکە کردیە لێزمە، بەڵام تەنیا دەنگێک کە لەگوێی سادقدا

مانای هەبوو دەنگی بارانەکە بوو، هەموو ساڵێک کە دەگەیشتە ئەم کاتە دڵی ڕووناکدەبووە، زیاتر لەرۆژانەتر!

لەو پارکەی کە ڕۆژێک شوێنی بەیەکگەشتنیان بوو، ئەمڕۆ بوو بەخەڵوەتگای سادق، باڵندەش باڵی نەدەگرتەوە، هەموو لەترسی تەڕبون لەماڵەکانیان خۆیان شاردبووە، سادق بەرامبەر ئەو کورسییە وەستا کە هەمیشە لەسەری دادەنیشتو چاوەڕێی هاتنی شەقایقی دەکرد، بەدەنگێکی هێواشو لەرزۆک وتی:

- شەقایق دیسان بەرامبەر هەمان کورسی هەمیشەییو لەلای هەمان ئەو دارەی کە تەنیا شایەتحاڵی ئەو قسەو پەیمانانەیە وەستاوم، شەقایق باوەڕدەکەیت چوار ساڵ تێپەڕی کرد، چوار ساڵ بەبێ تۆ، زۆر بێ وەفای! نەهەواڵێک، نەنیشانەیەک، ڕۆیشتی کە ڕۆشتی، بەبێ من بێگومان لەگەڵ مەنوچەر!

ئەو دەمارەی کە بەتەوێڵی سادقەوە بوو بەناوهێنانی مەنوچەر بەرجەستەبوو، خوێنی سور تێیدا دەستی بەسوڕان دەکرد.

سادق هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو سەری بەرەو کورسییەکە سوڕاند، دەڵێی شەقایق لەوێ دانیشتبوو خەریکی گوێگرتن بوو لەقسەکانی.

لەو ڕۆژەوەی کە ڕۆیشتوی کارم بوە بەئەلافی، بێئامانج لەشەقامدا دەگەڕام، خۆم وێڵدەکرد لەنێوان لافاوی خەڵکیدا، وەکو ماسییەک لەناوەڕاستی دەریادا وندەبوو، بەڵام شەو بەهیلاکی سەیری دوکەڵی تلیاکم دەکرد کە وردە وردە بونمی لەبەرچاومدا لەناودەبرد، دەبینی کچەکە، دەزانی چیت کردوە؟..

هەندێ کات لەگەڵ خۆمدا دەڵێم ئەو دوژمنایەتییەی کە منو تۆ هەمانبوو دەڵێی ئاگری خۆشەویستی نێوانمانی تیژترو بڵێسەدارتر دەکـرد، لەبیرتە چەند قسەی خـراپو بێجێمان بەیەک دەکـرد، زۆری نەمابوو لەیەک بدەین، بـەڵام لەناکاو نازانم چیبوو کە بوم بەدیلت.

هەموو قسەکانم دوبـارەبـوەتـەوە، دەزانـم، بـەڵام هێشتاش دوبارترین قسە دەتوانم پێت بڵێم ئەمەیە، هێشتاش وەفادارم بۆت.

سادق جارێکیتر سەیری کورسیە بەتاڵەکەی کرد لەسەری دانیشتو بەخەیاڵەکانی خـۆی پێکەنی، کاتێک با هەڵیکرد هەستی بەسـەرما کردو لەرزی گەرچی ئەم قسانەی لەسـەر زمانی دابوو، بەڵام دەترسا قسەی دڵی بکات، هێشتا هاواری دەرونی بوو کە ناچاریدەکرد بەبێدەنگی.

مەگەر نەبیرو خەیاڵی شەقایق منی گەیاندە ئێرە، بەدبەختبوم، بێچارەبوم، منی گێل دەمتوانی بڕۆم، بڕۆم بەدوای ژیانمدا، بەدوای بەدبەختیم، بەڵام ئێستا ژیانم بووە بەفیڵی کورەو ئاگر!

سـادق ئـاگـاداری فرمێسکەکانی نەبوو کە هاتبونەخوار لەوانەیە باران نەیدەهێڵا هەست بەگەرمی فرمێسکەکانی بکات، بێخواست هاواریکرد:

- بێ مەعریفەت! لەبیرتە چیت دەوت؟ پەیمانەکانت لەبیرە کە داوتە؟ لەبیرتە پەیمانتدا نەبیت بەژنی ئەو پیاوە دۆڕاوە؟ لەبیرتە وتت ئەگەر بکرێت شەو ڕادەکەم تابێم بۆ لای تۆ؟.. لەکام گۆڕی؟. لەکوێی؟

شەو بوو، باران دەباری، ئەو ئاوەی کە لەپێڵاوەکانی سادقدا کۆبوبووە قاچی بێهێز کردبوو، خەڵک دەڵێی لەباتی بەیانی

که لەماڵەکانیاندا خۆیان قایم کردبوو ئێستا وەکو مێرولەو کولە ڕژابونە سەر شەقامەکان، سادق لای دوکانێکی بچوکی جگەرەفرۆشێکدا وەستابوو، بێ گرنگیدان بەخەڵک جگەرەی دەکێشا، لەبەیانیەوە تا ئێستا لەدەرەوەبوو، سستو بێحاڵ بوو، دەڵێی بارێکی هەزار کیلۆیی بەسەر شانییەوە بوو، لەوانەیە سستی لەسەر شانەکانی وەستابوو هیلاکی نەدەهێشت.

- ئەم هەموو خەڵکە، ئەم هەموو مرۆڤە، من نازانم چی یان دەوێت؟

دەنگی پیاوە جگەرەفرۆشەکە لەخەیاڵ دەریکرد، وایزانی خەودەبینێت، بەڵام دەڵێی ڕوخساری ئاشنای شەقایق بوو کە لەپشت شوشەی دوکانەکەوە سەیری دەکردو وەستابوو.

- چەند خۆشحاڵ بوو.

- نەوەکو خەوتبم؟!

سادق نەیدەزانی خەوتوە یان بەخەبەر، بەڵام ناڵێی بەخەبەربوو، جگەرەکەی خستەسەر زەوی‌و بەتەواوی بێحاڵی بەرەو ڕوی شەقایق ڕۆیشت، شەقایق پێدەکەنی.

هەناسەبڕکەی پێکەوتو، بەڵام هەر چۆن بوو وتی:

- شەقایق

کچەکە بەری کردە دواوە، بەڵێ ئەمە هەمان چاوان بوو، بەڵام نە، ئەمە ئەو دەموچاوە نییە، خۆ ئەمە شەقایق نییە!

ئەو پیاوەی کە لەلای کچەکە وەستابوو یەخەی گرتو وتی:

- چییە؟

سادق هێواش وتی:

- بمبەخشە! بەهەڵە تێگەیشتم.

بەڵام پیاوەکە زۆر تورەبوو، چەقۆت لەئێسقانی بدایە خوێنی لێنەدەهات.

- تۆ هەڵەت کرد! زباڵە مەگەر کوێری؟

دەستی بەشەڕ کرد، سادق لەوە بێزارتربوو کە یەخەی بگرێت، دامابوو بەشێوەی تۆران هاواریکرد:

- وێڵمکە پیاو! هۆشم نەبوو بۆچی تێناگەی.

پیاوەکە زۆری لێدا، هیچ کەس ئامادەنەبوو یارمەتی بدات، دەڵێی سەیری فلیمیان دەکرد، سادق لەژێر مستو لەقەی پیاوەکە خەریکبوو لەناودەچوو، بەڵام هیچ کەس دڵی بەناڵەکانی نەسوتا، هیچ کەس بۆ یارمەتی نەرۆیشتەپێشەوە.

دیسان باران باری، وەک ئەوەی دوا هاوڕێی ئەم بارانە بوو، بەڵام ئەمجارە سستیەکەی دەشوشتو لەگەڵ خۆیدا دەیبرد، سادق لەشی نیوەگیانی بەسەختی لەنێوان خەڵکدا تێپەڕاندو خۆی لەنێوان ئەم هەموو ناپیاوە دەرکرد، توانای وەستانی نەبوو، ئەو خوێنەی کە بەسەر دەموچاوییەوە بوو بەئاوی باران دەشۆرایەوە، بەبێگیانیو بێتوانایی کەوتەسەر زەوی، کۆلانێکی چۆڵبوو کە تەنیا دەنگی قاچی باران دەگەشتە گوێی، سەیرکردنی بێ ڕوناکی، چاوی بڕیبووە تاریکی گەڕەکەکەو لەژێر لێوەوە ئەم ڕستانەی دەوتەوە:

**عاشقم عاشقم من عاشقم لەئەزەلەوە.**

**عاشقم عاشقم من بۆ عەشقت تائەبەد**

سادق بەنیوە گیانی لەکاتێکدا چاوی لەتاریکی کۆلانەکەبوو لەتەواوی تەنیایدا لای دیوارێک دانیشتبوو، دەڵێی لەساتی کۆتایی تەمەنیدا دیسان هیواداربوو ونبوەکەی ببینێت، ڕاستدەکەن وتویانە تەنیا چاوەڕوان چاوەکانی نانوقێت.

تەنیا کارێک کە جەواد توانی بۆی بکات ئەوەبوو کە کاری بەوەسیەتی هەمیشەی ئەو کرد، سادقی لەلای گۆڕی پورە مونیرەوە ناشت، چونکە هەمیشە دەیوت:

- لەکۆتایدا شەقایق ڕۆژێک دێتەسەر گۆڕی دایکی.

بەڵام تەنیا کارێک کە جەواد بۆ دڵی خۆی کردی ئەوەبوو کە هەموو ساڵێک لەرۆژی بیستو شەشی مانگ میهردا شیعرەکەی شەقایق بدات بەرۆژنامە تا چاپی بکەن، لەوانەیە شەقایق ڕۆژێک بیخوێنێتەوە، لەوانەیە بەمە ڕۆحی سادق بەئارامی بگات.

دوای مردنی سادق، فاتمە تەنیا کەسێک بوو کە هەمیشەو هەموو شەوێکی هەینی لەسەر گۆڕەکەی ئامادەدەبوو هەمیشە بەخوێندنەوەی نوسراوی سەر بەردی گۆڕەکەی ئەو، لەناخی دڵەوە لەقوڵای ڕۆحییەوە دەگریا، هەمیشە دەکەوتەبیری ئەو ڕستەیەی سادق جگەری دەبوو بەکەباب:

**دەزانم، لەکۆتایدا لەخەفەتی شەقایقدا دەمرم.**

## "٤٣"

سەرما بێدادی دەکرد، بەفر دەباری، حەوزەکە بەستبوی، مەنوچەر سێجار بەفری سەربانەکەی لابردبو، لەژوورەکە دانیشتبوو ساتێکیش شەقایق لەمێشکی دەرنەچوو، هێشتا

زۆپای ژوورەکەی ئەوی دانەنابوو، ئەم ژوورە لەگەڵ ئەوەی کەزۆپا تێیدا ئیشی دەکرد هێشتا ساردبوو چجا بگات بەئەوێ.

چەند ساتێک تێپەڕی لەگەڵ خۆیدا وتی:

بابە نا سەلامەتی من مێردیم، ئەگەر من ئەمکارەی بۆ نەکەم، کێ بۆی بکات، ئەو کچی مامە، گوناهە ئێستا بێگومان لەسەرمادا هەڵدەلەرزێت، ئەگەر باوکم بزانێت، تفم تێ دەکات، مافی هەیە، لەبیرم چووە چەندەم پێوتن کە شەقایقم دەوێ، ئێستا چی؟.. بومەتە نۆکەری ئەم ژنە! ئەگەر ئامۆژن زیندوبوایە بێگومان نەفرینی دەکردم.

عەهدیە سەری بەرزکردەوەو مەنوچەری بینی.

بۆ کوێ شاڵو کڵاوت لەبەرکردوە؟

مەنوچەر سەیرێکی کردو لەکاتێکدا قۆپچەی قۆڵەکەی دەبەست:

- دەمەوێت بڕۆم زۆپاکەی شەقایق دابنێم، ئێستاکە بێکارم دەبێت چاکی بکەم، دوایە ناتوانم.

عەهدیە بڕۆی نزیک یەککردەوەو بەتوڕەیی وتی:

- خۆت لێرەی، بەڵام هۆشت لەلای ئەوە!.. ئەو نەهونەری هەیە نەبەرهەم، بەڵام خۆشەویستتە.

مەنوچەر بەکینەوە وتی:

- وازبێنە ئیترا چەند بۆڵە دەکەی؟

مەنوچەر کلیلەکەی دەرهێناو دەرگاکەی کردەوە، هەوای ژوورەکــە وەکـو ســاردکــەرەوە ســاردبـوو، شـەقایـق دوو بەتانی بەخۆییەوە بێچابوو، لـەسـەرمـادا لەسەر گۆناکانی پەڵەدەرکەوتبوو، پەڵەکان زۆر جوان بوبوو، بـەڵام نیگای خەمباربوو.

بەهێواشی سڵاویکرد، دەنگی دەلەرزی:

- نەوەک سەرمای بوبێت!

مەنوچەر دەستی بردە پێشەوەو لەسەر گۆنای دانا، بەئاوازێکی فەرماندەرانە وتی:

- خۆ نەخۆش نیت؟

شەقایق وەک منداڵ سەری بادا یانی نە

مەنوچەر ڕۆیشتە گەنجینەکە، زۆپاکەی هێناو لەژوورەکە داینا، ئیشی بەستنی زۆپاکە دوو کاتژمێری خایاند، شەقایق لەم نێوانەدا چای بۆ هێناو لەلایدا وەستا تا هەرچی ویست بیدات بەدەستییەوە.

نزیکی نیوەڕۆبوو، عەهدیە بەبەردەوامی بەژوورەکەدا هاتوچۆی دەکرد، دڵی تاقەتی نەهێنا، لەکۆتایدا بەرەو لای ژوورەکەی شەقایق کەوتەڕێ، بەبێ ئەوەی لەدەرگا بدات ڕۆیشتە ژوورەوە، مەنوچەر سەری لەئیشەکەیدابوو، ڕوی بەرەو لای وەرگێڕاو بەسەرسامی پرسی:

- چی بووە؟!

عەهدیە بەمۆنی سەیری کردو وتی:

- چێشتی نیوەڕۆ ئامادەیە، بۆچی نایەیتەوە؟

مەنوچەر بێبایەخ وتی:

- تۆ بڕۆ! ئەمە ئیشی زۆری ئەوێت، بەمزوانە تەواو نابێت.

عەهدیە بەپێداگریکردو وتی:

- باشە سەبردەکەم تا بەیەکەوە بڕۆین.

شەقایق هێواش وتی:

- ڕاست دەکات، تۆ بڕۆ خۆم بەجۆرێک چاکی دەکەم.

مەنوچەر بەتورەیی وتی:

- لەخۆتەوە قسە مەکە!

پاشان بەعەهدیەی وت:

- بڕۆ بۆ ژوورەکە بۆلای منداڵاکە، من زوو دێم.. بڕۆ!.. لێرە مەمێنە سەرمات دەبێت.

عەهدیە بەتورەیی لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوە.

شەقایق جارێکیتر بەگونجاوی وتی:

- مەنوچەر گیان بڕۆ!.. گوناهە، بڕۆ دوایی وەرە چاکی بکە!

مەنوچەر بێبایەخ سەرقاڵی ئیشەکەی بوو، کاتێک ئیشەکە تەواوبوو، زۆپاکەی داگیرساند بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشتو دەرگاکەی قوفڵکرد، دەستی شوشتو بێبایەخ وتی:

- ئەم چا چی لێهات؟

شەقایق بەداماوی وتی:

- بڕۆ بۆ لای عەهدیە! مناڵەکە لەخەو هەڵدەستێو بیانوت دەگرێت.

مەنوچەر بەئەبڵەقی سەیری کردو وتی:

- دەتەوێ لێرە بمکەیتە دەرەوە؟

- نە بەخودا!.. تەنیا.. تەنیا..

مەنوچەر بزەیەکی کردو وتی:

- پەیوەندیت پێوەنەبێ، بڕۆ چابهێنە!

شەقایق چاکەی هێنا، مەنوچەر بەمۆنی وتی:

- بۆچی بۆ خۆتت تێنەکرد؟! خێراکە بۆ خۆشت بێنە!

ئەو ڕۆژانەی کە هێشتا مەنوچەر ژنی نەهێنابوو وایدەزانی بەگەیشتنی بەشەقایق هەموو ئێشو ئازارو خەمەکان نامێنێت،

شەقایق تەنیا کەسێک بوو کە ئەو، لەدونیادا عاشقی بوو، بەڵام نەیدەزانی بۆچی لەگەڵ ئەو خۆشەویستییە زۆرەی کە بۆ شەقایق هەیبوو بڕیاری لەسەر زەماوەندی دوبارەدا، دڵنیابوو کە نەبونی منداڵ هۆی ئەمە نەبووە، ئەوەندە شەقایقی خۆشدەویست کە نەبونی منداڵ کاری نەدەکردە سەر خۆشەویستییەکەی، بەڵام بەتەواوی ئەو ڕۆژانەی کە بەخواستی ئەوانیتر ئارامی گرتبوو لەسەر زەماوەند، هێلکەی ڕقوکینە لەدڵیدا دروستبوو، هەرگیز عەهدیەی خۆش نەدەویست، عەهدیەی وەک بونەوەرێکی لەخۆبایی‌و خۆپەرست دەبینی کە هیچ نەبوو، بەڵام خۆی بەهەموو شتێک دەزانی.

تەنانەت لەدایکبونی لەیلاش، ئەوی بۆ ژیان لەگەڵ عەهدیەدا دڵگەرم نەکردبوو، ڕەفتاری عەهدیە جێگەی خۆراگری نەبوو، عەهدیە نموونەیەکی تەواوی ژنێکی لارو نامیهرەبان بوو، ئەوەندە گرنگی بەعەهدیە دەدا، ئەوەندە کاری بەشەقایقەوە نەبوو، بەڵام هێشتا عەهدیە ئیرەیی دەبرد.

کلیلی دەرگای حەوشی بوو، بەڵام ئەوەندە بێزاربوو کە زەنگەکە لێیدا، عەهدیە بەتەنێک مۆنیەوە دەرگاکەی کردەوە، نەسڵاو، نەشتێک بەبێ پێشەکی وتی:

- میوانمان هەیە.

مەنوچەر بەسەرسامییەوە:

- کێیە؟!

عەهدیە بەتانەلێدانەوە وتی:

- دایکتە!

مەنوچەر دڵی کرایەوە.

- تەنیایە؟ باوکم نییە لەگەڵیدا؟!

- چۆن! ئەویش هاتووە.

دوای سڵاو هەواڵپرسین، مەنوچەر پرسی:

- دایکە شتێک ڕویداوە لەم ناوە دەرکەوتن؟

نێرگس بێئەوەی وەڵامی بداتەوە بەهێواشی وتی:

- ژنەکەت چیەتی؟.. بۆچی مۆنی کردوە؟.. شەڕتانکردوە؟

مەنوچەر سەری باداو وتی:

- ئەم ژنە دۆڕاوە ئێوە بۆ منتان دۆزییەوە، ئەمە ڕەفتاری هەمیشەییەتی، تازە سەرەتایەتی، سوپاسی خوا بکە کە ڕێی پێدان بێنەژوورەوە!

نێرگس وتی:

- هەرچی دەپرسم شەقایق لەکوێیە وەڵامی سەر بەرەو ژوور دەداتەوە، وای... سەد ڕەحمەت لەو! لەگەڵ ئەوەی کە ئەو هەموو خراپەی لەئێمە بینیووە، خراپەی بەرامبەرمان نەکردوە.

عەهدیە لەلای دەرگای چێشتخانەکە وەستاو بەتوانجەوە:

- چییە دایکە؟ ئەگەر بێگانەم بڕۆمە دەرەوە، بۆچی چپە دەکەن.

مەنوچەر بێبایەخ وتی:

- قسەی تایبەتییە، هیچ پەیوەندیەکی بەتۆوە نییە!

عەهدیە وەکو ئەسفەنجێک بوو کە خرابێتە سەر ئاگر، بەتوڕەیی وتی:

- دەیبینی دایکە، دەبینی چۆن قسەم لەگەڵدا دەکات، هەر ناڵێی من ژنیم.

نێرگس قسەیەکی نەکرد، بەڵام لەدڵەوە وتی:

- تاوانی خۆتە، ئای چەند قسە دەکەیت.

عەهدیە بۆ ئامادەکردنی نانی ئێوارە جارێکیتر ڕۆیشتە چێشتخانەکەوە، مەنوچەر بەردەوام بوو، من منالّم بۆچی بوو؟.. ئێستا دەلّێی هێلکەی ئالّتونە! باشە کچە ئەگەر کوڕ بوایە ئەوا تەواو لەخۆی بایی دەبوو، وازی لێبێنین باوکم بۆچی خەوتووە؟!

- هیلاکبوو ڕۆیشت خەوت، باشە شەقایق چۆنە؟

مەنوچەر وتی:

- زۆر باش نییە، دایکە، تا لێرەی خۆت ببیە بۆلای پزیشک! من لەدەستی ئەم ژنە ناتوانم سەیری بکەم، چی بگات بەوەی ببیەم بۆلای پزیشک!

بەیانی شەقایق‌و نێرگس لەگەلّ پەروێزدا ڕۆیشتن بۆ لای پزیشک! عەهدیە خەریکبوو لەئێرەیدا دەتەقی، مەنوچەریش درەنگتر ڕۆیشت بۆ سەر ئیش، دەیزانی دوای ڕۆیشتنی دایک‌و باوکی ڕۆژگاری ڕەش دەبێت، لەدەستی ئەم ژنە حەسودە بەتەواوی گرفتاربوبوو.

نێرگس‌و شەقایق لەهۆلّەکە چاوەڕوانی ئەنجامی تاقیکردنەوەکە بوون، دانیشتبون، پەروێز ڕۆشتبوو لەفەبکرێت، شەقایق بێدەنگییەکەی شکاندو وتی:

- ئامۆژنەکان چۆنن باشن؟

نێرگس وتی:

ئیسماعیل‌و ئەعزەم بەدەستی کیومەرسەوە پیربون، سالّحیش گرفتاری باوکەگیانە! زۆر لەپێکەوتووە!.. چەند ڕۆژێک پێش ئێستا ڕۆیشتم بۆ بینینی دەزانی چی وت! دەیوت زۆر خراپەم

لەگەڵ شەقایقو مونیرەدا کرد، مونیرە خوا بیبەخشێت! بەڵام بەشەقایق بڵێ گەردنم ئازادبکات!

شەقایق وتی:

- ئەی فەرهاد چی؟

نێرگس وتی:

- ئۆو، ئۆو من ئەم عەهدیە وەک ژنەکەی فەرهاد دەبینم، قوڕبەسەر فەرهاد، لەبیرتە چەند وێڵبوو؟

ئێستا بووە بەنۆکەری ژنەکەی، ژنەکەی قاچێکی لەماڵ باوکێتی، ئەوەکەی تریش لەماڵ فەرهاد، لەبیرتە چەند لاوازبوو؟.. ئێستا وەک دێوی لێهاتووە! "نێرگس کەمێک وەستاو بەئاوازێکی خەماوی وتی:" تاوانی من بوو کە تۆ بەدبەخت بوویت، من بوم کە فشارم خستەسەر مەنوچەر عەهدیە بهێنێت.

شەقایق قسەکانی ئەوی بڕیو وتی:

- هەرچی بووە ڕابووردوە، بەڵام مەنوچەر ڕاستی دەکرد ژن بێنێت، عەهدیە ژنێکی باشە، ئەگەر من نەبم بەدڵنیاییەوە هەموو شتێک چاکدەبێت، بەڵام مەنوچەر ڕازینابێت تەڵاقم بدات!.. هێشتا.. هێشتاش وادەزانێ لەبیری سادقدام!

نێرگس هێواش وتی:

- بەڵام مەنوچەر تۆی خۆش دەوێت! بەڕاستمە شەقایق!

پەروێز لەفەی کڕیبوو، هەرسێکیان نانی نیوەڕۆیان لەهۆڵی نەخۆشخانەکە خوارد، مامە پەروێز وەک ئەو کاتانە قسەخۆشو قۆشمەچی بوو، بەڵام دەنگی پەرستیارەکە ناچاریکرد بێدەنگبن، پەرستیار وتی:

- خاتوو فیداییان تۆی؟

شەقایق وتی:

- بەڵێ، منم!

پەرستیارەکە وتی:

- وەڵامی تاقیکردنەوەکەت ئامادەیە دەتوانیت پیشانی پزیشکی بدەیت.

پەرویز هەستاو وتی:

- من دەڕۆم بۆلای پزیشکەکە، ئێوە نانەکەتان بخۆن!

پەرویز ڕۆشت نێرگس نیگەرانبوبوو، شەقایقیش زانی بەئاوازێکی میهرەبانی وتی:

- مەترسە ئامۆژن! بەمزوانە نامرم.

زۆری نەخایاند پەرویز گەڕایەوە بۆ لایان، دەموچاوی گۆڕابوو، نێرگس ڕۆیشتە پێشەوەو پرسی:

پزیشکەکە چی دەوت؟.. شەقایق چییەتی؟

پەرویز بەدەنگێکی بەرز پێکەنیو وتی:

- هیچ، تەنیا شەقایق تاماوەیەکیتر دەبێت بەدایک!

لەفەکەی دەستی شەقایق کەوتەسەر زەوی، متبوبوو، باوەڕینەدەکرد، بەدەنگێکی لەرزۆک وتی:

- مامە ڕاست دەکەیت؟!

- بەڵێ مامە گیان! ئەگەر دەتەوێت خۆت برۆ بۆلای پزیشک، ئەوەتا ژوورەکەی لەوێیە.

شەقایق سەرەتا خۆشحاڵبوو، بەڵام دوای ماوەیەک تازە هۆشی بەخۆیدا هاتەوە، ڕۆژگاری لەمەبەدواوە لەدەستدەچوو، عەهدیە! بیری ئەوەی نەکردبویەوە، نێرگس بەسەرسامییەوە:

- چی بووە شەقایق، بۆچی ماتی؟

شەقایق هێواش وتی:

- دڵم ڕۆیشت بۆلای عەهدیە، نەوەک..

نێرگس بەخۆشحاڵی وتی:

- مەترسە گیانەکەم، ئەویش خۆشحاڵ دەبێت!

شەقایق وتی:

- وای، ئامۆژن چەند سادەیە، دەڵێی هێشتا عەهدیەی نەناسیوە.

پەروێز وتی:

- کاتێک مەنوچەر هاتەوە، شتێک مەڵێن، دەبێت من شیرینیەکی باشی لێوەربگرم.

شەو عەهدیە دور لەشەقایقو نێرگسو پەروێز لەچێشتخانەکە دانیشتبوو، تەنانەت لەیلاشی لەگەڵ خۆیدا بردبووە چێشتخانەکە، لەیلا بەردەوام دەگریا، حەزیدەکرد لەلای ئەوان بێت، بەلام عەهدیە گرنگی بەگریانەکەی نەدەدا، مەنوچەر هاتەوە، نێرگس بەپێکەنینەوە:

- زوبە مژدانە بدە!

عەهدیە بەناچاری بۆ زانینی ئەو هەواڵە گرنگە کە نێرگس مژدانەی دەویست بۆی، چای تێکردو ڕۆیشتە ژوورەکەوە، نێرگس بەپێکەنینەوە وتی:

- ماوەیەکیتر شەقایق منالێکی بچوک دەهێنێتە دونیاوە، کچێک یان..

هێشتا قسەکانی نێرگس نەگەشتبووە کۆتایی کە دەنگی هاواری عەهدیە بەرزبووە، شەقایق دڵنیابوو کە شتێکی وا ڕودەدات، مەنوچەر بەتوڕەیی سەیری کردو بانگی کرد:

- چیتە، بۆچی هاواردەکەیت؟

عەهدیە وەکو بێگانەکان لەناوەڕاستی ژوورەکەدا بەشڵەژاوی هاواریدەکرد:

- بێچارە بوم.. تۆی خراپ، تۆی پیس، بەدبەختتکردم، تۆو ئەم ژنە حەرامزادەیە!پاشان ڕویکردە نێرگس‌و پەروێز وتی:

- هەواڵی خۆشتان بۆ هێنام؟! بڕۆن ونبن!

پەروێز بەتوڕەییەوە:

- عەهدیە، زۆر بێدەم بویت؟

مەنوچەر لەتوڕەیدا پەلاماریداو مستێکی توندی لەشانی دا، لەیلای بێچارە لەنێوان ئەو هەموو دەنگەدەنگەدا، دەیقیژاند، عەهدیە هاواریدەکردو دەینالاند.

شەقایق هەستاو بۆ پێشوازی لەعەهدیە بەرامبەر مەنوچەر وەستا، لەدڵەوە وتی:

- لێرەدا دەبێت سیاسەت بەکاربهێنیت، ئێستا نۆبەتی منە!

پاشان بەزیرەکی بەمەنوچەری وت:

- لێی مەدە، مەنوچەر گوناهە.

بەڵام مەنوچەر، بەتوڕەیی خستیەلاوەو بەمست‌و لەقە کەوتە گیانی عەهدیە، نێرگس‌و پەروێز هیچ کام بەردەمی مەنوچەریان نەگرت، دەڵێی، چێژیان لەلێدانی عەهدیە دەبرد، شەقایق کەوتە بیری ئەو زوڵمانەی کە عەهدیە بەرامبەری کردبوی لەگەڵ خۆیدا وتی:

- شایستەیەتی، ئێستا نۆرەی گریانی ئەوە.

مەنوچەر هاواریدەکرد:

- هیچم پێنەوتی هاربویت، پێشی دەمەکراوەکەی ناگرێت،

جوێن بەهەموو کەس دەدات! چییە؟.. خەریکی دەتەقیت؟
عەهدیە بێبایەخ هاواریکرد:
- خۆ دەتەویست زۆپاکە چاکبکەیتەوە؟
مەنوچەر بەتورەییەوە:
- وەرە! ئەمە منالەکەت، ئەمەش خۆت، گۆرت ونبکە! برۆ سبەینێ تەلاقت دەدەم، مارەییەکەشت کاش دەدەمێ، ئیتر چیت دەوێت؟
عەهدیە هەستاو بەقینەوە روبـەروی مەنوچەر وەستا، پێکەنینێکی تورەو درێژیکردو وتی:
- خۆت راگرە! بزانە منالت بۆ دەهێنێ، دوایی تەلاقم بدە.
مەنوچەریش وەک ئەو پێکەنینێکی درێژی کردو وتی:
- نەشیهێنێ گرنگ نییە، تەنیا تۆ نەبیت هەموو شتێک باش دەبێت.
عەهدیە وتی:
- هەڵەتێگەشتی، ئەگەر وابیرت کردوەتەوە تەلاقوەردەگرم، هەڵەتێگەشتوی!.. باوکت دەردەێنم، گێل!.. عەهدیە هەر ئەو شەوە رۆیشت، لەیلا لەسوچی ژوورەکە متبوو، مەنوچەر بەرەو لای رۆیشت، دڵی بەحاڵی دەسوتا، کچی بێچارە لەمەنوچەر دەترسـا، شەقایق رۆیشتە پێشەوەو لـەیلای گرتـەباوەش، ماڵەکە لەبێدەنگییەکی قورسدا نوقم بوبوو، مەنوچەر لەماڵ چووەدەرەوە، بەڵام زۆری نەخایاند کە بەپاکەتێک شیرینیەوە گەڕایەوە، ئەوەندە لەو هەواڵە خۆشحاڵبوو کە هەموو شتێکی زۆر زوو لەبیرکرد، لەیلا بەچاوانێکی سەرسامەوە ئەبڵەقی بوو، لەوانەیە لەگەڵ خۆیدا بیریدەکردەوە کە ئەو چەند شێتە.

لەیلا زۆر نائارام بوو، نێرگس بێزاربوبوو، شەقایق منداڵەکەی لێسەندو خەواندی، مەنوچەر بێقەرارتر لەهەموو شەوەکان چاوی بڕیبووە شەقایق، باوەڕینەدەکرد کە خەریکە دەبێتە دایک، خۆشی باوک، باوکی منداڵی شەقایق! ئێستا بەڕاستی دەیتوانی هەست بەوە بکات مێردی شەقایقە، تا بەر لەمە وابیری دەکردەوە کە شەقایق تەنیا هاوزمانو هاودەردێکەبۆی، کە کاتی هیلاکی ئارامی پێ دەبەخشێت، بەڵام ئێستا منداڵێک لەسکی شەقایقدا بوو کە پەیوەستبوو بەئەوەوە.

بەیانی مەنوچەر زوتر لەخەو هەستا، دەیویست وەک ئەو کاتانە خۆی نانی بەیانی دروستبکات، کاتێک لەنانەوا گەڕایەوە کەس لەخەو هەڵنەسابوو، چاکەی خستەسەر، خوانەکەی داخست، ڕۆیشت لەلای شەقایق دانیشت، دەموچاوی چەند بێتاوان‌و بچووک بوو، پێی نەدەهات کە بیست‌و سێساڵە بێت، خۆی هێشتا منداڵ بوو ئەو کاتە دەیویست منالی بێت، شەقایق جوڵاو بەرەو لایەکی تر سوڕا.

مەنوچەر ئارامی نەگرت، هێواش بانگی کرد، شەقایق چاوی کردەوەو مەنوچەری بینی، سەیری کاتژمێرەکەی کردو وتی:

- دوا دەکەویت ها!

مەنوچەر زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- ناتەوێت نانی بەیانی بخۆیت؟!

شەقایق هەستا ڕۆیشتە چێشتخانەکە، مەنوچەر لەلای دەرگاکە وەستابوو سەیری دەکرد، شەقایق وتی:

- خۆ تۆ نانی بەیانیت ئامادە کردووە؟

مەنوچەر سەیرێکی ژوورەکەی کردو وتی:

- دەمەویٚ بەتەواوی بتکەم بەبیانوگر، ئەوەندە کە لەدەستی بیانوەکانت هیلاک ببم.

شەقایق پێکەنینێکی کردو وتی:

- من خۆم بیانووگربم، وای بەحاڵی مناڵەکەمان.. .. !

دەنگی دەرگا بەرزبووە، مەنوچەر بەسەرسامییەوە:

- کێیە، بەم بەیانییە؟!

شەقایق بەترسەوە:

نەوەکو عەهدیە شتێکی..

مەنوچەر قسەکەی پێبڕیو وتی:

- ئەها! خۆیەتی هێشتا ڕۆژ نەبووەتەوە هات.

قسەکەی مەنوچەر ڕاست دەرچوو، عەهدیە لەگەڵ دایکو باوکیدا لەپشتی دەرگاکەوە بوون، نێرگسو پەروێزیش لەخەو هەستان، دەموچاوی عەهدیە شینو مۆر بوبووە، مەنوچەر بێگرنگیدان وتی:

- چی بووە، سەرەتای بەیانی هاتون بۆ ئێرە؟

باوکی عەهدیە وتی:

- بە ناسەلامەتی لەجێگەی باوکی تۆدام!

مەنوچەر قسەکەی بڕیو بەتوڕەیی وتی:

- چۆن من دەبێت گەورەو بچووک پەیڕەوبکەم، بەلاّم ئەم کچە بێهەستەت کەمێکیش پەروەردە نەکراوە، بەجۆرێک قسە لەگەڵ باوکمدا دەکات کە دەڵێی ئەو بەندەی خوایە نۆکەریەتی.

دایکی عەهدیە وتی:

- ئێستا مەگەر چی بووە؟

مەنوچەر وتی:

- هیچ خانم، هیلاکبوم لەدەست کچەکەت، ئیتر تاقەتیم نەماوە، بیبەنەوە لەم ڕۆژانەدا دێم تەلاقی دەدەم.

عەهدیە قسەیەکی نەکرد، وەک هەتیوی دایکمردوو لەگۆشەی حەوشەکە بەکزی دانیشتبوو، بەکورتی بەدەستتێخستنی پەروێزو نێرگس مەنوچەر بەخشی، ئەوکاتەی کە باوکو دایکی عەهدیە ڕۆیشتنەوە مەنوچەر وتی:

- بەلام وای بەحاڵت ئەگەر دوبارە دەست پێبکاتەوە! دەیبەخشم بەمەرجێک کاری شەقایقەوە نەبێت!

شەقایق لەرویەکەوە تورەبوو لەگەڕانەوەی، لەروییەکی ترەوە بەزەیی پێدادەهاتەوە، خێزانەکەی عەهدیە هەژارو بێچارەبوون، ئەگەر کاتێک عەهدیە ناچار بەتەلاق بکرایە بێگومان باوکی دەیکوشت.

- باوکە! تا لەکەرەجی وەرە خانویەک بکڕین، هەم نزیکدەبینەوە، هەم ئەوەی کە خەیاڵم لەبارەی شەقایقەوە ئاسودەبێت.

پەروێز وتی:

- بەڕێکەوت خۆمانیش لەبیری ئەوەدا بوین، بەلام وتمان لەوانەیە ببینە هۆی ژانەسەر.

مەنوچەر وتی:

- باوکە توخوا ئەم قسەیە مەکە! مەگەر من جگە لەئێوە کەسێکی ترم هەیە، لەدونیادا تەنیا تۆو دایکم بۆ ماوەتەوە.

پەروێز وتی:

- لەگوێتدا بێت، خانویەکی باشت دۆزییەوە ئاگادارمان بکەرەوە! ئێمەش لەبیری فرۆشتنی خانوەکەدایین، ئەو عەهدیەی

كە من ئەمشەوە بینیم، تاژەهرەكەی نەكات بەسەر شەقایقدا واز ناهێنێت.

كڕینی خانوو گوێزانەوەی كەلوپەل مانگێكی خایاند شەقایق حاڵێكی باشی نەبوو، پزیشك پێی وتبوو لەماوی سكپڕیدا دەبێت پشوبدات، لەبەرئەمە شەقایق ڕۆیشت بۆ ماڵی نێرگس، عەهدیە هەموو ڕۆژێك دەستی بەنزا بەرزدەكردەوە تاوەكو مناڵەكەی شەقایق بەزیندویی لەدایكنەبێت، ئەگەر شەقایق لەوێ بمایەتەوە هەر شتێكی دەكرد، بەڵام كاتێك شەقایق ڕۆیشت دەستی كورتبووە، مەنوچەر لەترسی ئەو زۆر نەدەڕۆشت بۆ بینینی شەقایق، ئەگینا عەهدیە باش دەیزانی كە دڵی مەنوچەر بۆ شەقایق باڵلێدەدات، بەڕاستیش هەروابوو، دڵی مەنوچەر لەلای شەقایق بوو، شەو بەخەیاڵی ئەوەوە دەخەوتو بەیانی بەهیوای ئەوەوە لەخەو هەڵدەستا، لەماڵەكەی خۆیدا جگە لەساردیو دوری هیچیتر بەدی نەدەكرا، عەهدیە، ئەو ڕەفتارە تاڵەی ڕابردوی گرتوەبەر، ئەوەندە بێبایەخ بوبوو لەلایەن مەنوچەرەوە كە ئیتر مەنوچەر هیچ كارێكی پێنەبوو، شەقایق مانگی كۆتایی بوو، دڵی مەنوچەر بەهەموو دەنگێك دەكەوتەخوارەوە، مۆڵەتی وەردەگرتو لەشوێنی ئیشەكەوە دەڕۆیشت بۆلای شەقایق، شەقایق قەڵەوبوبوو، بەڵام جوانتر، چونكە پێشتر زۆر لاوازبوو.

لەسەرەتای شەوەوە مەنوچەر دڵخورتێی هەبوو، شەو دەنگی دەرگا بەرزبووە، بەخەبەربوو دەڵێی ئیلهام درابوو، پەروێز بوو، مەنوچەر بەترسەوە وتی:

- چی بووە باوكە؟.. شەقایق..

پەروێز دەستی خستەسەر شانیو بەئارامی وتی:

- مەترسە!.. کوڕم شتێک نەبووە، وەک ئەوەی شەقایق حاڵی باش نییە، دایکت وتی کە بۆ پاریز بێم بەشوێندا، واباشترە ئەمشەو بیگەیەنینە نەخۆشخانە، بڕۆ خۆت ئامادەبکە!

مەنوچەر بەشڵەژاوی بەرەو ژوورەکە ڕۆیشت، خێرا جلەکانی لەبەرکرد، عەهدیە بێخواست ڕۆیشتە سەر جێگەکەیو خەوت، نێرگس ڕاستی دەکرد، کاتی هاتبوو مەنوچەر لەلای گوێیدا وتی:

- لەکۆتایدا خەریکە دەگەین بەئارەزوەکەمان.

شەقایق لەنێوان ئێشدا وتی:

- خۆ تۆ پێشتر بەئارەزوەکەت گەشتی!

مەنوچەر دەستی بەئارامی گرتو وتی:

- من منالی تۆم دەوێت، نەک منداڵی ئەو ژنە لەخۆرازییە، تەنیا بەڵێنبدە لەژووری نەشتەرگەری بەساغو سەلامەت بێیتە دەرەوە!

کاتێک گەیشتنە نەخۆشخانەکە، ئێشی شەقایق زیادیکردبوو، هاواریدەکردو ناوی مونیرەی دەهێنا.

تەواوی نەخۆشخانەکەی، بەدەنگی هاوارەکانی شەقایق دەستیان بەپاڕانەوە بەرزکردەوە.

مەنوچەر لەخەڵوەتیدا دەگریا، پەروێز سەدجار بەپلەکانەکەدا هاتبووە خوارەوەو ئەرۆیشتە سەرەوە، بەڵام نێرگس بەخوێنساردی، دوعای پاڕانەوەی دەخوێند.

دوو کاتژمێر تێپەڕی، مەنوچەر ئیتر توانای گریانیشی نەبوو، سەری دەدا بەدیوارەکەداو لەژێر لێوەوە دەیوت:

- تو خودا تاقەت بگرە!

دەرگا کرایەوە، مەنوچەر وەک هەورەبروسکە لەشوێنی خۆی بەرزبووە، دڵی بەتوندی لێی دەدا، هەناسەیەکی لەسینگیدا حەپس کردو، چاوی لەدەمی پزیشکەکە بوو.

- کارەکە تەواو سەختبوو، بەڵام خۆشبەختانە هەم منداڵەکە، هەم دایکی سەلامەتن.

نێرگس خێرا وتی:

- منالّەکە ساخو سەلامەتە؟

پزیشکەکە دەستی خستە سەرشانی مەنوچەر وتی:

کورێکی جوانو چەتون! بەڵام ژنەکەت زۆری ئازار کێشا، دەبێت چەند ڕۆژێک لەنەخۆشخانە لەژێر چاودێریدا بێت.

شەقایق بەڕەنگپەڕیوی لەژوورەکە خەوتبوو، دەموچاوی تەڕبوو لەئارەقدا، مەنوچەر لەلایدا لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشت، دەستیکرد بەناو قژە تێک خواردوەکەی شەقایقداو بەئارامی گریا، دەستی لاوازی ئەوی خستە ناو دەستی خۆیی‌و بەئارامی گۆنای وشارد.

هەموو یادگاریەکانی وەک فلیمێک لەبەرچاوی دەرکەوت، بەیادگارییە خۆشەکان پێکەنی‌و بەیادگارییە تاڵەکانیش غەمباربوو، دەنگی پەرستیارەکە لەجێگەی خۆی جولاندی.

نەخۆشەکەمان هۆشی نەهاتوەتە لای خۆی؟

مەنوچەر هێواش وتی:

- نەخێر.

پەرستیارەکە بەسەرسامییەوە:

- هێشتا بێهۆشە؟!

پاشان هاتە لای شەقایقو چەند زلەیەکیٚ توندی لەرومەتی دا، مەنوچەر ماتبوبوو، دەنگێک وەک ناڵە لەگەروی شەقایق هاتەدەرەوە:

- دایکە.. !

پەرستیارەکە لاچوو، مەنوچەر بۆ لای شەقایق ڕۆیشت، دەستی ئەوی گرتو بەدەنگێکی لەرزۆک وتی:

- شەقایق گیان، هەستە!

شەقایق چاوە هیلاکەکانی بڕییە دەموچاوی نیگەرانو پەرێشانی مەنوچەرو بەهەمان دەنگ هێواش وتی:

- مناڵەکە مرد؟

مەنوچەر بەبزەوە ئەبڵەقی بوو، وتی:

- نە!.. ساغو سەلامەتە، دەڵێی دایکە تەمەڵەکەیەتی، ئێستا خەوتووە.

شەقایق هێواش وتی:

- دەمەوێت بیبینم.

پەرستیارەکە هاتەپێشەوەو وتی:

- کەواتە هەستە، هەستە دابنیشە، مناڵەکە ئەگەر بەم حاڵەوە بتبینێ دەترسێت، دایکی بێحاڵ!

شەقایق بەداماوی گریاو بەشێوەیەکی ئاڵۆز وتی:

- ناتوانم!

پەرستیارەکە وتی:

- وای، چەند مەکرباز! هەستە بزانم.

پزیشکەکە هاتەژوورەوە، بەئاوازێکی جیدی بەپەرستیارەکەی وت:

- وازی لێبێنە، خاتو موصەمەدی! حاڵی باش نییە.

پەرستیارەکە بەشەرمەزارییەوە:

- بمبەخشە، بەلاّم بیانوی مناڵەکەی دەگرێت.

شەقایق قۆڵی مەنوچەری گرتو وەک مناڵە چەتونەکان وتی:

- توخوا بیهێنە، دەمەوێت بیبینم.

پزیشکەکە بەپەرستیارەکەی وت:

برۆ مناڵی خاتوو فەدائیان بهێنە، تا منداڵەکەی نەبینێت خەیاڵی ئاسودە نابێت.

پەرستیارەکە لەژوورەکە چـووەدەرەوە، پزیشکەکە خۆی گەیاندە قەرەوێڵەیەکیتر، سەرقاڵی قسەکردنبوو لەگەڵ نەخۆشی ئەو قەرەوێڵەدا، مەنوچەر ئارام بەرەو لای ڕۆیشت بەئاوازێک کە نیگەرانی تێیدا شەپۆلی دەدا وتی:

- دکتۆر.. حاڵی شەقایق زۆر خراپە؟

پزیشکەکە سەیرێکی مەنوچەری کردو بەئاوازێکی باوکانە وتی:

- ناوی شەقایقە؟!

- بەڵێ.

پزیشکەکە لەکاتێکدا سەیری دەفتەرەکەی دەکرد، وتی:

- حاڵی باشە، بەلاّم لاوازە، وادیارە ناڕەحەتی دەرونیشی هەبێت، سەیرە بەهەبونی مێردێکی باشی وەک تۆ، بۆچی دەبێت ئەوەندە ناڕەحەت بێت؟.. لەژووری نەشتەرگەری تەنیا قسەی لەمردن دەکرد، زۆرتر چاودێری بکە.

مەنوچەر ئاهێکی هەڵکێشاو لەگەڵ خۆیدا وتی:

- ئاخ دکتۆر، تۆچی دەزانـی، چی لەدڵی منی بەدبەختدا

تێپەڕدەبێت.

نێرگس‌و پەروێز هاتنەژوورەوە، نێرگس بەهێواشی پرسی:

- حاڵی باشە؟

شەقایق لەناکاو چاوی کردەوەو بەمەنوچەری وت:

- مناڵەکەیان هێنا؟

پەروێز ڕۆیشتە لای شەقایق‌و دەستی خستەسەر تەوێڵی‌و بەمیهرەبانی وتی:

- پیرۆزت بێت، شەقایق گیان!

پەرستیارەکە هاتەژوورەوە، نێرگس فرمێسکی خۆشی دەڕشت، ڕەنگ‌و ڕوی شەقایق بەبینینی مناڵەکە کرایەوە.

مەنوچەر بەخۆشییەکی منالانە وتی:

- دایکە، سەیریکە، چەند بچوکە!

پەروێز وتی:

- ئێستا باشە مناڵی دوەمییەتی، ها!

مەنوچەر بێبایەخ وتی:

- وادەزانم تازە بومەتە باوک.

نێرگس بەخۆشیەکی بێئەندازەوە وتی:

لەبیرتە لەیلا کاتێک لەدایکبوو چەند سور بوو؟.. بەڵام ئەم منداڵە چەند سپییە،چەند بچوک؟. پەروێز، مەنوچەر ڕاست دەکات!

شەقایق بەڕاستی خۆشحاڵبوو، واهەستی دەکرد هێزێکی سەیر لەلەشیدا دروست بووە.

عەهدیە لەگۆشەی ژوورەکە بەکزی دانیشتبوو دەگریا، لەیلا سەرقاڵی یاریکردن بوو، سەعیدەش تەواوی ژوورەکەی

تێدەپەڕاند، عەهدیە بێدەنگییەکەی شکاندو بەگریانەوە وتی:

- دەبینی، دەبینی خوشکە چەند بەدبەختم، دەیانوت کچەکە ناتوانێت منداڵی بێت، ئێستا کوڕێکی بوو، قوڕ بەسەر بەختی ڕەشی من، ئەگەر منیش کوڕێکم بوایە لەوانەیە ئەوەندە بێرێز نەبومایە.

سەعیدە وتی:

- وای، مەگەر ئێستا درەنگە؟.. تۆش کوڕێک بهێنە!.. خوشکە گیان بەمجۆرە تۆ دەڵێی بەو حاڵو ڕۆژەوە ناتوانێت شیربدات بەمناڵەکە، کاتێک مەنوچەر بکەوێتە پارە خەرجکردنەوە.. کاتێک ناچاربێت هەموو ڕۆژێک بڕوات شیری وشکی ئەوەندە قیمەت بکڕێت دڵنیابە دەستم دەم لەکچە دێنێتە دواوە.

سەعیدە ماوەیەک بێدەنگبوو پاشان بەشێوەیەکی گاڵتەئامێز وتی:

- ناویان ناوە چی؟

عەهدیە وتی:

هەینی وابڕیارە نانی نیوەڕۆ بدات؟ دەڵێت دەیەوێت جەژن بگرێت!

پاشان بەتوڕەیی وتی:

- ڕێوڕەسمی ناونانی مناڵەکەیەتی.. ها، کەی ئەم ئیشانەی بۆ لەیلا کرد، مەڕێکی سەربڕیو ئەویشی دابەشکرد بەسەر هەژاراندا هیچی لەو گۆشتە دانەنا بۆ من کە مناڵم بوبوو.

بۆشایی ساردو بێگیانی ماڵەکە دوبارە گەرمو خۆشبووە، سەرتاسەری حەوشەکە بەگڵۆپی ڕەنگاورەنگ ڕازابووە، گوڵدانە غەمبارەکان ئێستا لای حەوزەکە بونو بۆنی تازەیان لێدەهات.

حەوشەکە گسکدرابوو، لەناوەڕاستی حەوزە خاڵیەکەی ئەو ڕۆژانـە، سێ ماسی سور مەلەیان دەکرد، دەنگەدەنگی منداڵەکان خۆشیو چالاکی دروست دەکردو ژیانی مەنوچەری دەڕازاندەوە، میوانەکان دەستەدەستە دەهاتن، تەنانەت باوکە گیانیش هاتبوو، شەقایق خۆشحاڵبوو، کەوتەبیری حەوشە قەرەباڵغەکەی خۆیان، بیروەری منداڵی، کاتێک کیومەرسو فەرهاد دەکەوتنە یەکو ماڵەکەیان بەدوو کەسی دەخستەسەر شانیان.

دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ لەکۆتایدا باوکە گیان بەپەروێزی وت:

- باشە لەکۆتایدا ناوی کوڕەزاکەت چییە؟

پەروێز سەیرێکی کۆمەڵەکەی کردو وتی:

ڕاستیەکەی نەمدەویست بەشداری بکەم لەناونانداو لەبەرئەمە بەراوێژکردنی مەنوچەر ناوی منالەکەمان ناوە "ئارەش".

باوکەگیان بەپێکەنینەوە وتی:

- وەک ئارەشی کەمانگیر، هەمیشە بەهێزو خۆشەویست بێت!

لەژوورەکەی پاڵدەستا، ئەعزەم دانیشتنەکەی بەگاڵتەوگەپ گەرمکردبوو، باسی یادگارییەکانی ڕابردوی دەکرد، تەنانەت میوانە بێگانەکانیش بەقسە خۆشەکانی قاقا پێدەکەنین، بەڵام عەهدیە متبوبوو، هیچی نەدەکرد، شەقایق هەستێکی سەیری هەبوو، لەناکاو کەوتە بیری سادق.

منالەکە دەگریا، شەقایق نەیدەزانی چاودێری منالەکە بکات، خۆی حالێکی باشی نەبوو، پێویستی بەچاودێری بوو،

نێرگس بەدڵو گیان ڕازیبوو پەرستیاریی ئارەش بکات، زۆری خۆشدەویست، ئارەش منداڵێک بوو دەچووەدڵەوە، دەموچاوی بێتاوانو جوانی لەمەنوچەری دەکرد، جگە لەوەی کە چاوەکانی سەوز بوو، وەک بلێسەی ئاگر دەدرەوشایەوە، مەنوچەریش دڵبەستەی ئـارەش بـوو، ئـەوەنـدە کە هەندێکجار شەقایقی لەبیردەکردو شەوان تا کاتێکی درەنگ بۆ بینینی ئارەش لای نێرگس دەمـایـەوە، هەندێکجاریش نێرگس، ئارەشی دەهێنا بۆلای شەقایق، چونکە مەنوچەر نەیدەویست شەقایق بیانوی منالەکە بگرێت.

ڕەوشتی عەهدیە سـەدو هەشتا پلە گۆڕا بـوو، میهرەبان بوبـوو، تەنانەت داوای ئارەشیشی دەکـرد، مەنوچەریشی ڕازیبوو، وەک ئەوەی بڕیاربوو، سەختیەکان لابچێت، سوپاسی خوای دەکرد ئەویش ڕەفتارێکی باشی گرتبوەبەر.

سڵاو دایکە!

نێرگس بەسەرسامی چاوی بڕییە مەنوچەر، غەمبارو گیراو بوو، وادەردەکەوت نەخۆش بێت.

- چی بووە مەنوچەر گیان! نەخۆشی؟

مەنوچەر ئاهێکی درێژی هەڵکێشاو وتی:

- نە دایکە، هیلاکم، ئارەش لەکوێیە؟

خـەوتـوە! "نێرگس دوبـارە بەنیگەرانی پرسی:" چی بووە مەنوچەر نەوەک نەخۆش بیت؟

مەنوچەر پێکەنیو وتی:

- مانگاکەم زاوە دایکە، عەهدیە سکی پڕە.

نێرگس لەکاتێکدا هەڵدەستا بەتوڕەیی وتی:

ئاخر کوڕ تۆ منالّت بۆ چی بوو؟.. مەگەر شێتی؟.. لەم دوانە داماویتەتەوە، تازە شەقایق خۆی لەمنالّەکە خراپترە، بەخوا خەرجی زۆرترە! بەردەوام نەخۆشە.. توانای نییە قسەبکات، ئەو کیلۆیەش کە قەلّەو بووە هینی ئارەش بوو، نازانم خۆزگە دەمردمو ئەم ڕۆژانەم نەدەبینی.

بێخودو بێهۆ ڕۆشتم هەوێم هێنایە سەر شەقایق، خۆزگە ئارامم بگرتایە بزانم چی دەبێت، ها، تا پزیشکەکە وتی بوکەکەت واو وایە، پەلە هەلّی گرتمو ڕۆیشتم بۆلای بوکی تازە، ئەویش چ بوکێک، ئەو ڕۆژی داواکردنە ئەوەندە مەزلّوم دەردەکەوت کە هەرکەس نەزانێت وایدەزانی ئەستەغفیرولّلا کچی پێغەمبەرە، بەلاّم ئێستا وەک سەگ لەهەموو کەس دەوەڕێت..

مەنوچەر جلّەوی قسەکردنی گرتەدەستو بەتوڕەیی وتی:

ئێستا ئەوەندە فرەبێژە کە مەلّێ، بۆنی گولّ لەمێشکی دەدات، چوار کاتژمێر خۆی دەکاتە ئێشو ئازار چێژە ئیتر نەخەوم هەیە، نەخۆراک، تازە لەیلاشی هەیە.

نێرگس وتی:

ئێستا لەیلا گەورەیە، سێ- چوار سالاّنە، بیدە بەشەقایق لەلای خۆی دایبنێت، ئەو جارە شەقایق دەیوت کە عەهدیە دەزانێ لەبەرچاوم لەمنالّ بدرێت دلّم دەبێت بەکەباب، ئەو لەیلای هێناوەتە حەوش، دەلێی بدە، وتی ڕۆیشتم منالّەکەم هێنا بۆ ژوورەکەی خۆم سەیردەکەم لەشی منالّەکە پەلّەپەلّەی شین بوو، ڕاست دەکات شەقایق، ئەو ئەوەندە تەمەلّە، تامنالّەکە دەلّێت چێشت دەخۆم، دەستدەکات بەلێدانی، ئەو جارە خۆم بینیم لەیلا خەریکبوو لەحەوشەکە یاری دەکرد من لەنانەوا

گەڕامەوە پارچەیەک نانم دایە دەست ئەو منالّە، وادەیخوارد کە دەلّێی دوو سەدەیە چێشتی نەخواردوە!

مەنوچەر سەرێکی پەرۆشی باداو بەگالّتەوە وتی:

- هێشتا چیت بینیوە، بەخودا هەندێکجار خۆرئاوا دەڕۆمەوە بۆ مـالّ سـەیردەکـەم جێگەی خـەو هێشتا لانـەبـراوە، پێی دەلّێم بۆچی کۆتنەکردونەتەوە، بەتـەواوی ڕوداری دەلّێت، کۆمنەکردوەتەوەو ئیتر، ئێستا دەبێت سەر بخەینە زەوی‌و بخەوین، ئای چەند تەمەلّە! دایکە بەخوا لەبەر تۆیە دەنگم دەرناچێت، هەندێکجار خۆم جلی خۆم دەشۆم، چییە؟.. خانم منالّێکی هەیە! تازە دەلّێت دایکت شەوێک لەیلای لای خۆی دانەنا، ئەوکات بووە بەدایە بۆ ئارەش، مەگەر شازادەکەت بێ دەست‌و قاچە؟!

مەنوچەر ئاهێکی هەلّکێشاو وتی:

هیچکات ئەمانەم پێ نەوتوی، بەلاّم دایکە ئەوەندە کە ستەمم لەشەقایق کردوە، خراپەم لەگەلّ هیچ کەس نەکردوە، ئێوە واتاندەزانی کە ئەو ڕۆژانەی تازە هاتبوینە کەرەج، چیرۆکی دلّداریمان بۆ یەک باسدەکرد، نە دایکە، هەر شەوی یەکەم بەجۆرێک لەشەقایقم دا کە هێشتا دەنگی هاوارو پاڕانەوەکانی لەگوێمدا دەزرنگێنەوە، لەو دوو مانەگەدا جارێک ڕەفتاری باشم لەگەلّیدا نەنواند، وەکو کەنیزێکی بەزۆر کڕاو فەرمانم بەسەردا دەدا.

کات‌و بێکات زلەیەکم لەبن گوێی دەدا، ئەو کاتە ئەم ژنە لەبەر ئەو لێدانەی کە بەڕاستی لێیدرا، هێشتا سەرزەنشتم دەکات.

ئـارەش جـولاو لەخەو هەستا، تـازە وردەوردە گاوڵکەی دەکرد دەبینی مەنوچەر پێکەنینێکی شیرینی خستەسەر لێوی‌و هەستا، نێرگس زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

– واباشترە ئیتر ئـارەش بێت بـۆلای خۆتان، ئەگەر خوو بەمنەوە بگرێت وادەزانێت من دایکیم، منالْ دەبێت لەگەڵ دایکی خۆیدا بێت! جگە لەوە تۆ زۆر ناز بەشەقایق دەدەیت.

مەنوچەر ماچێکی گۆنای ئارەشی کردو وتی:

– باشە، هەر ئەمشەو دەیبەم.

عەهدیە بەدەموچاوێکی شڵەژاوو مۆن لەپشت پەنجەرەکەوە چاوەڕێی مەنوچەربوو، هەرکە دەرگاکە کرایـەوەو چاوی بەئارەش کەوت، بەتوڕەیی لەژێر لێوەوە بۆلاندی:

– ئەم منالەی بۆچی هێناوە؟

مەنوچەر خێرا بـەرەو لای ژوورەکـەی شەقایق ڕۆیشت، عەهدیە هەروا بۆلاندی کە:

ئا، بۆچی ڕۆشت بۆ ئەویّ، بەە، بەە، زۆر باشە، ئێستا تێی دەگەیەنم.

شەقایق لەکونجی ژوورەکـە دانیشتبوو بەبینینی ئارەش کە لەباوەشی مەنوچەردا پێدەکەنی، لەناکاو لەشوێنی خۆی بەرزبووە، بەخۆشحاڵی وتی:

– ئا.. .. ئارەش لێرە چی دەکات؟!

مەنوچەر وتی:

– هێنام لەلای دایکی بمێنێتەوە!

شەقایق ئارەشی لـەباوەش گـرت، دەنگی منالانەی لەیلا سەرنجی مەنوچەری بۆلای پەنجەرەکە ڕاکێشاو بەرەو لای

پەنجەرەکە ڕۆیشتو کردیەوە، شەقایق بەسەرسامی لەلایدا وەستا، مەنوچەر وتی:

- چی بووە لەیلا؟

لەیلا بەهەمان ئاوازی منالانە وتی:

- باوکە، دایکم حالی خراپە.

مەنوچەر قسەیەکی نەکرد، پەنجەرەکەی داخستو بەتوڕەیی لەژوورەکە ڕۆشتەدەرەوە.

شەقایق بێبایەخ ئارەشی لەباوەش دەگرتو ماچی دەکرد.

عەهدیە ڕۆژانــی دوایـی سکپڕییەکەی تێدەپەڕاند.. لەم ماوەیەدا سۆراخێک نەبوو لەمەنوچەر، بەتەواوی گرفتاری عەهدیە بوو، بەلام شەقایق زۆریش ناڕازی نەبوو، ئاراش وردە وردە قسەی دەکرد.. بەدەنگێکی دڵ نەواز دەیوت:

- دایکە.

ئاکام عەهدیە منالی بوو، منداڵەکە کوڕبوو، لەگەڵ ئەوەی کە هێشتا ئێشی منال لەدایکبون لەلەشی نەڕۆشتبووەدەرەوە، زۆر خۆشحالبوو، بەپێچەوانەوە نێرگس هیچ هەستێکی نەبوو، دوای لەیلاش نەیناسیبوو، بەلام ئێستا فریوی زمانی چەورو نەرمی ئەوی نەدەخوارد دایکو باوکی عەهدیە واتە هەموو بنەماڵەکەی لەتاران بون‌و کەسێک نەبوو بێجگە لەنێرگس کە پەرستیاری بکات، عەهدیە باش دەیزانی کە دایکی بەو هەموو گرفتاریەشەوە نایەت بۆ یارمەتیدانی.

نێرگس ڕۆشتبوەوە بۆ ماڵو بەپاڕانەوە شەقایقی ڕازیکرد بوو کە پەرستیاری عەهدیە بکات، منالی دوەمی عەهدیەش زۆر سور بوو، چاوەکانی دەلێی دەقکرابوون، لێو دەمی کراوەو

گەورە، سەد ڕەحمەت لەلەیلا، ئەو جوانتربوو لەئەم، بەڵام ئەم دانەیە هەر جوان نەبوو، مەنوچەر حەزی نەدەکرد سەیری دەموچاوی منداڵەکەی خۆی بکات، لەبەرخۆیەوە:

- بۆچی منداڵەکان هەر لەخۆی دەکەن؟.. ڕەش‌و ناشرین!

عەهدیە تەواو بێتامی کردبوو، هەر ئاه و ناڵەی بوو کە من نەخۆشم، توانام نییە بجوڵێم، وای پشتم.. وای دڵم.

کە مەنوچەر لای دادەنیشت حاڵی باش دەبوو، منداڵەکەی بەزۆر دەکردە باوەشی.

- سەیریکە کوڕەکەت چەند جوانە! ناوی بنێین چی؟

شەقایق لەچێشتخانەکە خەریکی سەیرکردنی عەهدیەو مەنوچەر بوو، تاوەکو ئێستا بەتەنیشت یەکەوە نەیبینی بوون، عەهدیە بەگێژی خۆی خستبووە باوەشی مەنوچەر.

- بیڵێ ئیتر مەنوچەر، ناوی بنێین چی؟

مەنوچەر بزەیەکی خستەسەر لێوی‌و وتی:

- یانی تۆ نازانیت ناوی ئەم منداڵە چییە؟!

عەهدیە سەرسامانە پرسی:

- مەگەر منداڵ ناوی هەیە؟!

مەنوچەر لەکاتێکدا پێدەکەنی وتی:

باشە دیارە، دەبێت ناوی بنێین حاجی فەیروز ئیتر! نایبینی چەند ڕەشە، تەنیا جلێکی سورو تەپڵێکی دەوێت.

عەهدیە مۆنەی کردو بەشێوەی تۆران وتی:

- چییەتی منداڵەکەم، بەد سەلیقە!"پاشان بەشێوەی گاڵتە وتی"

- وەکو شیر برنجە؟! ئەویش وەکو ماستە!

مەنوچەر لەلای هەستاو بەئاوازێکە جیدی وتی:

- ناوی دەنەین مەسعود، هەر ئەوەی کە دایکم دەیویست.

عەهدیە مەسعودی گرتەباوەش و لەکاتێکدا سەیرێکی دایکانەی کردو وتی:

- مەنوچەرو مەسعود چەند بەیەکەوە دەگونجێن.

مەنوچەر توخوا داوای ئەمەم لێمەکە، تو گیانی مەسعودت، ئارەش هەیە، ئەمکارە ئیتر مەکە!

مەنوچەر بەداماوی بەرەو لای ئەو سوڕاو وتی:

شەقایق تو قورئان، مەڵێ نە! سوێند بەخوا هەفتەیەکە خەریکم لێی دەدەم، ئیتر هیلاک بوم، توخوا، تۆ ئیتر ئازارم مەدە! بەڵێندەدەم هەموو شەوێک بیهێنم بیبینیت.

شەقایق لەکاتێکدا دەگریا، وتی:

- تۆ خۆت مانگەو مانگ بەزۆر دێیت بۆ ئێرە، ئەوکات، ئەو کات..

بەڵام گریان نەیهێشت قسەکەی تەواوبکات، مەنوچەر شانەکانی گرت و بەچاوانێکی پاڕانەوە ئەبڵەقی بوو وتی:

- لەئێرەیدا خەریکە دەتەقێت، دەڵێت لەبەر بینینی تۆ، ئارەشم لەدایکم سەندەوەو دام بەتۆ، ڕۆژگاری منی ڕەشکردوە، واز ناهێنێت دەڵێت ئەگەر بەمجۆرە نییە بهێڵە ئارەش لای من بێت، توخوا بڵێ من چی بکەم "پاشان لەکاتێکدا بەرەو لای پەنجەرەکە دەڕۆیشت، هاواریکرد:" لەو ڕۆحەتدا.. ئەی خودا! چی بڵێم ئەم ژنە دایکم بۆی دۆزیمەوە، من منالم بۆچی بوو، شەقایق تۆ حالت باش نییە، بەردەوام نەخۆشی، ئەگەر سبەینێ عەهدیە بڕوات من دەبێت جگە لەمناڵەکان چاودێری تۆش بکەم.

شەقایق کەمێک وەستاو وتی:

باشە، بیبە، بەڵام بەمەرجێک!

مەنوچەر ڕوی تێکرد بەگریانەوە ئەبڵەقی بوو، شەقایق بەردەوام بوو:

بەخودا ئەگەر پەڵەیەکی شین بەسەر لەشی ئارەشەوە ببینم، خۆم.. خۆم ڕۆژگارت ڕەشدەکەم، ئەو ژنە دەخەمە لاوە، عەهدیە لێرە دەکەمە دەرەوە.. تێگەیشتی مەنوچەر؟

مەنوچەر لەسەر بەڵێنەکەی بوو، شەو بەشەو ئارەشی دەبرد بۆلای شەقایق، عەهدیە بەم حاڵە زۆر بێتاقەتبوو.

ڕۆژێک بەیانی کاتێک مەنوچەر دەچووە سەرکار، عەهدیە چاودێری کرد، هەرکە قاچی بردە دەرەوە، عەهدیە ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی شەقایق، شەقایق لەپاڵ خوانی قاوەڵتی دانیشتبوو، ئارەشیش لەگۆشەی ژوورەکە خەوتبوو، شەوی پێشوو مەنوچەر نەیبردبووە، شەقایق چاوی لەئارەش بوو، دەرگاکە کرایەوە بەبینینی عەهدیە سەرسامبوو، بەڵام سەیرکردنی عەهدیە ترساندی، بەتوڕەیی سەیری دەموچاوی ئەوی دەکردو بەدەنگێکی لەرزۆک وتی:

- تۆ هەر لەڕۆژی یەکەمەوە شوم بویت، هەر لەخولەکی یەکەمەوە کە بینیتم، یەکەمجار کە دایکی مەنوچەر هاتە داوام وتی کچەکە وەجاغی کوێرە، بەکاری کوڕەکەم نایەت، بەڵام دڵی کوڕەکەم سوتاوە بۆی دەیەوێت بیهێنێتەوە، بەخوا پەیوەندی بەکچەکەی ئێوەوە نییە، بەڵام لەبەختی خراپی من بویتە خاوەنی مناڵ، ئەوکاتە حەزمدەکرد بتخنکێنم، تێدەگەی! تۆ منت بەدبەخت کرد!

عەهدیە هاوارێکی کردو بەرەو ئەو هێرشی برد، شەقایق تەنانەت کاتی هاوارکردنیشی نەبوو، لەدەنگی هاواری ئارەش

عەهدیە هۆشی هاتەوە بەخۆیدا.

شەقایق لەکاتێکدا دەگریا، بەدەنگێکی هێواش وتی:

- تۆ، تۆ چی دەزانیت عەهدیە؟.. واتدەزانی لەم ماوەیەدا خۆشگوزەرانبوم؟ خەریکی ژیانم بوم؟.. "بەدەست دەوروبەری پیشانداو بەردەوام بوو" ئەمە ژیانە؟.. منیش ڕازی نیم، منیش دەمەوێ جیاببمەوە، من وەجاغ کوێرنەبوم، پزیشکێک، شتێک قسەیەکی وت دایکی مەنوچەریش پەلەبوو، تۆی بەدبەختکرد، من بەدبەختر! بەڵام هەر لەرۆژی یەکەمەوە بەمەنوچەرم وت بهێڵە بڕۆم بەدوای ژیانمدا، بەڵام نەیهێشت.. تۆ دەزانی لەنێوان منو مەنوچەر چی تێپەڕی، بەڵێ؟.. من هێشتا جلی پرسەم لەبەردابوو بۆ دایکم، هات بەزۆر منی هێنا بۆ ئێرە.. هێشتا ئەو لێدانەم لەبیرناچێتەوە کە شەوی یەکەم خواردم، هێشتا جێگەی ئەو قایشەی کە مەنوچەر لەپشتی داوم ماوە لەسەر لەشم، تۆ واتزانی من خۆشەویستی مەنوچەرم؟.. واتزانی شازادەیم؟ ئەو ئەگەر بەدەست خۆی بوایە ئامادەبوو سێ - چوار ژنی تر بهێنێت.

توخوا وامەزانە خۆش بەختم، کەمێک ڕێکبە! منیش وەک تۆ ئازارم کێشاوە، وەکو تۆ دیلم، بەخوا ئەگەر ئەم منالە نەبوایە، لەکۆتایدا بەجۆرێک ڕازیم دەکرد تەلاقم بدات، بەڵام ئێستا..

عەهدیە لەکاتێکدا بەتوندی دەگریا وتی:

- تەلاق وەربگرە ، توخوا تەلاقەکەت وەربگرە! هەردوکمان ئاسودەدەبین، تەنانەت ئارەشیش، ئەویش لەم بێ چارەنوسییە هیلاکبوە، هەر نازانێت من دایکیم یاخود تۆ! لەوانەیە وابزانێت خاتوو نێرگس دایکیەتی، ئەم منالەش بووە بەدیلی ئێمە، توخوا

کارێک بکە شەقایق! من خەریکم دەمرم.

ئاوازە پاڕانەوەکەی عەهدیە، شەقایقی خستە خەیاڵەوە.

- دەی ئارەش لەکوێیە؟

شەقایق لەکاتێکدا سەیری حەوشەی دەکرد وتی:

- دام بەعەهدیە بردی، من حاڵم باش نییە، ناتوانم چاوم لێی بێت.

مەنوچەر بەرامبەر شەقایق دانیشتو بەتوڕەیی وتی:

- دەیبینی، دەیبینی خۆت ناتەوێ، ئەگینا خەریکم یارمەتیت دەدەم، من حەزدەکەم ئارەش لەژێر دەستی تۆدا گەورەبێت، بەڵام تۆ..

شەقایق بەساردی سەیری کردو وتی:

- لوتفت زۆرە، بەڵام تۆ ئەگەر دەتەوێت یارمەتی من بدەیت، برۆ یارمەتی عەهدیە بدە، لەڕاستیدا ئەو ژنتە، نە من، من هەمیشە نەخۆشبووم، زیاتر لەژنت، وەک سەرگەرمییەک بووم، ئێستا کە باش بیردەکەمەوە سەیردەکەم عەهدیە زیاتر لەمن زەحمەت دەکێشێت!

مەنوچەر پێکەنینێکی توڕەو درێژی کردو وتی:

- ها؟.. کەواتە ئەو هاتووە بۆ ئێرە، بەڵێ؟

شەقایق وتی:

- نە، بەڕێکەوت ڕۆشتم بۆلای، من مرۆڤێکی ڕاستو ڕەوان نەبوم، هەموو کارەکان لەسەر شانی ئەوە، من، من چیم؟

مەنوچەر لەکاتێکدا بەرامبەری هەڵدەستا هاواریکرد:

- تۆ توانایەکی باشت نییە، هەر ئەوە باشتر کە لێرە بمرێت، بەڵام وای بەحاڵت ئەگەر بیانوی ئارەش بگریت، ئیتر هەواڵێک

نییە لەبینینی ئارەش.

مەنوچەر زۆر توڕەبوو، ئەوە لەعەهدیە کە زمان‌و تانەو بۆڵەبۆڵەکانی ساردیان کردوەتەوە لەژیان، ئەمەش لەشەقایق کە بەمشێوەیە سەر سوڕی کردوە، دڵی لەهەموو شتێک بێزاربوو، بەدوای تاوانباردا دەگەڕا، بەڵام تاوانبار کەس نەبوو جگە لەخۆی، بەڵام سەیر لەکاری ژنەکان دەرنەدەهێنا، ڕۆژێک وەک چەقۆو پەنیر، ڕۆژێک پارێزگاری لەیەکتردەکەن، هەستی بەتەنیایی خۆی دەکرد.

## شەش مانگ ڕابووورد..

عەهدیە لەحەوشەکە جلی دەشت لەیلاو ئارەشیش بەدەوروبەریدا دەسوڕانەوەو یارییان دەکرد، مەسعودیش لەباوەشی شەقایقدا بەچاوە وردبینەکانی ئەبڵەقی لەیلاو ئارەش بوو، شەقایق هێواش وتی:

چەند ڕۆژێکە دوای خواردنی چێشت حاڵم خراپ دەبێت، وابزانم ئەم "ئەعصاب"ە نەعلەتییە داویەتی لەگەدەم.

عەهدیە چاوو برۆی ناسککردەوەو وتی:

- ئێمە هیچکات تۆمان بەساغ‌و سەلامەتی نەبینیوە، هەرکاتێکیش دەڵێین چۆنی، خێرا دەڵێی چ حاڵێکم هەیە خەریکە دەمرم"پاشان بێبایەخ بەردەوامبوو" ئەگەر جلت هەیە بیهێنە بۆتی بشۆم.

هاواری ئارەش، عەهدیە هەستاند، خێرا لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوە، ئارەش لەژوورەکەی شەقایق بوو، عەهدیە لەحەوشەکەوە هاواریکرد؟

کاتێک چووە ژوورەوە، شەقایقی بینی کە بەبێهۆشی لەسەر زەوی کەوتوە، ئارەش بەگریانەوە چووە باوەشی عەهدیە، عەهدیەش ترسابوو، دڵی بەحاڵی ئارەش دەسوتا هەر بەو جۆرەی کە ئارەشی لەباوەشدابوو، ڕۆشتە چێشتخانەو ئاوی هێنا، تاگەڕایەوە، شەقایق هاتبووە هۆشدا، ڕەنگ بەدەموچاوییەوە نەمابوو، عەهدیەی بینی بەدەنگێک کە بەزۆر دەبیسترا وتی:

- چی بووە؟..

عەهدیە بەنیگەرانی لەلای دانیشتو وتی:

- لەمن دەپرسیت؟ باشە تۆ بڵێی چی بووە؟

شەقایق لەکاتێکدا ئارام ئارام دادەنیشت، وتی:

- نازانم چی بوو، لەناکاو ئێشێکی سەیر کەوتە دڵم کە هەموو لەشم لەرزی، سەرم گێژی خواردو کەوتم.

عەهدیە بەئاوازێکی گلەیی ئامێز وتی:

- ئارەش لەترسا نیوەگیان بوو، وامزانی خوانەخواستە ئەو شتێکی لێهاتووە.

شەو کاتێک مەنوچەر هاتەوە، ئەوەندە هیلاکبوو کە تاقەتی نانخواردنیشی نەبوو، بەڵام ئارەش ڕۆیشتە پێشەوەو دەستەکانی بەڕویدا کردەوە، مەنوچەر بزەیەکی کردو لەباوەشی گرت، چاوی بەپەنجەرەی ژوورەکەی شەقایق کەوت.. لەژێر لێوەوە وتی:

- ئەمشەو چەند زوو خەوتوە!

ئارەش بەدەنگێکی شیرین وتی:

- باوکە شەقایق کەوت!

مەنوچەر مۆنەی کردو وتی:
- بڵێ دایکە، ئارەش! ئێستا دایکت لەکوێ کەوت؟
ئارەش لەکاتێکدا یاری بەقۆپچەکانی کراسەکەی ئەو دەکرد وتی:
- دایکم دەڵێت: شەقایق چێشتی خواردوە دڵی ئێشی کردووە.
مەنوچەر، ئارەشی خستە سەر زەویو ئەبڵەقی پەنجەرەی ژوورەکەی ئەوبەربوو، بەخەیاڵدا ڕۆشتەخوارەوە، ئارەش منالی شەقایق بوو، بەلام عەهدیەی بەدایک دەزانی، هەڵبەت عەهدیەش ئەوی خۆشدەویست، ئارەش زمان شیرینی دەکردو جێگەی خۆی لەدڵەکاندا بەتەواوی دەکردەوە، مەنوچەر چەندجار بینیبوی کە عەهدیە هێواش شیرینیو شۆکلاتە دادا بەئارەش، لەم ڕووەوە زۆر خۆشحاڵبوو، بەلام دڵی بۆ شەقایق دەسوتا.
کەوتە بیری ڕۆژە خۆشەکانی ڕابردو، بیری ئەو ڕۆژانەی کە بەرامبەر پەنجەرەکە دادەنیشتو بۆ هاتنەدەرەوەی شەقایق چرکەژمێری دەکرد، بەلام دیارنەبوو شەقایق بەتەنیایی لەماڵەوە چ دەکات، جارێک ئیتر تاقەتی چاوەڕێکردنی نەمابوو، بەبیانوی وەرگرتنی گیا لەدەرگای ژوورەکەیانی دا، بەلام بەپێچەوانەی چاوەڕوانییەوە ئامۆژن دەرگاکەی کردەوەو گیاکەی پێداو ئەو ڕۆژە سەرنەکەوت شەقایق ببینێت.

## بەشی کۆتایی

شەقایقو عەهدیە لەهۆڵی چاوەڕوانی دانیشتبون، تا نۆیەنی شەقایق بێت، دە نەفەری تر چونە ژووری پزیشکەکەوەو بەمشێوەیە شەقایق نیو کاتژمێر دواکەوت، بەڵام ڕۆیشتنو هاتنەوەی شەقایق زۆری نەخایاند بۆ ژوورەکەی پزیشک، پزیشک چەند ئارام بگرێت، پزیشک تازانینی وەڵامی کۆتایی تەنیا ڕێگەی بەخواردنی دەرمانی ئارامبەخش دەبوو، عەهدیە کاتی دەرچون لەنەخۆشخانە گرییەکی خستە توێڵیو وتی:

ئەو هەموو چاوەڕوانییە کۆتاییەکەش هیچ؟.. شەقایق بەشێوەی پۆزش وتی:

- توخوا بمبەخشە، عەهدیە گیان! تۆم لەئیشو ژیانت کرد.

عەهدیە بێبایەخ بەقسەکەی ئەو وتی:

- بەیانی بەمەنوچەر دەڵێم پارەم بدەرێ چێشتی "قورمە سەوزی" دروستدەکەم لەکاتی تێدەپەڕێت دەڵێت کێ قورمەسەوزی دەخوات، ها، ئەو کاتەی لەبیرچووە کە بنی مەنجەڵەکە بەنان پاکدەکاتەوە.

هەر گوێی لەقسەکانی نەبوو، دوبارە دڵ ئێشەکەی دەستی پێکرد بووەوە، هێواش هەنگاوی دەنا بەحاڵی شەقایق ڕێی دەکردو قسەی دەکرد، تازە دوای گەیشتن بوو بەماڵ کە عەهدیە بەدەموچاوی ڕەنگپەڕیوی شەقایقی زانیبوو.

- چییه دوباره حالّت خراپ بوو؟

شەقایق دەستی بەدیوارەکەوە گرتو هاتەماڵەوە، هێواش وتی:

- ئێستا گولاجێک دەخۆم حاڵم باشتردەبێت.

عەهدیە جارێکیتر لەماڵ ڕۆشتە دەرەوە، مناڵەکانی لەلای دراوسێکەیان دانابوو، تا شەقایق ببات بۆلای پزیشک، ئێش وابەسەر شەقایقدا زاڵبوبوو کە بەزۆر خۆی گەیاندە پشت دەرگای ژوورەکەی، ئیتر تاقەتی نەهێنا، یەکێک لەگولاجەکانی بەدەستە لەرزۆکەکەی خستەدەمی‌و هەر لەوێ لەپشت دەرگاکە دانیشت، ئێش ئامانی بڕیبوو، ئەوەندە چڕنوکی لەگۆشتی قاچی دابوو کە پەڵەپەڵە لەسەر قاچی بەنەوشەبوو، کینەی گەروی گۆڕا بۆ دڵۆپی فرمێسک، هـاواری نەدەکرد، بـەڵام ناڵەکانی لەهاوارو دڵ تەزێنتربوو، هەندێکجار لەتاو ئازاردا لەناکاو ناوی دایکی دەهێنا.

نیو کاتژمێر تێپەڕی تا ئارامبەخشەکە کاری خۆی کردو شەقایق بێهۆش لەو ئێشە بێتاقەتکەرەی کە کێشابوی هەر لەوێ لەپشت دەرگاکە خەوت.

عـەهـدیـە بـۆ هێـنـانـەوەی منـداڵـەکـان ڕۆشـتـبوو بـۆ ماڵە دراوسێکەیان، ئەوەندە بەگەرمی گفتوگۆی دەکرد کە دەڵێی بۆ ڕابواردنی کاتی بەتاڵە، کەسێک نەبوو پێی بڵێت مەگەر تۆ نەبوی نیو کاتژمێر پێش ئێستا بۆڵەت بەسەر شەقایقدا دەکرد کە کاتم گیراوەو زۆر ئیشِ هەبوو کە بەنیوەو ناچڵی ماوەتەوە.

ئـەوانـە هـەمـووی بیانوبوو، نەیدەویست لـەبـەر شەقایق کارێکبکات، ئەگینا ئـەوە مـاڵ بـوو دەی بۆچی بەکارەکانی

نەدەگەیشت، لەوانەیە قسەکردن لەگەڵ دراوسێدا بەشێکە لەکاری ڕۆژانەی.

شەقایق لەتینوێتیدا لەخەو هەستا، ئیتر دڵئێشەی نەبوو، بەڵام گەروی وشکبوبوو، دڵی پەرداخێک ئاوی فێنکی دەویست، بەڵام ماڵەکە چۆڵبوو، لەساردی هەوادا لەناکاو لەرزی، هەستاو ڕۆشتە ژوورەکەیەوە، وردەوردە ڕۆیشتە چێشتخانەکەو پەرداخێک ئاوی دڵۆپدڵۆپ خواردەوە، تینوێتیەکەی نەمابوو، بەڵام سەری قورسبوو، چاوانی پڕبوو لەخەو، خەوت.

شەو بوو، مناڵەکان برسی بون، لەبەر درەنگکەوتنی مەنوچەر نانی شێوانیان خواردو خەوتن، مەنوچەر وەک هەموو شەوێک، مۆن‌و گێژ هاتە ماڵەوە، عەهدیە بەروخۆشی وتی:

- شێوان دەخۆیت؟ دەیزانی ئەگەر ئەویش توندبێت، مەنوچەر بێگومان توڕەدەبوو، مەنوچەر لەکاتێکدا گۆرەویەکەی لەپێ دادەکەند وتی:

- بێنی زۆر هیلاکم.

لەگەڵ خۆیدا وتی:

- ئەم ژنە چەند گێلە ها! ئیتر پرسیارکردنی نییە، دەزانێت من لەشوێنێک شێوان ناخۆم، دیسان پرسیار دەکات!

عەهدیە قاپێکی خستەبەردەم مەنوچەر کە پێکهاتبوو لەدوو پەتاتەی کوڵاو کەمێک نەعناو خوێی تێدابوو، مەنوچەر بەتەواوی توڕەبوو، بەبینینی قاپەکە توڕەتر بوو.

- ئەمە چییە ها؟!.. لەبەیانی تاشەو ڕێدەکەیت، ئەمە چێشت دروستکردنە؟ بەیانی مەگەر پارەت لێنەسەندم سەوزە بکڕیت،.. ها؟

عەهدیە تەواوی ڕۆژی لەماڵی دراوسێکەیان بەسەربردبوو، دوای هاتنەوەش، تاقەتی چێشت دروستکردنی نەبوو، یانی ئەمە کاری هەموو شەوی بوو، بەپەلە شتێکی دروستدەکردو دەی خستەبەردەمی مەنوچەر.

عەهدیە کەمێک بیری کردەوە، پاشان بەشێوەی تۆران وتی:

- تاوانی من نییە کاکە، بڕۆ لەژنە جوانەکەت ببرسە، هەرچی پارەت دامێ، بەیانی کردمە خەرجی ئەو.

مەنوچەر بەتوڕەیی وتی:

- باش قسەبکە بزانم چی دەڵێیت؟

- هیچ کاکە، خانم لەبەر دڵ ئێشەیەک بردومێتی بۆلای پزیشک، منیش هەموو پارەکەم پێدرابوو، تاپێت دەوت سبەینێ باران دەبارێت، سێ ڕۆژ تای هەبوو، مەنوچەر لەبەردەم عەهدیە هەستاو بەتوڕەیی وتی:

- دەیکەم بەمرۆڤ!

عەهدیە هەناسەیەکی ئاسودەیی هەڵکێشا، چونکە ڕزگاریبوو لەدەست بۆڵەکانی مەنوچەر، لەزۆر زوەوە شەقایق کەوتبوو، خوانەکە لەبەردەمیدا ڕاخرابوو، بەڵام لێوی بەچێشتەکەوە نەدەدا، مەنوچەر بەتوڕەیی ڕۆیشتەژوورەوە، تەنیا ڕوناکی ژوورەکە، ڕۆشنایی کەمرەنگی ژووربوو، بەڵام لەو ڕوناکییە کەمەشدا شەقایق ئاگا لەتوڕەیی مەونچەر بوو.

بەئارامی سڵاوی کرد، بەڵام مەنوچەر بەدەنگێکی بەرز وتی:

- چیتە؟ هەموو ڕۆژێک، هەموو ڕۆژێک نەخۆشیت؟ با شەکەم چێشت بخۆ بادڵت ئێش نەکات! خۆم خەرجیم کەمە تۆش بەردەوام زیادە خەرجی بکە، نۆکەری ئێرەیە!

شەقایق هەستاو بەرامبەر مەنوچەر وەستا، بەدەنگێکە هێواش کە نیشانەی لاوازیو نەخۆشی بوو، وتی:

- حاڵم زۆر خراپ بوو مەنوچەر! بمبەخشە، نەمدەویست پارە خەرج بێت، بەلام..

مەنوچەر بەتوڕەیی وتی:

- بەلام چی؟.. بەلام خەرجبوو ئیتر، منی بەدبەخت ئێشدەکەم کە تۆ بیهۆیتو لەبەر دەممدا ڕێ بکەیت، هێشتا عەهدیە هونەرێکی هەیە ئەی تۆچی؟ هەم خانوی خۆڕایی، هەم پارەی فت!

فرمێسک لەچاوانی شەقایق زنجیرەی بەست، ئارام، بەلام بەئاوازێکی پچڕپچڕ وتی:

هێشتا درەنگ نەبووە، تەلاقم بدە با ڕزگارت بێت، مەگەر من دەڵێم بمهێڵەوە؟.. من دەڕۆم بەدوای بەدبەختی خۆمدا.

کاریگەری قسەکانی شەقایقو جادوی نیگای، هەمیشە مەنوچەری سەردەخست، ئارام دەبووەو توڕەییەکەی لەتوکوت دەکرد، مەنوچەر سەری کردەخوارو لەبەرامبەری لاچوو، شەقایق بەدەنگێکی لەرزۆک وتی:

- بۆستە ئیشم پێتە.

پاشان بەرەو ژوورەکەی ڕۆیشت، دەنگەدەنگی لاواز بیستراو پاشان شەقایق لەژوورەکە هاتەدەرەوە.

- وەرە ئەمە بگرە! لەباتی ئەو پارەی ژنەکەت بۆی خەرجکردوم.

ئەو ملوانکەی شەقایق بۆ مەنوچەری گرتبوو، ئەو ملوانکەبوو کە مەنوچەر چەند ساڵ پێش کردبویە دیاری شەقایق.

مەنوچەر بەدەنگێکی هێواش وتی:

- تۆ ژنمی! ئەو پارەیەی عەهدیە بۆی خەرجکردوی، هینی خۆتە، بەفیدای سەرت!پاشان دەستی شەقایقی خستەلاوە، شەقایق بەقینەوە وتی:

- بەقسەی خۆت عەهدیە هونەری هەیە، بەڵام من چی؟

مەنوچەر بەدەستی دەموچاوی ئەوی بەرزکردەوە، هەردوو بەئەبڵەقی سەیری یەکتریان دەکرد، چەند دڵتەنگی سەیرکردنی ئەو بوو، ئەم ڕۆژانــە زۆر گرفتاربوو، بـەڵام سەیرکردنی شەقایق هەموو خەفەتەکانی لەبیربردەوە، شەقایق لەگەڵ تەواوی بێ بایەخییەکاندا، پێویستی بەخۆشەویستی ئەو بوو، ئەگەر سەیرکردنی گەرم بوایەو دڵخۆشی دەکردو ئەگەر مۆن بوایە ئەویش دڵتەنگ دەبوو.

مەنوچەر لەرۆیشتن دوو دڵبوو، حەزیدەکرد بمێنێتەوە، بەڵام دەیزانی کە عەهدیە بەتەواوی تورەدەبێت، تاقەتی بۆڵەبۆڵەکانی ئەوی نەبوو، شەقایق ئاگاداری دودڵیەکەی بوو، لەبەر ئەمە وتی:

- برۆ مەنوچەر! لەوانەیە منالەکان بیانوی تۆ بگرن.

مەنوچەر تەوێڵی ماچ کردو لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوە، لەجیاتی ئەو زەردەخەنەیەی کە بەسەر لێوییەوە بوو گۆڕا بۆ مۆنیو ڕۆیشتە ژوورەوە، دەستبەجێ ڕۆیشتە ژوورەکەیو بێباخدان بەعەهدیە بەخەیاڵی شەقایقەوە خەوت.

هەفتەیەک تێپەڕی، بەیانی ڕۆژی سێشەمە شەقایق بۆ وەرگرتنی وەڵامـی تاقیکردنەوەکەی لەماڵ ڕۆیشتەدەرەوە، قسەیەکی بۆ عەهدیە نەکرد، تاقەتی پاڕانەوەی نەبوو، خۆی

هیچی لەکاغەزی تاقیکردنەوەکە نەدەزانی، لەبەرئەمە ڕۆیشت بۆ نەخۆشخانە، وەک ئەو ڕۆژە چەند خولەکێک چاوەڕوانبوو، ڕوخساری پزیشکەکە دوای خوێندنەوەی کاغەزەکە، یەکسەر گۆڕا، ئاوازەکەی جۆرێکیتر بوو، دڵسۆزو باوکانە وتی:

- کچم کەسێک لەگەڵتدا نەهاتووە؟

شەقایق زانی کە شتێک ڕویداوە لەبەرئەمە وتی:

- کاکی پزیشک ئەگەر شتێک هەیە پێم بڵێ، من کەسم نییە، خۆم ئەوەندە خەفەتم هەیە کە خەفەت ئیتر مانایەکی نییە بۆ من.

پزیشکەکە نەیدەزانی مەسەلەیەک بەو گرنگییە چۆن باس بکات هێشتا دودڵبوو، شەقایق ئاهێکی هەڵکێشاو بەشێوەیەکی پچڕپچڕ وتی:

- بیڵێ پزیشک لەوانەیە نوسراوی سەر ئەو کاغەزە هەواڵێکی خراپ نەبێت بۆم.

پزیشکەکە لەمانای قسەکە نەگەیشت، بەڵام هەستیکرد ئیتر دوو دڵییەکی نییە بۆ وتنی قسەکە.

هیلاک بوو، هیلاکو دڵ تەنگ، تەنیاتر لەهەمیشە، ڕاستی دەکرد، بۆ ئەو کە ژیانی پڕبوو لەخەفەت، خەفەت ئیتر مانایەکی نەبوو.

لەپارکی ناوەڕاستی مەیدان شەقایق تەنیا کەسێک بوو کە یەکێک لەکورسییە چۆڵەکانی پڕ کردبووە، لەچاڵو چۆڵی یەکاندا، پڕ لەئاوی بارانی دەڵێی شەو بوو، هەندێکجار کە ئۆتۆمبیلەکان بەسەر چاڵەکاندا تێدەپەڕین، ئاو بەلاکاندا بڵاودەبووە.

لەهزری ئاڵۆزکاوی شەقایقدا وێنەی ماڵی نەنەگیان کێشرا،

ئەو ڕۆژەی کە شەقایق لەپشت دیوارەکەوە وەستابوو نەنەگیان خەریکبوو ئامۆژگاری سادقی دەکرد.

- کوڕم! مەگەر ئەم کچە چی کۆتەرەیەکی پێ فرۆشتوی؟ وەک کەلەشێری شەڕکەر دەچی بەگژیا.

سادق بەبێزارییەوە وتی:

- هیچ، تەنیا زۆر ناز دەکات!

دایکە وتی:

- بۆچی دوژمن دروست دەکەیت بۆ خۆت؟

سادق هەستابوو، وتبوی کە:

- ئێمە ئـەم دوژمـنـەمـان هەیە ئـەمـەش، لـەسـەری دایکە، چیرۆکی ئێمە بووە بەچیرۆکی دڵۆپو دەریا، ئەوەندە دوژمنم هەیە، کە شەقایق لەنێوانیاندا ونبووە، ئێستا ئەگەر خۆڕاگر نییە بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆیان.

خانم! ڕۆژنامەت دەوێت؟ دەنگی کوڕێکی گەنج زنجیرەی بیرەکانی شەقایقی پچڕاند، ڕۆژنامەیەکی کڕی، ڕۆژنامەی "سنگ حبود"یش، لەو ڕۆژنامە بێمانایە نەبوو کە سەروبنی دیار نەبوو، بەتایبەتی لاپەڕەی "دەنگی ئێوە"، شەقایق بێئامانج شەقامەکانی دەبڕی‌و لەبەر خەفەتە تازەکەی خۆی دەگریا، کزو لاواز بوو، بەقاچانێکی هیلاکو دڵێکی ئازار دراوەوە چووە حەوشەکە، لقە شۆڕە بوکانی داری دراوسێکەیان، هاتبووە ئەمدیو لەسەر دیوارەکەوەو یادەوەری پایز بوو.

عەهدیە بەتوڕەیی وتی:

- لەکام گۆڕ بویت؟

شەقایق بەئارامی وتی:

- ڕۆشتبوم بۆ تاقیگە، مەگەر لەبیرت نەبوو؟

عەهدیە وەکو ئەوانەی جنۆکە دەستی لێوەشاندون دەستی بەدادو بێداد کرد:

- من ئیتر هیلاکبوم، شەویش بۆڵەکانی بۆ منە، پەیوەندی بەمنەوە چییە، ئەمشەو بەمەنوچەر دەڵێم کە لەخۆتەوە ڕۆشتویتەتە دەرەوە.

ئارامبەخشەکە وردەوردە کاریگەری خۆی دەکردو شەقایق دوای ئێشێک ئارامی دەگرت، قژی بەسەر شانیدا پەرێشان بوبوو، دەموچاوی لەفرمێسکدا تەڕبوو، زیاتر لەپێشتر پێویستی بەمەنوچەر هەبوو، حەزی دەکرد وەکو منداڵێک کە لەکاتی نەتوانیدا پەنادەباتەبەر دایکی، پاڵی بدایە بەئەوەوە، بەڵام جگە لەبێدەنگیو خەڵوەت هیچی تری نەبینی، هەستا ئاو بهێنێت بۆ خۆی، نەیدەزانی بۆچی دوای ئێشەکە تینوێتی دێت بۆلای، لەچێشتخانەکە دەستی بەقاپێکەوە گرتو قاپەکە کەوتە سەرزەوی‌و وردبوو، لەگەڵ ئەوەدا ئێشەکەی دەستی پێکرد، وەک ئەوە وابوو کەسێک دەرزی بکات بەگۆشتیدا، هاواریکرد، بەڵام ئەوەندە بەرزنەبوو کە خەڵک بیبیستێت، مەنوچەر چووە ژوورەکەی ئەوەوە.

شەقایق لەسەر زەوی دانیشتبوو چنگی لەزەوی دەدا، قژی پەرشوبڵاو بوو دەستەکانی دەلەرزین‌و بەم حاڵەوە بەبێ گوێدان بەحاڵی شەقایق بەئاوازێکی توڕە وتی:

- بزانم، بەیانی لەچ گۆڕێک بویت؟

شەقایق بەبێ ئەوەی سەری بەرزبکاتەوە، لەکاتێکدا بەسەختی هەوڵی دەدا مەنوچەر ئاگاداری لەرزۆکی دەنگی

نەبێت، بەدەنگێکی لاواز وتی:

- من، ڕۆیشتم بۆلای پزیشک!

مەنوچەر بەتوڕەیی ڕۆشتە پێشەوەو قژی بەدەوری دەستیدا سوڕی خواردو بەجوڵەیەکی خێرا سەری بەرەو لای خۆی بەرزکردەوە، بەبینینی دەموچاوی ڕەنگپەڕیوی بەبێ ئەوەی هەست بەڕەحمێک بکات لەدڵیدا بەگۆڕانەوە وتی:

- ئەم شانۆیە لەبەر دەممدا مەکە، واتزانی منداڵم؟.. دەڵێم ڕۆشتبووی بۆ چ گۆڕێک؟

ئێش ئامانجی شەقایقی نەهێڵاو جارێکیتر لەهۆش خۆی چووەوە.

مەنوچەر لای پەنجەرەکە وەستابوو بەئەبڵەقی سەیری دەموچاوی بێحاڵی شەقایقی دەکرد شەقایق جوڵانێکی کردو بەئارامی چاوەکانی کردەوە، بەدەنگێک کە زۆرتر لەناڵەی دەکرد، داوای ئاوی کرد.

مەنوچەر پەرداخە ئاوەکەی دایە دەستیو وەک هتیوێکی دایکمردوو لەلای دانیشت.

- چیتە شەقایق، ها؟

شەقایق پەرداخەکەی خستەسەر زەویو هێواش وتی:

- چاک دەبمەوە، پزیشکەکە وتی تاهەفتەیەکی تر لەم ئێشە ڕزگارم دەبێت.

مەنوچەر هەستا، شەقایق بەچاوانێکی پڕ پاڕانەوەو ئاوازێکی مناڵانە وتی:

- مەڕۆ! هەر هیچ نەبێت ئەمشەو لەلای من بە.

مەنوچەر بزەیەکی کەمرەنگی خستەسەر لێویو وتی:

- مەترسە! هێشتا مردنی نیت، ئەمشەو هیلاکم دەڕۆم دەخەوم، عەهدیە تەنیایە، تۆش ئەگەر تاقەتت نییە، ئەمە بخوێنەرەوە.

مەنوچەر بەرەو کۆمەدەکە ڕۆیشتو ئەو ڕۆژنامەیەی هێنا کە بەیانی شەقایق خۆی کڕیبوی شەقایق سەیرێکی کردو بەئاوازێکی ئارام کەگلەیی تێیدا حەشار درا بوو، وتی:

- خۆ من لەعەهدیە تەنیا ترم!

مەنوچەر بێبایەخ ڕۆیشت، ڕۆیشتو بەتەنیا جێی هێشت، شەقایق بۆ ساتێک سەیری دەوروبەری خۆی کرد، بیری لەو ڕۆژە کردەوە کە مەنوچەر بەزۆر هێنای بۆ کەرەجو بەزۆر بووە هاوسەری، ئەو ڕۆژە تەنیابوو، بەڵام تەنیایی ئەو ڕۆژە سەدجار شیرینتر بوو لەتەنیایی ئەم ڕۆژانە، ئەو ڕۆژانە، بەهیوای دۆزینەوەی سادق، ڕۆژی دەگەیاندە شەو بۆ ساتێکیش سادقی لەبیرنەدەچوو، بەڵام ئێستا.. سەیرکردنی شەقایق ماتو سەرسام بوو بۆ لاپەڕەی پێرستی ڕۆژنامەکە، چەناکەی لەرزیو دڵە بێهیواکەی دەستی کردوە بەلێدان، چاوە بێروناکییەکانی وەک ڕوناکی درەوشایەوە.

ئەم، ئەم ناوە!

بەرامبەر لاپەڕەی ژمارە یانزەی پێرستەکە نوسرا بوو "شیعرەکان: شیعرێک لە"شیعرەکانی سادق نوسرا بوو" خودایەگیان تۆ چەند گەورەی، چەند میهرەبانی، ئەو بەندەیەی کەوا دەزانی تەنیایە، چەندان سوپاسە!.. چەند پرکێشو یاخییە، لەم شەوی تەنیاییەدا، کەوامدەزانی هەموو ڕابردوم وەک یادگاری لەقۆناغەکەدا نوقم بووە، دیسان نیشانەیەکی ترم

لەسادق دۆزییەوە!.. شەقایق شیعرێکم بۆ نوسیوی هەم ناوی خۆتە، لەشیعرەکەشدا حەوت کۆی دووجار ناوی تۆم هێناوە، کاتێک تەواو بوو دەیهێنم بۆت کە بیخوێنیتەوە، بەڵام دەبێت تارۆژی لەدایکبوونت ئارام بگریت.

شەقایق بەدەنگێکی بەرز وتی:

– وای، ئەمڕۆ بیستو شەشی مانگی میهرە، ئەمڕۆ، ڕۆژی لەدایکبونمە!

– حەوت کۆی دوجار، یانی نۆ، ئیترا!

– بەڵێ.

– باشە بۆچی نالێی نۆجار؟

– ئاخر زۆر حەزم لەژمارە حەوتە، بیستومە دەڵێن: حەوت ئاسمان، حەوت سین، هەفتەش حەوت ڕۆژە، منیش ویستم حەوتجار ناوت بێنم لەشیعرەکەدا، بەڵام دوانی زیادیکرد، بووە بەنۆجار.

– دەڵێم سادق نەوەک من عەشقی حەوتەمت بم؟

سادق پێکەنی..

– تۆ یەکەمو دوایەمینی.

فرمێسک بێخواست لـەچاوی شـەقایق هـاتـەخـوارەوەو بەدەنگێکی لەرزۆک دەستی کرد بەخوێندنەوە ˙ ئەو کەسەی هەمیشە لەحەسرەتدا جێی هێشتم، پێشکەش بەونبوم، شەقایق..

**لەم بیابانە بێ کۆتاییەدا ، لەبیرت خێوەتێک هەیە**

**لەنێوان لافاوی خەفەتەکانم خەفەتێکی تازەتر هەیە**

**شەقایق گیان بەکاتی شەو، خەیاڵت هاودەمم بووە**
**لەکاتی دەستپێکردنی ئێشدا، نیگات مەرهەمم بووە**

**بۆ فرمێسکی چاوەکانم، قسەکانت باشترین ئارام بەخش**
**بەیانیان، هەردوو چاوت، شەقایق، قیبلەم بووە**

**شەقایق گیان، بەبێ تۆ خەمم قورسترین بووە**
**سوێند بەهەرچی مەجنونە، دڵم عاشقترین بووە**

**نیگای سەوزی چاوانت، لەسەرم دەرناچێت**
**جگە لەگوشینی دەستەکانت، مەگەر ئەم دڵە چی دەوێت؟**

**بەدڵم وت عاقڵ بە، کە ئێرە جێگەی حەسرەت نییە**
**دڵم پێکەنیو جارێک وتی شەقایق ڕۆشتووە لێرە؟**

**شەقایق ببە خاوەنی دڵ، دڵم تەنیاترین تەنیایە**
**ئەگەر ڕۆژێک تۆ بێیت، بەحەسرەتی هەردوکمان پێدەکەنین**

**شەقایق گیان، بەبێ تۆ خەفەتم قورسترین بووە**
**سوێند بەهەرچی مەجنونە، دڵم عاشقترین بووە**

**لەم کۆڕەدا جگە لەگریە، مەگەر شتێک ماوەتەوە**
**دوای تۆ کاری ڕۆژانەم دانیشتن لەسەر لێواری جادە**

لەنێوان خەڵوەتی شەوان کەسێک بێخودە دەپرسێت:
شەقایقیش بۆ تۆ، ئاوا بێ تواناو سەرسامە؟

لەم کاتی دوو دڵیەدا کەسێک لەسینگەوە دەڵێت:
ئەگەر شکت لەعەشق هەیە، چی جۆرە عاشقێکی؟

شەقایق گیان، بەبێ تۆ خەفەتم قورسترین بووە
سوێند بەهەرچی مەجنونە، دڵم عاشقترین بووە

ئەگەر لەمن، تۆ ونی ناو سینگم جێگەی تۆیە
نموونەت وەکو خۆرە کە لەپشت گردەکان خەوتووە

بەهیوای دەرکەوتنت، هەموو کاتێ لەگەڵ شەودا تازە دەبمەوە
بەڵام ترسم لەو ڕۆژەیە، کە تاریکی لەنگەر بخات

شەقایق گیان، بەبێ تۆ خەفەتم قورسترین بووە
سوێند بەهەرچی مەجنونە، دڵم عاشقترین بووە

لەتیخی تیژی چاوانت من برینداری مەیدانم
سوێند بەگیانم کڕیاری تیری نیگاتم

نیگای تیژو بڕەرت ئەگەر وەکو خەنجەر بوایە
لەتیخی تیژی چاوانت حەسودان بەکۆمەڵ دەمردن

شەقایق خەوتبوو، دوای ئەو هەموو ئێشە، ئیستا گەشتبوو بەئارامی، بەڵام لەناکاو لەجیهانی خۆیدا وێنەی سادق دەرکەوت، جلەکەی ڕەش بوو، بەڵام دەموچاوی بەبزەوە بوو، بەئارامی وتی:

- لەکوێی؟ من لەزۆر زووە چاوەڕێم!

شەقایق لەخەو هەستاو سێبەری چڵە ڕوتەکانی دارەکە ترسناک دەهاتە پێشچاو، بەیانی بووە هەستێکی سەیر لەکاتی هەستانیدا لەلەشیدا دەرکەوت، دەڵێی قورس بووە، دەبوایە خۆی سوکبکردایەتەوە، دەبوایە لەشی بدایەتە دەست ئاو، ئاو ڕوناکییە، ئاو ژیانە، عەهدیە لەژوورەکەی خۆیان دانیشتبوو بەرچای دەدا بەمناڵەکان، شەقایق بەپەنجە بەئارامی لەدەرگاکەی داو ڕۆیشتە ژوورەوە، عەهدیە بەبێزارییەوە دەموچاوی مۆنکردو بەقینەوە وتی:

- دەیبینی چا تەواو نەبووە، برۆ هەرکات کولا، بۆتی دەهێنم.

شەقایق نیگای بێ ڕوناکی بڕییە دەموچاوی عەهدیەو بەدەنگێک، کە بەزۆر دەبیسترا وتی:

- عەهدیە گیان! داوایەکم لێت هەیە.

- بیڵێ!

شەقایق تەواوی هەوڵی دەدا تابتوانێت قسەبکات، بەڵام جارجار وردەوردە توانای قسەکردنی لەدەستدەدا، دەستی خستە سەر دەستی عەهدیەو نیگای بێ گیانی بڕییە دەموچاوی مۆنی عەهدیە، توخوا ئەمڕۆ دەمبەیت بۆ گەرماو "حمام"؟ ئەگەر حاڵم باشبوایە خۆم دەڕۆشتم.

عەهدیە دەستی لەژێر دەستی دەرهێناو خستیە پشتیو پاشان بەشێوەیەکی بزێو وتی:

- وای، مەگەر من بومەتە خزمەتکارت، ڕۆژێک ئاوت دەوێت، ڕۆژێک ژەهری مار، چی ژنێکی ڕوداری؟.. بەمن چی، من کاتم نییە منداڵەکان ببەمە گەرماو، چجا تۆ، باشە خۆت بڕۆ!

شەقایق دەستی گرت بەدیوارەکەوەو بەرامبەری هەستا.

- بمبەخشە عەهدیە، بەڵام ئیتر زەحمەتەکانی ئێمەش تەواوبوو.

پاشان بزەیەکی کەمرەنگی خستە سەر لێویو هێواش وتی:

- لەدەستم ئاسودە دەبیت، بەم زوانە، زوو.

عەهدیە هەستاو وتی:

- پێت ناخۆش نەبێت، لەخوام دەوێت لەدەستت ئاسودەبم.

شەقایق بۆ ساتێک وەستا، بەبێ ئەوەی ڕوی تێبکاتو بەبێ ئەوەی سەیری دەموچاوی بکات، وتی:

- گەردنم ئازاد بکە عەهدیە! من ڕۆشتم.

عەهدیە سەری لەرستەکەی دەرنەهێنا، نەوەک ڕاکردنی هەبێت، بەتوڕەیی کەوتەدوای، بەڵام نە، ڕۆیشتە ژوورەکەی، بەڵام زۆر بێحاڵو ڕەنگپەڕیو.

دوای نیوەڕۆ بوو دەنگی کاتژمێری سەر دیوارەکە وەک چەکوشێک وابوو بەسەر ئاسندا بدرێت، لەیلاو مەسعود خەوتبون، ئارەش لەنیوەڕۆوە ڕۆیشتبوو بۆ لای شەقایق، بێدەنگی باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشابوو، عەهدیە جلی دەدوری

نەیدەزانی بۆچی دڵە خورتێیەتی، چەند جارێک هەستاو سەری لەمناڵەکان دا.

نەوەک ڕوداوێک وێڵ هاتبێتە پێش بۆ مەنوچەر، خوایە من بۆچی بەم جۆرەم.

کینەیەکی سەنگین قورگی دەگوشی.

وای من چیم لێهاتووە؟.. بۆچی بێخود دەگریم؟.. خودایە نەوەک..

عەهدیە لەژوورەکە ڕۆیشتەدەرەوەو بەبێدرەنگکردن ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی شەقایق، ئارەش لەگۆشەی ژوورەکە سەرقاڵی یاریکردن بوو، بەبینینی ئەو سەری بەرزکردەوەو پاشان دوبارە دەستی کردەوە بەیاری، شەقایق خەوتبوو، چاوەکانی نیوەکراوەبوو، قژی بەسەر دەموچاویدا پەرش‌و بڵاو بوو، دەستەکانی لێک ئاڵاندبوو، لەسەر سکی بوو.

عەهدیە بەدەنگێکی لەرزۆک، کە پڕبوو لەترس، بانگی کرد:

- شەقایق؟!..خەوتوی؟!

بەڵام شەقایق لەزووەوە خەوتبوو، ئارەش بەسەرسامی لای عەهدیە وەستا، بەترسەوە وتی:

- دایکە! بۆچی دەتەوێت شەقایق لەخەو هەستێنی؟

عەهدیە گرتیە باوەش‌و جارێکیتر شەقایقی بانگکرد، دەڵێی ساڵانێکە خەوتوە، عەهدیە دەستی خستەسەر شانی‌و بەهاوار وتی:

- هەستە!.. توخوا هەستە! مەگەر نەتوت بتبەم بۆ گەرماو؟

توخوا هەستە، شەقایق هەستە دەمەوێت بتبەم بۆ گەرماو.

بەڵام شەقایق بۆ هەمیشە خەوتبوو، عەهدیە بەناڵەکردنەوە بـەرەو کۆڵانەکە ڕایکرد، هـاواریـدەکردو ڕایـدەکرد، ئـارەش بەهەراسانی بەدوایدا لەماڵ دەرچوو.

ئەی خەڵک وەرنە دەرەوە، وەرن توخوا شەقایق ببەن بۆلای پزیشک خەریکە دەمرێت!

خەڵک هاتنە کۆڵانەکەوەو عەهدیەیان گەیاندە ماڵەوە کە بەبێحاڵی کەوتبوەسەر زەوی،،

بەخاکیان سپارد.

لەکاتێکدا کە مەنوچەر بەگریانەوە بەرەو لایەکیتر ڕۆیشت تا بەخاکسپاردنی شەقایق نەبینێت چاوی کەوت بەبەردی گۆڕێکی تر لای گۆڕەکەی دایکی شەقایق، مەنوچەر بێ تاقەتر لەپێشتر هاواریکردە دەنگی منداڵی لەمێشکیدا دەزرنگایەوە، کاتێک یەکەمجار سادقی بینیبوو.

- ناوم سادقە، تۆچی؟

- مەنوچەر!

- ناوەکەشت وەکو خۆت ژیگولە.

پاشان دەنگی پێکەنینو پێکەنین..

ئەم گۆڕە پەیوەستبوو بەسادقەوە، سادقیش مردبوو.

ئەویش ساڵانێکە مردوەو من نەمزانیوە، دەی هەر لەبەرئەمە شەقایق، زۆر زوو تەنیای کردم!

لەسەر بـەردە ڕەشەکەی گۆڕەکەی ئەو بەرەنگی سورو بەئەستوری نوسرا بوو:

**لەسەر گۆڕەکەم بنوسن شەقایق**

**تاهەرکەس ببینێت، خوێناو بگرێت.**

**کەسێک کە هەمیشە لەحەسرەتی شەقایقدا بوو.**

مەنوچەر هاواری کرد:

**لەکۆتاییشدا شەقایقت لێ سەندم،**

**خودایە من چەند تەنیام.**

تەواو......



لەسەر گۆڕەکەم بنوسن شەقایق

تاهەرکەس بیبینێت، خوێناو بگرێت.

کەسێک کە هەمیشە لەحەسرەتی شەقایقدا بوو.

مەنوچەر هاواری کرد:

لەکۆتاییشدا شەقایقت لێ سەندم،

خودایە من چەند تەنیام.







6000 دینار